# تەفسیری زمناکۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناکۆیی

جزمی ﴿١١،١٢،١٣﴾

بەرگی حەوتەم

ناوی کتێب : تەفسیری زمناکۆیی .
ناوی نووسەر :مەلا سعیدی زمناکۆیی .
جزمی یازدەهەم، دوازدەهەم و سێزدەهەم.
بەرگی حەوتەم.
چاپی یەکەم .
چاپی کۆمپیوتەرو ڕاکێشانی : ﴿ چاپخانەی ئۆفسێتی بابان ﴾
ژمارەی سپاردنی (٤٠٩) ی ساڵی ( ٢٠٠٠ ) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ سپێردراوە .

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

درودی پیٚیان لەسەر پێغەمەر و لەسەر یارو یاوەران و خزمان و خێزانەکانی و پەیڕەوانی بیٚ هەتا کۆتایی جیهان.

لەپاشا خوای مەزن هەواڵ ئەدا لەو تاقمەوە دوواکەوتوون لەچونە دەرەوە بۆ جەنگ لەخزمەت پێغەمەردا ﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرموێ:

يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ وَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٤﴾ سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِن تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ ﴿٩٦﴾

﴿ یَعتَذِرُونَ إلَیْکُمْ إذا رَجَعْتُمْ إلَیْـهِمْ ﴾ دوو ڕوەکـان بیـانوی پـوچ دروسـت ئەکـەن وفرێی ئەدەن بۆلای ئێوە بۆنەچونە دەرەوەیانا بۆ جەنگی تەبوك کاتیٚ ئێوە گەڕانەوە بۆلای ئەوان لـە مەدینەوە دێن بەپێشوازیتانەوە.

دارِژاندنی ئایەتەکە وا ئەگەیەنیٚ هاتوە خوارەوە لـەکاتی گەڕانەوەی لـەشکری ئیسـلام لـەجەنگی تەبوك خوا هەواڵ ئەدا بەموسڵمانان کاتیٚ ئێوە گەڕانـەوە بـۆ مەدینـە دووڕوان دێن بەپیرتانەوە بیانوی درۆینەتان بۆ ئەهێننەوە لـەدانیشتن و دوواکەوتنیانا.

﴿ قُلْ لاتَعْتَذِرُو لَنْ نُؤْمِنَ لَکُـمْ قَـدْ نَبَّأنـا اللهُ مِـنْ إخْبـارِکُمْ ﴾موحەمـەد تـۆ بڵـیٚ بـەو دووڕوانە : ئێوە بیانوی درۆینە مەهێننەوە ئێمە بڕواتان پیٚ ناکەین لـەو شتانە ئێـوە بیـانوی پیٚ دێننەوە بەڕاستی خوا ئێمەی ئاگادار کردوە لـەهەواڵـەکانی ئێوەو نیـازی ئێـوەو کـارو کردەوەتان لـەخراپەو دووڕویی.

﴿ سَیَرى اللّهُ عَمَلَکُمْ وَرَسُولُهُ ﴾ خواو نێرراوی خوا کردەوەی ئێوە ئەبینن،بیانوتـان لیٚ وەرناگرن هەتا ئێوە دەری نەخەن بەکردەوە ڕاستی خۆتان نەك بەزمان کە نیازمان پاکـەو باوەڕهێنان بەخواو بەپێغەمەر لـەدڵتانەوە دێت.

﴿ ثُمَّ تُرَدُّوُن اِلی عـالِمِ الْغَیْـبِ والَشَـهادَةِ فَیُنَبِّئُکُـمْ بِمـا کُنْتُـمْ تَعْمَلُـونَ ﴾ لـەپاشـا ئێـوە ئەگێررێنەوە بۆ لای خوایە ئەزانیٚ بەهەمو شتێکی نهێنی و ئاشکرا،دوایی ئەو زانایە هـەواڵ ئەدا بەئێوە لــەڕۆژی دواییـدا بەشـتیٚ ئێـوە ئەیکـەن لــەچاك و لــەخراپ و بـەو شتەی ئەیشارنەوە لـەدڵتانا و ئاشکرای ئەکا بۆتان.

﴿ سَیَحْلُفونَ باالله لَکُمْ اِذا انقَلَبْتُمْ اِلَیهِمْ لِتُعرِضُـوا عَنـهُمْ فَـاعْرِضُوا عَنْـهُمْ اِنَّـهُمْ رِجْـسٌ ﴾ دووایی ئەو دووڕوانە سوێند ئەخۆن بۆ ئێوە بەخوا کاتیٚ ئێوە گەڕانەوە لـەجـەنگی تـەبوك بۆلای ئەوان لـەبەر ئەوەی ئێوە وازیان لیٚ بهێنن و سەرزەنشتیان نەکەن،ئـەو کەسـانە بـیٚ نرخن، دوایی ئێوە وازیان لیٚ بێن و بیٚ دەنگبن لـەگەڵیان و خۆتانیـان پێـوە مـاندو مەکـەن بەڕاستی ئەو کەسانە پیس و قێزە ونن و پاك بونەوە وەرناگرن، ڕەخنەیان لیٚ مەگرن باهەر بەرەڵا بن لـە جیهاندا.

﴿ وَمأواهُمْ جَهَنَّمُ جزاء بِما كانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ وە جێگەی گەڕانەوەی ئەوان دۆزەخە، سزاو سەرزەنشتیان لەدۆزەخدا ئەکرێ لەبەر پاداشت دانەوەیان بەشتێ ئەیکەن لەبێ باوەڕی و دووڕوویی خۆیان .

﴿ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرضوا عَنهُمْ ﴾ ئەو دووڕووانە سوێند ئەخۆن بۆ ئێوە لەبەر ئەوەی ئێوە ڕازی بن لەوان وە بۆ ئەوەی کردەوەی چاکیان لەگەڵ بکەن و ئازاریان نەدەن.لەئایەتی پێشودا سوێندیان ئەخوارد هەتا ئێوە وازیان لێ بهێنن و ئازاریان نەدەن.لەم ئایەتەدا سوێند ئەخۆن بۆئەوەی چاکەیان لەگەڵ بکرێ بەهۆی سوێند خواردنەوەیانەوە.

﴿ فأن تَرضَوا عَنْهُم فانَّ اللّهَ لايَرضى الْقَوْمِ الْفاسِقِينَ ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە ڕازی بن و خۆشبن لەوان،دوایی بەڕاستی خوا خۆشنابێ لەتاقمێ دەرچون لەفەرمانی خوا، هەر کەسێ باوەڕداربێ حۆش نابێ لەکەسێ خوا خەشمی لێ گرتبێ،ئەگەر لێی خۆشبێ ئەو کەسەیش بەدووڕو ئەژمێررێ.

کاتێ خوای مەزن باسی کردەوەی دووڕوانی مەدینەی کرد،باسی ئەو کەسانە یش ئەکا لەدەورو بەری مەدینەن و دووڕو نو وێنەی عەربە دەشتەکیەکان و ئەفەرموێ:

ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا۟ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٩٧﴾ وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٩٨﴾ وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ ۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرْبَةٌ

﴿ لَهُمْ سَيُدْخِلُهُمُ اللَّهُ فِي رَحْمَتِهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾



﴿ الأعْرابُ أشَدَ كُفْراً ونِفاقاً ﴾ عەرەبە دەشتەکیەکان سەختترو گرانترن لەلایەن بیٚباوەڕی و دووڕوی لەئێوە ناو شار.

﴿ وَإجْدَر أنْ لايَعلَمُوا حُدُودَ ما أنْزل اللهُ عَلى رَسُولِهِ ﴾وە شایانترن کە نەزانن سنورەکانی شتێ خوا ناردویەتیە خوارەوە بۆسەر نێرراوی خۆی و نەزانن ئەندازەی فەرماندانی خوا، لەبەر ئەوەی تێکەلاْوی موسلْمانانیان نەکردوە، قورئانیان بەسەردا نەخوێنراوەتەوە هەتا لەسنورەکانی بگەن.

﴿ واللهُ عَليمٌ حَكيمٌ ﴾ وە خوا ئەزانێ بەڕەوشتی ئەو عەرەبە دەشتەکیانەو ئەزانێ چ شتێ لەدلْیانایە هەمو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ لەو شتانە فەرمانیان پیێ ئەدا.

﴿ وَمَن الأعْراب مِنْ يَتخذُ مايُنفِقُ مُغرَماً ﴾ وە هەندێکە لەو عەرەبە دەشتەکیە دووڕوانە کەسێ دائەنێ شتێ ئەیبەخشێ لەڕێگەی خوادا لەزەکات و شتیتر بەتاوان و سەرانە لەترسی موسلْمانان ئەیبەخشێ نەك لەبەرفەرمانی خوا بۆ ئەوەی خۆی پیێ بپارێزێ و بەتەمای پاداشتی خوا نیەو بەبێ ئەنجامی دائەنێ .

﴿ وَيَترَبَّصُ بِكُمْ الدوائرَ عَلَيهِمْ دائِرةُ السْوءِ ﴾ وە چاوەڕوانی پێچەوانەی ڕۆژگار ئەکەن بۆ ئێوە و توشی خراپە بن و دوژمنانی ئیسلام زالْ بن بەسەر ئێوەداو موسلْمانان بنەبڕ بکەن هەتا ڕزگاریان بێ لە تاوان و سەرانەدان، یاخوا لەسەر ئەو دووڕوانە بێ وەرچەرخانی ڕۆژگاری خراپ و لەناوچونیان.

﴿ واللهُ سَميعٌ عَليمٌ ﴾ وە خوا ئەبیستێ ئەو شتەی ئەوان ئەیلێن بەزمان، ئەزانێ بەشتێ ئەیشارنەوە .

﴿ وَمِنْ الأعْرالبِ مِنْ تُؤمِنُ بِاللّهِ والْيَوْمِ الأخِرِو يَتخِذُ مايُنْفِقُ قُرُباتٍ عِنْدَ اللّهِ ﴾ وە هەندێکە لەعەرەبە دەشتەکیەکان کەسێ باوەڕی بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیەو،ئەو

شتەی ئەیبەخشێ بۆ جەنگ لەڕێگەی خوادا لەزەکات و جگەی زەکات دای ئەنێ بەهۆی نزیکبونە لەخودا، چونکە بەنیازی پاك و خاوێنەوە ئەیبەخشێ.

﴿ وَصَلَوَاتِ الرَّسُلِ ﴾ وە ئەیشی بەخشێ بەئاواتی ئەوەی بەشدار بێ لەپاڕانەوەی نێرراوی خواو داوای لێبوردن لە خوا، چونکە پێغەمەر ئەپاڕایەوە لەخوا لەوان خۆشبێ.

﴿ ألا إنها قُربَةٌ لَّهُمْ سَیُدْخِلُهُمْ اللهُ فِي رَحْمَتِهِ إنَ اللهَ غَفُورٌ رَحِیمٌ ﴾ ئێوە ئاگادار بن و بزانن ئەو داواو پاڕانەوەی پێغەمەرە شایەتی دانە لەلایەن خواو بەڕاستی بیروباوەڕیان و وەرگرتنی ئاواتیان و نزیکبونەوەیان لە خواو ڕزگاریان ئەکا، خوا لەمەودوا ئەیان خاتە نێو بەزەیی ونێو بەهەشتی خۆی. بەڕاستی خوالێی خۆشبونی زۆرە بۆ ئەو کەسانە دارایی خۆیان ئەبەخشن، خاوەن بەزەیی و میهرەبانە بۆ کەسانێ نزیك ئەبنەوە لەخوا،لەگوناهیان ئەبورێ .

بۆزانین: لەمەو بەر ئێمە لەمانای ئایەتەکانا باسی عەرەبە دەشتەکی و لادێیەکانمان کرد، بەوبۆنەوە ئاماژە بۆ شتێ ئەکەین خاوەنی (میزانی شەعرانی) لەبابی شەهادەتا: حەنابیلەکان شایەتی لادێی وەرناگرن لەسەر شارستانیەکان بەهیچ جۆرێ.لای مالیکەکان لەکوشتن و لەبریندارێدا وەری ئەگرن بەتایبەتی. بەداڕژاندنی مانا لێدانەوەی ئەو ئایەتانەی پێشو بۆمان ڕون ئەبێتەوە کە ئەو ئایەتانە بۆ ئەوە نەهاتونەتە خوارەوە کە عەرەبەکان ئەکرێن بەدوو بەشەوە لەسەر بنچینەی دەشتەکی و شارستانی .

شارستانیەکان گەورەترو بەڕێزترین لای خوا. چۆن ئەبێ وابێ؟ کەچی خوا بفەرموێ هەندێ لەدەشتەکیەکان کەسانێ هەن نیازپاك و کردەوە خاوێنن، ئەگەر وابوایە ئەبوایە خوا دەشتەکیەتی قەدەغە ئەکرد، وەك ستەم کردن و بوختان کردن. بەڵکو ئادەمیزاد ئەکا بەدوو بەشەوە: بەگوێرەی خۆپاراستن و کردەوەی چاکیان. بەگوێرەی لادانیان لەسنوری خواو لانەدانیان. کەواتە هەرکەسێ لەعەرەب و جگەی عەرەب لەدەشتەکی و لەشاری چاکەی کرد بەچاك دائەنرێ لای خوا،هەر کەسێ خراپەی کرد بەخراپ دائەنرێ .

دەشتەکیەتی هۆی خراپی نیە. بەلام ئەوەندە هەیە ژیان و گوزەرانی دەشتەکی و دوربونیان لە هۆکانی شارستانیەتی و لەزانستی ئەبنە هۆی ووشکی ودڵ ڕەقی ئەوان و لادانیان لەسنووری خوا بەزۆرتر لەشاریەکان. یانێ تاوان تاوانی ئەو ژیانەو ڕەوشتەیە لەنێویدا ئەژین، سوچ سوچی دەشتەکی نیە.

مەبەست لەناوەڕۆکی ئەو ئایەتە ئەمەیە: دانیشتوانی دەشت لە بێ باوەڕان و دووڕوان وێنەی دانیشتوانی شارن، هەیانە دووڕوو بێ باوەڕن. بەلام بێ باوەڕان و دووڕوەکانی دەشت زبرترو ووشکترن لە بێباوەڕی و دووڕوییەوە، ئەگەر باوەڕیش بهێنن وا ئەبێ تیژترو پاکتر بن لەزربەی شاریەکان. بەو جۆرەی باس کرا جیاوازی نێوان دەشتەکی و شاری نیە لەبەر ئەوەی دەشتەکین و شارین.

کاتێ خوای مەزن باسی دووڕوان و بێباوەڕانی فەرمو،باسی ئەو کەسانەیشمان بۆ ئەکا لەپێشەوە باوەڕیان هێناوە و ئەفەرموێ:

وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ مُنَٰفِقُونَ وَمِنْ أَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ مَرَدُوا۟ عَلَى ٱلنِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ

عَظِيمٌ ﴿١٠١﴾ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾

﴿ وَالسّابِقُونَ الاَوَّلُونَ مِنَ الْمُهاجِرينَ وَالاَنْصار ﴾ وە ئـەو کەسـانەی پێش کـەوتون یەکەم جار لـەکۆچ کەران و یاریدەران بـۆ کـۆچ کـردن و یـاریدان. زانایـان بـۆ دیـاری کردنی ئەو کەسانە بیریان جیاوازە:

زربەیان ئەڵێن ئەو کەسانەن کۆچیان کردوە و یاریدەی پێغەمەریان داوە بەر لــەڕۆژی بەدر.

هەندێ تریان لایان وایە ئەو کەسانەن لە (بیعة الرضـوان) دەسـتیان نایـە نێو دەسـتی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەڵێنیاندا بە پێغەمەر لەگەڵیا بن هەتا مردن لــەژێر درەخێکـا کۆبوبونـەوە لـەکۆتایی مـانگی زیلقـەعدە سـاڵی شەشـەمی کۆچـی کەبــەناو بانگــە بەئاشــتەوای (ئەلحودەبیە). هەندێ تریان لایان وایـە ئـەو کەسـانەن نوێژیـان کـردوە بـۆلای هـەردوو ڕوانگەکان لـەبەیتولموقەدەس و لـەکەعبە، ئەوەی بەهێزتر بێ لـەو بیرو بۆچونانـە مەبەسـت لـەپێش کەوتوە یەکەمەکان کەسانێکن پێش کەوتبن لـەکۆچ کردن و یاریدان بـەر لــەوەی موسڵمانان ببنە خاوەنی هێزی بەرگری لـەخۆیان و لاوازەکان لەئایین وەرنەگــەڕێن. ئـەو شتانەیش لـەڕۆژی بەدردا ئاشکرا بون و بتپەرسـتان هەسـتیان بـەهێزی ئیسـلام و ئـازایی ئەوان کرد.

﴿ وَالَّذِينَ اتَّبَعُهُمْ باَحْسانِ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆن دوای پێشــوەکان کـەوتوون لــەو دوو تاقمەی کۆچکەران و یاریدەران بەباوەڕو بەپەرسـتنەوە لــەهاوڕێکانی تـری پێغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ تەبەرسی ئەڵێ: مەبەست ئەو کەسانەیە لـەپاش ئەوانەوە دێن هەتا ڕۆژی دووایی.

﴿ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُمْ وَرَضـوا عَنْـهُ ﴾ خـوا ڕازی بـوە لــەپێش کـەوتوەکان و پــاش کەوتوەکان و خۆشیانی ئەوێن و، ئەوانیش ڕازین لـەخواو لـەو پاداشتەی بەوانی بەخشــیوە لەچاکە هەردوو جیهان.

﴿ وَأَعَدَّلَهُمْ جِناتٍ تَجْرِی تَحْتَها ٱلأَنْهارُ خالِدِینَ فیها أَبَداً ﴾ وە خوا ئامادەی کردوە بۆ ئەوان چەندین باخ و بۆلاخ ئەڕوا بەژێر درەختەکانیاو بەم لاولای کۆشکەکانی‌دا چەندین ڕوباری ئاوی شیرین و ڕون، بەردەوامن لەنێو ئەو بەهەشتانەدا هەتایەو هەرگیز دەرناکرێن.

﴿ ذلِكَ الْفَوْزا الْعَظِیمُ ﴾ ئەو ڕازی بونەی خواو ئەوان و ئەو بەهەشتانە ئامادەکراوە پیرۆزی و سەرکەوتنی زۆر گەورەیە بۆ ئەوان.

﴿ وَمِمَنّ حَوْلَكُمْ مِنْ ٱلأَعْرابُ منافِقُونَ ﴾ وە کەسانێ هەن لەم لاولای شارەکەتانەوە کە مەینەیە لەعەرەبە دەشتەکیەکان دووڕون لە هۆزەکانی جوهەینەو موزەینەو ئەسلم و ئەشجەع و غەفار.

﴿ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِینة مَرَدُوا عَلَی النِفاقِ ﴾ وە هەندێ لەدانیشتوانی مەدینەن ڕاوەستاون لەسەر دووڕوی لەدووڕوەکانی هۆزی ئەوس و خەزرەج.

﴿ لاتَعْلَمُهُمْ وَنَحْنُ نُعَلَمُهُمْ ﴾ تۆ ئەوان نازانی و نایان ناسی و بێ‌باوەڕیان لەدڵی خۆیانا داناوە.

بەڵام بەڕووالەت باوەڕوچاکە دەرئەبڕن و، ئێمە ئەیان زانین و ئەیان ناسین و ئاگامان لەدڵیانا چ شتێکی تێدایە لەخراپە و دووڕوی.

خوای مەزن باسی دووڕووانی کردوە لەچەند ئایەتێکی زۆردا، لەو ئایەتەدا دووپاتی کردۆتەوە بەهۆی باسکردنی باوەڕدارە پێشوەکان و باوەڕدارە دوواییەکانەوە، بۆ ئەوەیش خوا هەواڵ بدا بەپێغەمەر بەڕێزو گەورەیی خۆی و جێگەو نیشتمانی دووڕوەکان. بەتایبەتی دووڕوانی مەدینە کە کارامەن لەسەر دووڕوی و ئەزانن زۆر بەوردی خۆیان لەپێغەمەر بشارنەوە هەرچەندە هەمو کاتێ تێکەڵاوی کۆڕو کۆمەڵی موسڵمانانیشن. لەپاشا خوای مەزن باسی جۆری سزادانی دووڕوەکان ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ سَنُعَذِبَهُمْ مَرَّتَیْنِ ﴾ ئێمە سزای ئەو دووڕوانە ئەدەین دووجار: جارێ بەئابڕوبردنیان لە جیهاندا، جارێ تر بەسزادانیان لە گۆڕەکەکانیانا.یاجارێ تر بەزەکات لێ سەندنیان و جارێ تر بەفەرمان پێ دانیان بۆ جەنگ کردن.

﴿ ثُمَ یُرَدُّونَ اِلی عَذابٍ عَظیمٍ ﴾ لەپاشا ئەو دووڕوانە ئەگێڕنەوە بۆلای سزایەکی زۆر گەورە لەڕۆژی دووایدا بەئاگری دۆزەخ و بێبەش کردنیان لەمیهرەبانی خوا لەو کاتەدا.

﴿ وَاخَرُونَ اعتَرَفوا بِذِنُوبِهُمْ ﴾ وەبەم لاولای ئێوەدا هەن تاقمێ لەدووڕوانەو دانیان ناوە بەگوناهەکانی خۆیانا کە دوواکەوتوون لەجەنگی تەبوك، وەك دووڕوەکانی تر بەدرۆ بیانویان ئەهێنایەوە بۆتۆ، ئیتر ژمارەی ئەو کەسانە چەندە بن گرنگ نیە.

﴿ خَلَطوا عَمَلاً صالِحاً وَاخرسَیّئاً ﴾ ئەو کەسانە تێکەڵاویان کردوە کردەوەیەکی چاك و کردەوەیەکی خراپ. یانێ وائەبێ ئەچنە دەرەوە بۆ جەنگ و باوەڕ پاڵیان پێوە ئەنێ، وایش ئەبێ هەواو هەوەس سواری سەرشانیان ئەبێ و ناچنە دەرەوە. ئەو بەشەیان زۆرترن لەوانەی چاکەکەرن لەپاشا خوای گەورە ڕونی ئەکاتەوە بەسەرهاتی ئەو تاقمانە و ئەفەرموێ:

﴿ عَسَی اللّٰهُ اَنْ یَتُوبَ عَلَیْهُمْ اِنّ اللّٰه غَفُورٌ رَحیمٌ ﴾ شایان و ئومێدە خوا پەشیمان بونەوە لەوکەسانە وەرگرێ و بیڕێژێ بەسەریانا،لەبەر ئەوەی ئەو تاقمە هەستیان بەگوناهباری خۆیان کردوە، ددانیان ناوە بەگوناهی خۆیانا. کەواتە جێگەی ئومێدی بەزەی میهرەبانی خوان. بەڕاستی خوا لێ خۆشبونی زۆر بۆ پەشیمان بونەوەکان ،بەزەیی زۆرە بۆ کەسانێ بمرن لەسەر پەشیمان بونەوە.

لەپاشا خوای مەزن ڕوی فەرمودەی خۆی ئەکاتە پێغەمەرو فەرمانی پێ ئەدا زەکات وەربگرێ لەو دووتاقمە ددانیان ناوە بەگوناهی خۆیانا، فەرمانیشی پێ ئەدا بۆیان بپارێتەوەو ئەفەرموێ:

خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ وَأَنَّ

ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ وَقُلِ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠٦﴾

﴿ خُذْ مِنْ أَمْوالِهِمْ صَدَقَة تُطهرهُمْ وَتزكيهمْ ﴾ تـۆ وەربگـرە لـەدارایی ئـەو کەسـانە دەدانیان ناوە بەگوناهباری خۆیانا،وەریشی بگرە لەدارایی هەمو موسـڵمانان زەکاتـەکانیان هەتا ئەوان پاك بکاتەوە لـە گوناهی، خۆشەویستی ئەوان بۆ ئەو داراییە ئەبێتە هۆی یـاخی بونیان و، هەتا زۆر بکا بۆ ئەوان و گەشە بکا و پەرە بسێنێ چاکەی ئـەوان بـەهۆی ئـەو زەکاتەوە.

﴿ وَصَلّ عَلَيهِمْ إنَ صَلاتَكَ سَكَنٌ لَـهُمْ ﴾ وە تـۆ بۆیـان بپـاڕێرەوە لای خـوا بـۆ ئـەو کەسانە زەکاتیان لێ وەرئەگری و بڵێ: خوا پیت و فەڕ بخاتە دارایـــی ئێـوە و لێخۆشـبون بڕێژێ بەسەرتانا. بەڕاستی پاڕانەوەی تۆ بۆ ئەوان خۆشی و ئاسایشە بۆ دڵی ئەوان بەهۆی پاڕانەوەی تۆ بۆ ئەوان.

﴿ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَليمٌ ﴾ وە خوا ئەبیستێ پاڕانەوەی تۆبۆ ئەوان و لـەتۆی وەرئەگرێ ئەو پاڕانەوەیـە، ئـەزانێ بـەنیازی ئـەو کەسـانە زەکاتـەکانیان داوە بەخوایشـتی خۆیـان بـۆ نزیکبونەوە لەخوا بەتەنها .

﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللّهُ يَقْبَلُ التَّوْبَة عَـنْ عِبـادِهِ ﴾ ئایـا ئـەو کەسـانە پەشـیمان بونەتـەوە نەیانزانیوە کە بەڕاستی خوا پەشیمان بونەوە وەرئەگرێ لەبەندەکانی خۆی کـاتێ نیازیـان پاکبێ .

﴿ وَيأْخُذُ الصَّدَقاتِ وَأَنَّ اللّهَ هُوَ التَوابُ الرَّحيمُ ﴾ وە خوا وەرئەگریٚ زەکاتەکانیان و پاداشتیان ئەداتەوە لەسەر دانی زەکاتەکانیان و،ئایا نازانن بەڕاستی خوا پەشیمان وەرگرتنی زۆرە، خاوەنی بەزەیی و میهرەبانیە.

﴿ وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرى اللّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُ والْمؤْمِنُونَ ﴾ وە تۆ بلٚیٚ بەو کەسانە پەشیمان بونەتەوە: ئێوەیش کار بکەن و ئەوەی لەتواناتانا هەیە بیکەن لەپەرستنی خواو بەجیٚ هێنانی پێویست کراوەکان،دوایی خواو نێرراوی خواو باوەڕدران بەو کارەی ئێوە ئەزانن.

بۆ زانین: شێخ موحیەدینی ئیبنولعەرەبی لەجزمی چوارەمی فتوحاتی مەکیدا ئەڵیٚ (مانای بینینی شتیٚ لەخواوە یانیٚ لە هەمو لایەکەوە ئەیزانیٚ. مانای بینینی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ شتی بینراو ئەزانیٚ لەڕێگەی سروشەوە هاتۆتە خوار بۆ لای. مانای بینینی باوەڕدران شتیٚ ئەزانن کە بزانن بەئەندازیە. وەریان گرتوە لەو سروشەی هاتۆتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بەکورتی لەبەر ئەوانەی باسکران هەرکەسیٚ کارێکی چاك بکا خۆشەویستە لای خواو نێرراوی خواو باوەڕداران .

﴿ وَسَتُرَدُّونَ اِلى عالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهادَةِ فَيُنَبئُكُمْ بِما كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ وە لەمەو دووا ئێوە ئەگێڕینرێنەوەپاش مردنتان بۆلای خوایە ئەزانیٚ بەو شتانەی دیارنین و بەشتانەی لەبەر چاون و ئاشکران، دوایی خوای خاوەن زانا هەواڵئەدا بەشتیٚ ئێوە ئەیکەن لەکاری چاك و خراپ، بەگوێرەی خۆیان پاداشتان ئەداتەوە. هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو سیٚ ئایەتانەی پێشو دەربارەی (١٠) کەسە لەو کەسانە چونەتە دەرەوە بۆ جەنگی تەبوك کە بیانویان بەدرۆ ئەهێنابوەوە بۆ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾.کاتیٚ ئایەتی هەڕەشە هاتە خوارەوە بۆ ئەو کەسانەی نەچوبونە دەرەوە، حەوت کەسیان خۆیانیان بەستەوە بە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە.کاتیٚ پێغەمەر هاتەوە لەتەبوك چو بۆ مزگەوت هەتا دوورکات نوێژ بکا، چاوی بەو حەوت کەسانە کەوت بەستراونەتەوە، ووتیان بە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ سوێندیان خواردووە خۆیان نەکەنەوەهەتا پێغەمەر نەیان کاتەوە. پێغەمەر فەرموی: من سوێند ئەخۆم نایان کەمەوە

هەتا خوا فەرمانم بۆ نەنێرێتە خـوارەوە لەبـەر ئـەوەی وازیـان لـەمن هێنـاوەو لەجـەنگ دوواکەووتون. لەپاشا خوای مەزن دەربارەی ئەو حەوت کەسانە ئایـەتی (١٠٤) ی ئـەم سورەتەی نارده خوارەوە. پێغەمەر بەرەڵای کـردن بیـانوی لێ ورگرتـن، کـاتێ بـەرەڵای کردن ووتیان: ئەی فروستادەی خوا: هەرچی داریمان هەیە بیبەخشە لـە ڕێگـەی خـوادا. پێغەمەر فەرموی: فەرمانم پێ نەدراوە لەو بارەوە، دووایی خوای مەزن ئەو سێ ئایەتانـەی پێشوی ناردنە خوارەوە.

ئەو سێ کەسەکانی تر خوای گەورە فەرمانی خۆی دوا خست بـەم ئایتـەی خـوارەوە هەتا ئایەتی (١١٨) ەی ئەم سەرەتەی ناردە خوارەوە،خوا بۆ دوواخستنی فـەرمانی خـۆی لەبارەی ئەو سێ کەسانەوە ئەفەرموێ:

﴿ وَاخَرُونَ مُرْجُونَ لأَمْرِ اللّهِ إما أنْ يُعَذِبُهُمْ وَّإما يَتُوبُ عَلَيْهُمْ واللُه عَلِيـمُ حَكِيـمٌ ﴾ وە تاقمێ تر هەن لـەو کەسانە دوواکـەوتون دوواخـراون لـەبـەر فـەرماندانی خـوا لـەبارەی ئەوانەوە لـەبەر هۆیەکی خاوەن سود بۆ ئەوان یاخوا سزای ئەوان ئەدا ئەگەر بەردەوامبون لـەسەر دووڕویی و، یا خوا پەشیمان بونەوەیان لێ وەرئەگرێ و لـەوان خۆش ئەبێ ئەگـەر پەشیمان بونەتەوە خوا ئەزانێ بە پاشەڕۆژی ئەوان چۆن ئـەبێ، هـەموو شتێ لـەجێگـەی شیاوی خۆیا دائەنێ هەر شتێکیان لـەگەڵ بکا.

خوای مەزن لـەئایەتی (١٠٠) ی ئەم سورەتەوە باسی چوار بەشی کردوە لەدانیشتوان (١) ئەو تاقمەی پێش کەوتون لـەکۆچ کردن و لـەیاریدانی پێغەمەر (٢) تاقمێ تریان پـاش ئەوانکـەوتوون بەچاکـە کـردن و پەرستنی خـوا (٣) تـاقمێ تریـان دوو ڕوون و دان بەخراپەی خۆیانا نانێن. (٤) تاقمێ تریـان ددان بـەگوناهی خۆیانـا ئـەنێن. لـەم ئایەتـەی دواییدا خوا ئاماژەی فەرموە بۆلای تاقمێ باسی نەکردون و چۆنـن و کێـن، باسـی چـوار بەشەکانی ترو چۆنیەتیانی ڕون کردوەتەوە.

بۆ باس نەکراوەکان ئەفەرموێ:دوا ئەخرێن یـابۆ سـزا دان یـا بـۆ لێ بوردنیـان، پاشـە ڕۆژیان هەواڵەی خوایە. زۆر لـەزانایان ئـەڵێن: ئـەم ئایەتـە هاتوەتـە خـوارەوە لـەبارەی

کۆمەڵێ لە موسڵمانان دوواکەوتن لەخزمەت پێغەمەردا بۆ جەنگی تەبوك لەپاشا پەشیمان بوبونەوە. ئایەتی (١١٨) ی ئەم سورەتە بە ئاشکرا باسی سێ کەسی تر لە هاورێکانی پێغەمەر کردوە دوواکەوتن لە دەرچون بۆلای تەبوك لەخزمەت پێغەمەردا، لەپاشا پەشیمان بونەوەو خوا پەشیمان بونەوەی لێ وەرگرتن و بڵاوی کردەوەو وازی لێ نەهێنان لەنێو ترس و ئومێدا بن، بە پێچەوانەی ئەو تاقمە فەرماندان بۆیان دوواخرا ئەهاتن و ئەرۆیشتن لەنێو سەرگەردانیدا و لەنێو ترس و ئومێدا.

زانایان ئەڵێن: هۆزی بەنو عەمری کوڕی عەوف مزگەوتێکیان دروست لە (قوباء) کاتێ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کۆچی کرد بۆ مەدینە بو بەمیوانیان لەدووازدەی مانگی ڕبیعولئەوەڵدا، چوار ڕۆژ لەنێوانیانا مایەوە، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لەڕۆژی هەینیدا چوبۆ مەدینە، لەپاشا داوایان کرد لە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لەمەدینەوە بچێ بۆ (قوباء) نوێژ لەو مزگەوتەدا بکا، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ڕۆیشت و نوێژی تێدا کرد، لەپاشا کۆمەڵێ لەدووڕوان دڵپیسی خۆیانیان دەربڕی کەلەبەرەی بەنوغەفاری کوڕی عەوف بون بەدژی ئەو کەسانە وە مزگەوتێ تریان دروست کرد، ئەوانیش داوایان کرد بەدڵپیسیەوە کە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ نوێژ لەو مزگەوتەدا بکا. پێغەمەر فەرموی: من لەسەر ڕۆیشتنم بۆ تەبوك ئەگەر هاتمەوە نوێژی تێدا ئەکەم خوا ئارەزو بفەرموێ، کاتێ پێغەمەر هاتەوە لەتەبوك خوا ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە لەبارەی ئەو مزگەوتەوە، فەرموی:

وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًۢا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ

يَوۡمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ ١٠٨ أَفَمَنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقۡوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٍ خَيۡرٌ أَم مَّنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٖ فَٱنۡهَارَ بِهِۦ فِي نَارِ جَهَنَّمَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٠٩ لَا يَزَالُ بُنۡيَٰنُهُمُ ٱلَّذِي بَنَوۡاْ رِيبَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ١١٠

﴿ وَالَّذِينَ اتَّخَذُ وَامَسْجِداً ضِراراً وَّكُفْراً وَتَفْرِيقاً بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ وە کەسانێ تری ئەوتۆ هەن دروستیان کردوە مزگەوتێ لەبەرزیان گەیاندن بە موسڵمانان و لەبەر بێباوەڕبون بەخواو تانەدان لە پێغەمەرو لەبەر پەیدا کردنی دووبەرەکی و ئاژاوە لەنێو باوەڕدارانا و وازهێنانیان لە پێغەمەر.

زانایان ئەڵێن: ئەو کەسانە پازدە کەس بون لەهۆزی بەنو غەنەم.

﴿ وَإِرْصاداً لِمَنْ حارَبَ اللَّهَ وَرَسُلَهُ مِنْ قَبْلُ ﴾ ئەو کەسانە ئەو مزگەوتەیان ئامادە کردوە بۆ کەسێ جەنگی کردوە لەدژی خوا و نێراوی خوا لەوەوبەر،ئەو کەسە ئەیەوێ خۆی کۆ بکاتەوەو جەنگ لەگەڵ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بکا، ئەو کەسانە ئەو مزگەوتەیان دروست کردوە بیکەن بەبنکە بۆ ئەو کەسە زانایان ئەڵێن: ئەو دوژمنەی خواو پێغەمەر ئەوان چاوەڕوانی ئەکەن پیاوێ بو لەهۆزی خەزرەج ناوی ئەبوعامیر بو،بوبو بەگاور لەنێو خزمەکانیا خاوەنی ڕێزو سەرۆکایەتی بو، کاتێ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ هاتە مەدینە ئەو پیاوە لەسنور دەرچو، دوژمنایەتی خۆی دەربڕی بۆ پێغەمەر، پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەو پیاوەی ناونابو

بەدەرچو لەسنوری خوا. کاتێ ئەو دوژمنە بۆی دەرکەوت ڕێزو پلـەی پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ لەبەرزبونەوەدایە دڵی پڕ بو لەکینەو ڕق لەپێغەمـەرو هەڵـهات و چـو بـۆ مەکـە، هـانی قوڕەیشەکانی ئەدا لەدژی پێغەمەر﴿ ﷺ﴾. لەپاش گرتنی مەکە ڕای کردو چو بـۆ تـایف، کاتێ دانیشتوانی تـایف موسـڵمان بـون چـو بـۆ شـام.لەشـامەوە نوسـراوێکی نـارد بـۆ دووڕووان لەمەدینە لە یاریدەرانی خۆی کە خۆیان ئامادە بکەن و مزگەتێ دروست بکەن و بیکەن بەجێگەی ڕاوێژی خۆیان لە کاتێ ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمـەر فـەرمانی دا بەهەندێ لەهاوڕێکانی خۆی بچن ئەو مزگەوتە بڕوخێنن کە ئـەو سـتەمکارانە دروسـتیان کردوەو بیشی سوتێنن، ئەوانیش ڕۆیشتن و ڕوخاندیان، پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ فەرمانی دا بیکـەن بە شوێنی پیـس و پۆخڵـی. لـەم سـەردەمەی ئێمـەدا ئـەو جـۆرە شـوێنە زۆرن بـەناوی جیاجیاوە. دوژمنانی ئیسلام دروستیان کـردوون بـۆ کزبونـی و نەهێشتنی ئـایینی پـاکی ئیسـلام و بـۆ دووبـەرەکی نانـەوە لـەنێو موسـڵماناندا،وێنـەی ئەوانـە بـەو ناوانـەی خوارەوەن:جێگەی پەرستنی وانەکان بەڵێن گای وانەکان نوسینگەی گشـتی کۆمەڵایـەتی ئایینییانەی ڕۆشنبیری – یانەی وەرزش – یانەی فەرمانبەران – یەکێتی ژنان – هەتا بـێ، چەندین ڕۆژنامەو گۆڤارو هۆنراوەو پەخشانی زۆر کە بڵاو ئەکرێتـەوە بـەناوی ئایینـەوە. زۆربەی ئەو شتانە زاوێنی و دوژمنانی ئیسلام دروستیان ئەکەن ئـەو ئـەبوعمیرە کوڕێکـی هەبو بەناوی (حەنزەلـە) یەکێ بو لەهاوەڵەکانی پێغەمەر (د.خ) کە لـە جـەنگی ئوحـودا کوژرا لـە خزمەت پێغەمەردا فریشتەکان شۆردیان،بۆیە ناونرا بە شۆرراوی فریشتەکان.

﴿ وَلَيَحلَفُنَّ اِنْ اَرَدنا اِلاَّالْحُسْـنى وَاللّـهُ يَشـهَدُ اِنَّـهُمْ لَكـاذِبُونَ﴾ وە بەڕاسـتی ئـەو دووڕووانە کە ئەو مزگەوتەیان دروست کـرد سـوێند ئـەخۆن ئێمـە هیـچ مەبەسـتێکمان لەدروست کردنی ئەو مزگەوتە نیە مەگەر هەر چاکەکردن و پەرستنی خواو سودی تـری موسـڵمانان و ،خـوا شـایەتی ئـەداو ئـەزانێ بەڕاسـتی ئـەو کەسـانە درۆ ئەکـەن لـە سوێندەکانیانا.

﴿ وَلاتَقُمْ فيِه أَبَداً ﴾ وە تۆ ڕامەوەستە و نوێژ مەکە لەنێو ئەو بەناو مزگەوتە هەرگیز کە بۆ ئاژاوە نانەوە دروست کراوە. ئەو ڕستەیە بەڵگەی ئاشکرایە هەر مزگەوتێ دروست کرا بۆ ئاژاوە نانەوەو دووبەرەکی زیان گەیاندن بەموسڵمانان دروست نیە نوێژی تێدا بکرێ.

﴿ لَمَسْجِدٌ أُسِسَ عَلَى التَّقْوى مِنْ أَوُّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَنْ تَقُوم فِيهِ ﴾ بەڕاستی مزگەوتێ بنچینەی دانرابێ لەسەر حۆپاراستن لەگوناهو بۆ پەرستنی خوا لەیەکەم ڕۆژی دروست کردنیەوەو دوربو بێ لەئاژاوە شایانترە تۆ لەنێودا ڕاوەستێ و نوێژی تێدا بکەی.

﴿ فِيهِ رجالٌ يُّحُبونَ أَنْ يَّتَطَهَرُوا ﴾ لەنێو ئەو مزگەوتەدا هەیە کە بنچینەی دانراوە لەسەر حۆپارێزی چەندین پیاوێ پێیان خۆشە وشادمان کە پاك ببنەوە لەگوناە،پاك ببنەوە لەلەش پیسی و بێ دەست نوێژی. تاقمە پیاوێکن لەش خاوێنن بەنهێنی و ئاشکراییانەوە،ئەو مزگەوتەیش ئەوەیە ئەو پیاوانە ئەچنە نێوی بۆ نوێژ کردن و پەرستنی خوا،نەك بۆ دووڕوی و بۆدرۆو دووبەرەکی و ڕاوێژی خراپ بۆدژی پێغەمەر (د.خ) و بۆ دژی موسڵمانان.

﴿ وَاللّهُ يُحبُّ المتَطَهِّرينَ ﴾ وەخوا خۆشی ئەوێ ئەو کەسانە خاوەنی پاکی و پوختەیین ودۆستی ئەوانە ونزیکیان ئەخاتەوە لەخۆی.

زۆربەی زانایان لایان وایە ئەو مزگەوتە خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی فەرموە مزگەوتی قوبایە لەباشوری مەدینە دورە لە مەدینە نزیکەی دوومیل. دارژاندنی ئایەتەکانی پێشو لایانی ئەم زانایانە ئەگرن. هەندێ لەزانایان ئەڵێن: بریتیە لەمزگەوتی مەدینە،هەندێ تر لەزانایان ئەڵێن: بریتیە لەهەمو مزگەوتێ موسڵمانان دروستی بکەن لەهەرجێگەیە هەر لەبەر خوا بێ و بەس: نەك بۆ شۆرت و دەنگ و باس و ئاژاوەنانەوە.

﴿ أَفَمنْ أَسَّسَ بُنْيانَهُ عَلَى تَقْوى مِنْ اللّهُ وَرضوانٍ خَيْرٌ ﴾ ئایا کەسێ بنچینەی ئایینی خۆی دانابێ لەسەر پەرستنی خواو لەسەر خۆشەویستی خوا ئەو کەسە چاکترە ،

﴿ أمْ مَنْ أسَّسَ بُنْيانَهُ عَلَى شَفاجَرُفٍ هارٍ فانْهارَ بِهِ فی نار جَهَنَّمَ ﴾ یا کەسێ بنچینەی ئایینی خۆی دانابێ لە سەر لێواری شیوێ بەتێپەڕینی ماوەیە بڕوا بەسەریا لاوازی و لەرزۆکی وژێری تەنك بوبێ و لەوانەبێ ئەو دیوارەکەی بڕوخێ، دوایی ئەو زەویە لەرزۆك و ژێر تەنکە بکەوێتە خوارەوە بەو کەسەی دروستی کردوە بۆ نێو ئاگری دۆزەخ، ئەو ڕستانە بۆ ئەوەیە و بۆ وێنەیە چاکتر مرۆڤ تێ بگا.

﴿ وَاللّهُ لایَهْدِی الْقَوْمَ الظالِمِینَ ﴾ وە خوا ڕێگەی نیشان نادا بەتاقمێ ستەمیان کردوە لەخۆیان و لایاندابێ لەشتێ ڕزگاریان بکا لە سزای خواو لەوان خۆشنابێ لەڕۆژی دوواییدا.

﴿ لایَزالُ بُنْیانَهُمْ الَّذِی بَنْوا رِیبَةً فی قُلُوبِهِمْ ﴾ بەڕوخاندنی ئەو مزگەوتەی ئەوتۆ ئەو دووڕووانە دروستیان کردوە لانابا ئاژاوە نانەوەو دوبەرەکی و خراپە کردن و گومان و دووڕویی لەدڵیانا، دوای ئەوەیش ڕوخێنراوە، هێشتا گومانیان لە پێغەمەرایەتی پێغەمەردا بەردەوامەو لەهەوڵی ئەوەدان تۆڵەی ئەو مزگەوتە خاوەن زیانە بکەنەوە .

﴿ إلا أنْ تَقَطَّع قلُوبُهُمْ وَاللّهُ عَلِیمُ حَکِیمٌ ﴾ مەگەر پارچەپارچە ببێ دڵی ئەو دووڕووانە و بمرن ئەو کاتە گومانیان نەمێنێ بەڕزینی دڵیان و خوا ئەزانێ بەنیازی ئەو دووڕوانە لەدروست کردنی ئەو مزگەوتەدا چ شتێ بوە؟ هەمو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ بەتایبەتی بۆ ڕوخاندنی ئەو مزگەوتە لەکاتی سێزدەهەم ساڵی ڕەوانەکردنی پێغەمەر و بونی بەپێغەمەر لەلایەن خوای مەزنەوە کە کۆتایی مانەوەی بو لەمەکە، لەوساڵەدا (٧٣) پیاو و دوو ژن لەموسڵمانانی مەدینە.کە هاتبون بۆ حەج شەوێك لەناوەڕاستی ڕۆژەکانی جەژنی قوربان بەڵێنیاندا لەخزمەت پێغەمەردا کۆبنەوە، دوایی پێغەمەر لەگەڵ عەباسی مامیدا هات بۆ لایان، لەباتی موسڵمانانی مەدینە عەبدولڵای کوڕی ڕەواحەو وتی:ئەی فروستادەی خوا: مەرجێ دانێ بۆ خۆتو بۆ پەروەردگاری خۆت، پێغەمەر فەرموی: مەرجی من بۆ خوا ئەوەیە بیپەرستن و هیچ شتێ نەکەن بەهاوبەش بۆ خواو لانەدەن لەفەرمانەکانی خوا، لەگەڵ سورو ڕەش جەنگ بکەن بۆ

پاراستنی کۆمەڵی ئیسلام. مەرجم بۆخۆم ئەمیە دوژمنم لێ بگێڕنەوە بەو جۆرەی دوژمن لەخۆتان و دارایتان ئەگێڕنە. موسڵمانەکانی مەدینە ووتیان:ئەگەر ئەو مەرجانەمان هێنایە دی چ شتێ بۆ ئێمە ئەبێ؟.

پێغەمەر فەرموی: بەهەشت بۆ ئێوە ئەبێ.ووتیان:مامەڵەکەمان خاوەن قازانجەو پەشیمان نابینەوە لەو بەڵێنەی داومانە بەپێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لەعەقەبەدا.ئەو بەڵێنە ناونرا بە (بیعة العقبة الثاني ). لەساڵی دووایی ئەو بەڵێنە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کۆچی کرد بۆ مەدینە، لەبارەی ئەو بەڵێنەوە خوای مەزن فەرموی :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ ۚ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ ۖ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ وَٱلْقُرْءَانِ ۚ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ ۚ فَٱسْتَبْشِرُوا۟ بِبَيْعِكُمُ ٱلَّذِى بَايَعْتُم بِهِۦ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١١١﴾ ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلْعَٰبِدُونَ ٱلْحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلْءَامِرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱلْحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾

﴿ إنَ اللّهُ أشترى مِنْ الْمؤمِنــينَ أنْفُسَــهُمْ وأمْوالَــهُمْ بـأنَّ لَـهُمْ الْجَّنـة ﴾ بەڕاسـتی خـوا لـەباوەوڕدارانی کڕیوە خۆیان و داراییەکانیان بەوەی بەڕاستی بۆ ئەوان هــەبێ بەهەشت، لـەشیان بۆ جەنگ کردن و داراییان بۆ کڕینی چەك و تفـاق و لـەناو بردنـی لـەجـەنگدا. یانێ خوا بکڕەو باوەڕداران بفرۆشن. نرخەکەیشــی بەهەشـتە، فرۆشـراوەکەیش لــەش و دارایی باوەڕدرانە. ناوبژیکەریان پێغەمــەرانن، لـەســەر بفرۆشـە فرۆشـراو بـدا بـەکڕیار لـەکاتی داواکردنیان نرخەکەیش لـەپاشا ئەدرێ بەوان و خوا بۆیان ئەبژێرێ، چ کەسێ بێ لـەخوا بەدەستەلأترو جێبەجێکەرتر؟

﴿ يُقاتِلُونَ فى سَبِيل اللّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيَقْتَلُونَ ﴾ باوەڕداران جـەنگ ئەکـەن بـە فرۆشـتنی خۆیان و بەداراییەکانیان و لـەڕێگەی ئایینی خواداو فەرمانبەرداری خوا، دوایــی کـاتی وا ئەبێ دوژمنان بکوژن و، ئەوانیش ئەبێ بکوژرێن بەدەستی دوژمنانیان.

﴿ وَعْداً عَلَيْهِ حَقاً فى التَّوْراةِ وَالأنجِيلِ وَالْقُران ﴾ بەڵێنی داوە خوا بەبەڵێندانێ لـەســەر ئەو کڕین و فرۆشتنە بەڕاستی جێبــەجێکردنی و تۆمـار کـراوە لـەتـەورات و ئینجیـل و قورئاندا. ئەو ڕستە بەڵگەیە لـەسەر ئەوەی هــەمو نەتەوەیـە فـەرمانی پێ دراو بەجـەنگ کردن و بەڵێنیانداوە.

پرسیار/ بەڕاستی خوا خاوەنی هەمو کەسێکە و خاوەن داراییەکان ،دوایی چـۆن ئـەبێ خاوەنەکەیان دارایی خۆی بکڕێ؟

وەلأم/ ئـەو کڕیـن و فرۆشـتنە بـەمانای زانـراو نیـە. بـەڵکو بەڕاسـتی هاندانـە بــۆ فەرمانبەرداری و پەرستن. ئاگادارکردنەوەی ئادەمیزادە باوەڕهێنــان گفتوگـۆی ڕوت نـین بەدەم ببێژرێ و وێنەکەی بڕوا بەمێشکدا. بەڵکو بەڕاستی باوەڕهێنان بەدانان و بەخشـینی گیانیان و دارایی بەنرخە بەرانبەر بەو ئاواتە بەرزەو بەردەوامە نیە کە چونی بەهەشتە.

﴿ وَمِنْ أوْفى بِعَهْدِةِ مِنَ اللّهِ ﴾ وە چ کەسێ بە وەفا تــرو جێبەجێکـەرتر بـۆ پـەیمانی خۆی لـەخوا، دەرچون لـەپەیمان لای ئادەمیزاد شورەییە.کەواتە ئــەو بەڵێنـەی خـوا بـەبێ گومان جێبەجێ ئەکرێ.

﴿ فاسْتَبْشِرُوا بِبَيْعَكُمْ الَّذِی بايْعتُمْ ﴾ دووایی ئێوەی باوەڕدار موژدە بدەن بەیەکتریو خۆشی خۆتان دەربڕن بەو فرۆشتنەی ئەوتۆ مامەڵتان پێوە کردوە، بەڕاستی ئێوە شتێکی بڕاوەی بێ‌نرختان داوە بەشتێکی بەردەوام و بەنرخ کەبەهەشتە.

﴿ وَذٰلِكَ هُوَ الفوز الْعَظِيمْ ﴾ وە ئەو مامەڵەو کڕین و فرۆشتنەی ئێوە سەرکەوتن و ڕزگاربونی گەورەیە.

﴿ التائبُونَ ﴾ ئەو کەسانەی باسکران بەو کردەوە بەرزانەوە پەشیمان بونەتەوە لەگوناهەکانیان بۆ لای پەرستنی خوا لەنهێنی و لە ئاشکرادا بەبێ خەوش و گەرد، لەهەمو شتێکی خراپ خۆیان ئەپارێزن.

﴿ الْعابِدُون ﴾ ئەو کەسانە خاوەنی نیازی پاکن لەپەرستنەکانیانا و سەرشۆڕن بۆ فەرمانبەرداری خوا لەهەمو فەرمانەکانیدا بەشەوو بەڕۆژ و بەبەردەوامی.

﴿ الْحامِدُونَ ﴾ ئەو کەسانە سوپاسی خوا ئەکەن لەسەر هەمو شتێ بیکا لەهەمو کاتێکا لەخۆشی و ناخۆشیدا و لەگرانی و هەرزانیدا.

﴿ السّائِحُونَ ﴾ ئەو کەسانە ئەگەڕێن بەزەویدا بۆ پەیدا کردنی زانیاری و هۆی گوزەران و ژیان، یا ئەو کەسانەن ڕۆژو ئەگرن.

﴿ الّراكِعُونَ السّاجِدُونَ ﴾ ئەو کەسانەن نوێژەکانیان ئەکەن بەڕکوع بردن و سوژدە بردنەوە، لەرکوع و سوژدەدان بۆ نوێژکردن بەهەمو پایەو مەرجەکانیانەوە بەجێی ئەهێنن.

﴿ آلا مِرُونَ بالْمَعْروفِ وَالناهُونَ عَنِ الْمُنكْر ﴾ ئەو کەسانە فەرمان ئەدەن بەچاکەو قەدەغە ئەکەن لە کارو کردەوەی خراپ، بانگی هەمو کەس ئەکەن بۆلای پەرستنی خواو بەرەنگاری ئەو کەسانە ئەکەن ئەیانەوێ مافی بەندەی خوا زەوت و داگیری بکەن.

﴿ وَالْحافِظُونَ لَحدُودِ اللّهِ ﴾ وە کەسانە ئەپارێزن و چاودێری کەرن بۆ سنور و فەرمانەکانی خوا بە ڕەواکانیان و قەدەغە کراوەکانیانەوە.

﴿ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ وە تۆ موژدە بدە بەباوەڕداران کە خاوەنی ئەو کردەوە چاکانەن بۆیان هەیە ڕێزی گەورە لەلای خوای مەزنەوە و ئەیبەخشێ بەوان بەهەشت و پلەوپایەی بەرز.

مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَن يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾

زانایان بۆ هۆی هاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتانەی پێشو بیریان جیاوازە بەم جۆرەی خوارەوە.

١-کۆمەڵێ لەباوەڕداران وتیان: ئێمە ئەپاڕێینەوە لە بۆ ئەو مردووانەمان هاوبەشیان بۆخوا داناوە، بەوێنەی ئیبراهیم کەپاڕایەوە بۆ باوکی.

٢-پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ چوە سەرگۆڕی دایکی و گریا لای گۆڕەکەیا، داوای دەستوری کرد لەخوا کەبۆ دایکی بپاڕێتەوە.

٣-کاتێ ئەبو تالیب کەوتە سەرەمەرگ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ چو بۆلای،لەوکاتەدا ئەبو جەهل و عەبدولای کوڕی ئومەیەی کوڕی موغەیرە لای دانیشتبون. پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرموی: ئەی مامی خۆم: بڵێ (لا إلـه ألاّ اللّـه) هیچ پەرستراوێ نیە جگەی خوا،

ووشەیەکە کەشایەتیت بۆ ئەدەم لەخزکەت خوادا بەووشەیە. ئەبو جەهل و عەبدولاّ وتیان: ئەی ئەبو تالیب: ئەتەویّ لابدەی لە پەیرەوی عەبدولموتەلیب؟. پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ وازی نەهێنا بۆ ووتنی ئەو ووشەیە.ئەوانیش ووتەی خۆیانیان دووپات ئەکردەوە،هەتا ئەبو تالیب لەکۆتاییدا ووتی: من لەسەر ئاینی عەبدولموتەلیبم، نەی ووت: (لاإلە إلا الله ) پێغەمەر فەرموی من واز ناهێنم وداوای لیّ خۆشبونت بۆ ئەکەم هەتا خوا قەدەغەی ئەکا لیّم. ئەو ڕوداوە لەمەکەدا بو کە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ کۆچیشی کرد بۆ مەدینە داوای لیّ خۆشبونی ئەکرد بۆ ئەبو تالیبی مامی هەتا لەمەدینە ئەو ئایەتانە هاتنە خوارەوە لەساڵی هەشتەمی کۆچیدا،بۆ قەدەغەکردنی پاڕانەوە بۆ بیّباوەڕان بەشێوەیەکی گشتی خوا فەرموی:

﴿ ماكانَ لِلنَبِيّ وَالَّذِينَ أمَنُوا أنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلمُشْرِكِينَ ﴾ شایستە نیە بۆ پێغەمەر و بۆ باوەڕداران کە داوای لیّخۆشبون بکەن بۆ ئەو کەسانە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە.

﴿ وَلَو كانُوا أوُلِى قُرْبى ﴾ وە باوەکو ئەو بت پەرستانە خاوەنی خزمایەتی زۆر نزیکبن، وەك لە پێشەوە باسکرا چەند پیاویّ لەهاوڕێکانی پێغەمەری خوا ووتیان: ئەی پێغەمەری خوا: باوکەکانی ئێمە چاکەیان ئەکرد لەگەڵ دراوسیّ دا مافی خزمایەتیان و مرۆڤایەتیان ئەگەیان بەجێگەی خۆیان، بەندەکانیان ئازاد ئەکرد و پەیمانیان بەجیّ ئەهێنا، ئایا ئێمە بۆیان بپاڕێینەوە. پێغەمەر فەرموی: بەڵیّ: منیش بۆ باوکم ئەپاڕێمەوە وێنەی ئیبراهیم کە بۆ باوکی ئەپاڕایەوە، بۆ قەدەغەکردنی ئەو پاڕانەوەیە ئەو ئایەتانەی ناردە خوارەوە.

پرسیار/ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ چۆن دەستور ئەدا بەهاوڕێکانی خۆی بپاڕێنەوە بۆ باوکە بتپەرستەکانیان؟

وەلام/ هەمو شتیّ ڕەوایە و دروستە بکریّ هەتا خوا فەرمان ئەدا بەقەدەغەکردنیان، کاتیّ ئەو دەستورەی داوە خوا فەرمانی نەدا بو بەقەدەغەکردنیان. لەپاشا پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ قەدەغەی کرد لەوان، خوای مەزن هۆی قەدەغە کردنی ڕون کردەوە بۆ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بۆیە پێغەمەریش ڕای گەیاند بەهاوڕێکانی .

﴿ مِنْ بَعْدِ ما تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنهُمْ مِنْ أَصْحابِ الْجَحِيمِ ﴾ لەپاش ئەوەی ڕون بویەوە بۆ ئەوان بەهۆی هەواڵدان و ڕون کردنەوەی لای خوا کەبەڕاستی ئەو کەسانە لەدانیشتوان و هاوڕێکانی دۆزەخن و دەرکەوت لەسەر بت پەرستی مردوون.

پرسیار/ لەکاتێکا داوای لێ خۆشبون بۆ بت پەرستان قەدەغەیە بێ،بۆچی پێغەمەر (د.خ) داوای لێ خۆشبونی کرد بۆگەلەکەی خۆی لەوکاتەدا ددانی پیرۆزی پێغەمەریان شکاند و دەم و چاویان بریندار کرد،فەرموی:ئەی خوایە :تۆ خۆش بە لەم گەلەی من بەڕاستی ئەوان نەزانن؟

وەڵام/ زانایان زۆریان وولآمی ئەو پرسیارەیان داوەتەوە بەوەی کەئەو ئایەتە قەدەغەی پاڕانەوەی کردوە بۆ ئەو کەسانە مردوون لەسەر بت پەرستنی. نەك بۆ ئەو کەسانە زیندوون و ئومێدی باوەڕهێنانیان لێ ئەکرێ. هەندێ لەزانایان ئەڵێن: ئەو داوایە لەپێغەمەرەوە بۆ مافی خۆیەتی بەتایبەتی بەسەر بت پەرستانەوە هەیتی کە ددانیان شکاند، نەك بۆ لابردنی مافی خوا کە بێ فەرمانی خوا کرابێ. بەبێ گومان بۆ هەمو ئادەمیزادێ هەیە دەست هەڵگرێ لەو ماف و لەو دەست درێژیانە کرابێتەوە سەری لەلایەن بێ بێباوەڕانە وە یا لە لەلایەن باوەڕدارانەوە. ئەی چۆن ئیبراهیم داوای لێ خۆشبونی کرد بۆ باوکی لەگەڵ ئەوەیشدا پاڕانەوە بۆ بێ باوەڕان دروست نیە، لەووڵآمدا خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَماكانَ أَسْتِغْفارُ إبراهيمَ لأَبية إلاّعَنْ مَّوْعِدةٍ وَّعَدَها إياهُ ﴾ وە پاڕانەوەی ئیبراهیم بۆ باوکی لەبەر هیچ شتێ نەبو مەگەر لەبر ئەو بەڵێنە بو ئیبراهیم بەڵێنی دا بو بەباوکی بۆی بپاڕێتەوە لەو کاتەدا کەوتبونە گفتوگۆ لەبارەی نەپەرستنی بتەکانەوە.

﴿ فَلَمّا تُبَينَ لَهُ أَنَّهُ عَدوُّللّهِ تَبَرَأَ مِنْهُ ﴾ دوایی کاتێ بۆ ئیبراهیم ڕون بوبووە کەبەڕاستی باوکی دوژمنی خوایە بێزار بو لەباوکی و وازی لەپاڕانەوە هێنا بۆی، دورنیە پاڕانەوەی ئیبراهیمیش وەك پاڕانەوە پێغەمەر بوبێ. ئیبراهیم وازی لەمافی خۆی هێناوە. نەك لەمافو بێ فەرمانی خواو پاڕانەوە بۆبت پەرستان.

﴿ إنَّ إبْراهيمَ لأَوّاهٌ حَليمٌ ﴾ بەڕاستی ئیبراهیم زۆر خەفەتی ئەخوارد و دڵ نەرم و لەخوا ترس بو،زۆر بەئارام و لەسەر خۆ بو لەو کاتەدا باوکی خراپەی لەگەڵ ئەکرد، لەکاتی توانادا خاوەنی لێ بوردن بوە بۆ ئەوانە دژایەتیان ئەکرد، ئەوە بو باوکی هەڕەشەی لێ کردوو وتی: ئەگەر تۆ واز لەبتەکان نەهێنی من واز لەتۆ ئەهێنم،ئیبراهیم لەباوکی بوردو گوێی نەدایە.

بۆ زانین: شیعەکان لایان وایە ئەبو تالیبی مامی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ باوەڕی هێناوەو موسڵمان بوە بۆ ئەو مەبەستە ئەتوانرێ تەماشای (الغدیر) دانراوی ئەمینی بکرێ بەرگی (٧) لاپەڕە (٣٦٩) چاپی ساڵی (١٩٦٧) یا تەماشای تەفسیر (الکاشف دانراوی) موحەمەد جەواد موغنیە بکرێ بەرگی چوار لاپەڕە (١٠٨)

هەندێ لەباوەڕداران ئەترسان پاڕانەوەیان بۆ بت پەرستان بەر لەقەدەغە کردنی گوناە بێ و ببێتە هۆی خەشمی خوا.لەو بارەوە خوا فەرموی:

وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًۢا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۚ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١١٦﴾

﴿ وما كانَ اللّهُ لِيُضِلَّ قَوْماً بَعْدَ إذ هَداهُمْ ﴾ شایستە نیە بۆ خوا لەڕێگە لابداو فەرمان بدا بەڕێگە لادانی تاقمێ لەباوەڕداران لەپاش ئەوەی ڕانومایی کردون و فەرمانی داوە بەشارەزابونیان.

﴿ حَتى يُبَيِنَ لَهُمْ ما يَتَّقُونَ ﴾ هەتا خوا ڕونی ئەکاتەوە بۆیان شتێ پێویستبێ خۆیـانی لێ بپارێزن و قەدەغەکرابێ و ئەوان بیکەن، ئەو کاتە بەگوێرەی ویستی خۆیان خـوا لـەڕێگـە لایان ئەدا. بەلاَم ئەگەر نەزانن بەشتێ ڕەوایە یا قەدەغەیە بیکەن سزایان نادرێ.

﴿ إنَّ اللّهَ بِكُلِ شَيْءٍ عَليمٌ ﴾ بەڕاستی خوا بەهەمو شتێ ئەزانێ و ئاگادارە لـەسـەرەتای کردەوەی ئەو باوەڕدارانەوە و کۆتایی بەسەر هاتیان و نیازیان لە جیهاندا .

﴿ إنَّ اللّهَ لَهُ مُلْكُ السَماواتِ وَالأَرْضِ ﴾ بەڕاستی بـۆ خوایـە خاوەنیـەتی و پاشـایەتی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لـەسەریانە و لـەنێوانیاندایە، وەك خۆرو مانگ و ئەستێرەکان و درەخت و کێوو ئاوو گیا و گیانەوەران و کانگاکان.

﴿ يُحْيي وَيُميتُ ﴾ خوا زیندو ئەکاتەوە هەموو مردوەکان لەنەبونەوە بۆ لای بـون و، ئـەمرێنێ هـەموو گیانلـەبـەران و زیندویـان ئەکاتـەوە لەپاشـەڕۆژدا بەوێنـەی زیندویـان لـەجیهاندا.

﴿ وَمالَكُمْ مِنْ دوُنِ اللّهِ مِنْ وَلِى ولانَصيرٍ ﴾ وە نیە بۆ ئێوە لە جگەی خوا هیچ دۆست و کاربەدەسـتێ بتانپـارێزێ لـەسـزای خـواو سـودتان پـێ بگەیـەنێ و، بۆتـان نیـە هیـچ یاریدەدەرێ قەدەغە بکا لـەئێوە سزای خوا کەگەنجینە و پیتی ئاسمانەکان و زەوی بەدەستە.

باسی جەنگی تەبوك و ئەو شتانەی پەیوەندیان بەو جەنگەوە هەیە هێشـتا کۆتـایی پـێ نەهاتوە، ئەو جەنگە جیاوازێکی یەکجار زۆری هەیە لـەگەڵ جەنگەکانی تـردا بەتایبـەتی. گرنگی ئەو جەنگە ئەوەیە لـەکاتی گرانی و برسێتی و گەرمی و تنوێتی زۆردا دەسـتی پـێ کراوە بە شێوەیە (١٠) کەس لـەموسـڵمانان هۆشـترێکیان هـەبو نـۆرە بـەنۆرە سـووارو پیادەیان لـەگەڵ یەکتری ئـەکرد، خواردەمـەنی و توێشـویان جـۆی سوسـایی و خورمـای کرماوی بو. یەکێکیان بەدانە خورمایەکی ئـەجوی و هـەتا تامەکـەی ئەچێشـت و ئـەیدا بەهاوڕێکەی، نەختێ ئاویان ئەخواردەوە، هەتا وایـان لێ هـات هوشـتریان سـەر ئـەبڕی و شیاکەی گەدەی هوشترەکەیان ئەگوشیە نێو دەمی خۆیانەوە و زمانیان پێ تەڕ ئەکرد.لـەو جەنگەدا دووڕووان نەچون بۆ ئەو جەنگە، بۆڕون کردنەوەی ئەو باسانە خوا ئەفەرموێ:

لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓا۟ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾

﴿ لَقَدْ تابَ اللهُ عَلَى النَّبِيِ ﴾ بەڕاستی خودا پەشیمان بونەوەی وەرگرت لەپێغەمەر.ناوبردنی پێغەمەر بۆ کردنەوەی باسەکەیە بەوێنەی کلیلێ. بۆ ئەوەیشە باسەکەی پێ شیرین بکرێ. ئەگینا پێغەمەر لەو کەسانە نیە شتێ بکا ببێتە هۆی پەشیمان بونەوە. پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ خوا پاراستویەتی لەگوناە، پەشیمان بونەوە وا ئەگەیەنێ گوناهی لێ پێش کەوتبێ ؟

زانایان بەجگەی ئەو باسە پێشوانە وولاّمی ئەو پرسیارەیان داوەتەوە بەمانەی خوارەوە:

١-ئەو ڕستەیە بەکار هاتوە بۆ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ لەبەر ئەوەیە لەوانەیە پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ خودای مەزن (خلاف الأولی) کردبێ .

٢-باسکردنی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بۆ ئەوەیە ڕێزی کۆچ کەران و یاریدەدەران ڕون ببێتەوە بۆ ئادەمیزاد بەو بۆنەوە دووای ناوبردنی پێغەمـەر نـاوی ئـەوان بـراوە،هـەروەك بـۆ ڕون بونەوەی گەورەیی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ خوای مەزن دووای ناوی خۆی ناوی پێغەمـەر ئـەهێنێ زۆر جاران.

٣-لەبەر ئەوەیە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ دەستوری دا بە دووڕووان نەچنە دەرەوە بۆ جـەنگی تەبوك پێش ئەوەی خوا فەرمانی پێ بدا،ئەوەیش جـۆرە چاکـە نەکردنێکـە لەپێغەمـەرەوە ﴿ ﷺ﴾ هەرچەندە بەگوێرەی بیری خۆی وای ئەزانی نەچونە دەرەوەیان چاکە، ئەوەبو لـە ئایەتی (٤٣) ی ئەم سورەتەدا خوا ڕوی فەرمودەی خۆی کردە لای پێغەمـەر و فـەرموی ﴿ عَفا اللهُ عَنْكَ لَمْ أذِنْتَ لَهُمْ ﴾ خوا لێت ببورێ بۆ دەستورت دا بەو دووڕووانە ؟

٤-هەمو کەسێ لای شایستەیەو پیێی خۆشە پلەی بەرز بێتەوە لەنزمەوە بـۆلای بـالآ پێغەمەر پەشیمان بوەتەوە هەتا پلەی بەرزتری پێ ببەخشـرێ. کەواتـە بۆمـان دەرکـەوت پەشیمان بونەوە مانای ئەوە نیە گوناهی لێ پێش کەوتبێ هـەر لەبەرزبونـەوەی پلـەو پایـە مەبەستە ئەفەرموێ بە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ :

﴿ لِيَغْفِرَ اللّهُ لَكَ ماتَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَماتأَخَّرَ ﴾ یانێ بـۆ ئـەوەی خـوا لـە گونـاهی تـۆ خۆشبێ لەشتێ پێش کەوتوە لەگوناهی تۆو لەشتێ دوواکەوتوە و لەمەو دووا دێت. یانێ لەو شتانە شایستە نیە لەتۆ پەیدا بن لەوێنە تۆوە ناو ئەبرێ بـەگوناه یـا لەجگـەی تـۆوە بەگوناه ناو ئەبرێ .

﴿ وَالْمُهاجِرِينَ وَالأَنْصار ﴾ وە خوا پەشیمان بونەوەی وەرگرتـوە لـەکۆچ کـەران و لـەیاریدەدەران لەبـەر ئـەوەی لایـان سـەختبو بچنـە دەرەوە بـۆ جـەنگی تـەبوك، چونکـە کاتەکەیان زۆر گەرم و ناخۆش بو، ئەوەیش بە گوناه دائـەنرێ بـۆ ئـەوان، بـۆ ئـەوەیش پلەیان بەرز بێتوە وەلای خوا بەهۆی پەشیمان بونەوەیان لەوەی لەدڵیانا پەنها درابـو،بـۆ ڕون بونەوەی ئەو ناخۆشیە خوا ئەفەرموێ.

﴿ الَّذِينَ اتَّبَعوُه فى ساعَةِ الْعَسْرة ﴾ کەسانێکی ئەوتۆن دووای پێغەمــەر کـەوتوون بـۆ جەنگی تەبوك لـە کاتێکی تەنگ و گراندا.

﴿ مِنْ بَعْدِماكادَ يزيغ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ ﴾ لـەپاش شتیَ نزیــك بـو لابـدا دڵــی هـەندیَ لـەکۆچ کەران و یاریدەران لـە بۆ چونە دەرەوە لـەگەڵ پێغەمــەر بـۆ جـەنگ و بـەردەوام نەبن لـەسەر باوەڕهێنان. بەڵام هەندیَ لـەوان توشی ناخۆشــی بـون لـەڕۆیشـتندا و توشـی دەمار تێك چون بون، ویستیان بگەڕێنەوە، خوا پاراستنی لـــەو نیــازەو ئـەوانیش ئارامیـان گرت لـەبەر خوا،بۆیە خوا ئەفەرمویَ:

﴿ ثُمَّ تابَ عَلَيْهُمْ إِنَّهُ بِهُمْ رَؤوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ لـەپاشا خوا پەشیمان بونەوەی وەرگرت لـــە کەسانە نزیکبوو دڵیان لابدا لـەچونەدەرەوە لـەگەڵ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾. وەرگرتنــی پەشـیمان بونەوە لـەوان بۆ ئەوە بو خوا پلــەیان بـەرز بکاتــەوە. ئـەگینا نیــازی خراپـە و نـەکردنی بەگوناە نانوسریَ. بەڕاستی خوا بۆ ئەو کەسانە زۆر بەبەزەیی و نەرمــە، میهرەبانـە بۆیـان لـەبەر ئەوەی ئەزانیَ ڕاستی و چاکە لـەوانەوە دەرئەکەویَ لـەمەو دوواو، نیازیان پوختەیە، ئەو شتە بەدڵیانا هاتوە ڕۆیشتوەو نایەتەوە بەدڵیانا.

لـەئایەتی (١٠٦) ی ئەم سورەتەدا خوا فەرموی:تاقمیَ لـەوانە دوواکەوتوون پاشەڕۆژو بەسەر هاتیان دووا ئەخریَ بۆ فەرماندانی خوا یا سزایان ئەدا یا پەشیمان بونەوەیان لیَ وەر ئەگریَ. ئەو تاقمە ســیَ کەسـبون: کـەعبی کـوڕی مـالیك هۆنـراوە بێـژی بـەناوبانگ. مەرارەی کوڕی ڕەبیع. هیلالی کوڕی ئومەیەی ئەلواقیفی.

هەرسیَ کەسەکەیان لـەدانیشتوانی مەدینە بون لـەخزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ نەچوبون بۆ جەنگی تەبوك لـەبەر سستی و تەمەڵیان. نــەك لـەبـەر دووڕوی و بـیَ بـاوەڕی، باوەڕیـان بەخواو بەپێغەمەر توند بو، خواو پێغەمەریان بەڕاستی خــۆش ئەویســت هەرچـەند ئـەوان دوواکەوتبون لـەچونە دەرەوەدا. بەڵام ڕاستیان بۆ خۆیان هەڵبژارد لـە بەر ئایین پــاکبون و ئەترسان خوا ئابڕویان ببا، ددانیان بەگوناهی خۆیانانا، پێغەمەر گفتوگۆی ئەوانی وەرگرت و فەرموی: ڕاست ئەکەن. لـەگـەڵ ئەوەیشــدا لــەوان خۆشـبو فـەرمانی دا بـەباوەڕداران

گفتوگۆیان لەگەڵ نەکەن،ئەوانیش بۆیان دەرکەوت هیچ کەسێ پەیوەندیان پێوە ناکاو لەگەڵیان نادوێن،خۆیانیان لەبەر چاو کەوت،بەندیخانەیان لاخۆشتر بو،لەڕۆژێکا پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ناردی بۆلای ژنەکانیان و فەرمانی دا تێکەڵاویان نەکەن. پەنجا شەو بەسەر ئەو ڕوداوەدا ڕۆیشت، پەشیمان بونەوەیان بەباشی جێگەی خۆی گرت لەدڵیانا، بۆیە خوای مەزن پەشیمان بونەوەی لێ وەرگرتن فەرموی:

﴿ وَعَلَى الثَّلاثَةِ الَّذِينَ خَلِّفُوا ﴾ وە خوا پەشیمان بونەوەی وەرگرت و ڕژاندی بەسەر ئەو سێ کەسەی ئەو تۆ دوواکەوتبون لەجەنگ و نەچونە دەرەوە و فەرمانی خوا بۆیان دواخرا.

﴿ حَتى إذا ضاقَتْ عَلَيهِمْ الأَرضُ بِما رَحُبَتْ وَضاقَتْ عَلَيْهِمْ أنفُسُهُمْ ﴾ هەتا کاتێ تەنگ و تروسکبو لەسەریان زەوی بەو پانیەوە هەیبوو، دڵیان لەسەر خۆیان تەنکبو لەزۆری خەفەتاو بێکەس و بێهاوڕێ بێچارە، بەهیچ جۆرێ خۆشی نەچوە دڵیانەوە.

﴿ وَظنوُّ أنْ لامَلْجأَ مِنْ اللهِ إلا إلَيهِ ثُمَّ نابَ عَلَيْهِمْ لِيَتوبُوا ﴾ وە زانیان هیچ پەناگایە نیە برۆن بۆلای لەبەر خەشمی خوا لەوان مەگەر هەر بۆ لای خواو بەتەمای لێ بوردنی خوا لەڕوی بەزەییەوە، لەپاش ئەو هەموە ناخۆشی و بێچارەیی و دەردی سەریە توشیان بو لەماوەی ئەو پەناجا شەوەدا خوا کۆمەکی پێ کردن و ڕژاندی بەسەریانا پەشیمان بونەوە و میهرەبانی خۆی لەبەر ئەوەی کە پەشیمان ببنەوە و بەردەوام نەبن لەسەر گوناە. زۆر ڕاستە هەتا خوا یاریدەی ئادەمیزاد نەداو نەخشە نەکێشێ بۆ پەشیمان بونەوەیان پەشیمان بونەوە بۆ کەس نابێ و دەست نادا بۆیان.

﴿ إنَّ اللهَ هُوَ التَوابُ الرَّحيمُ ﴾ بەڕاستی خوا هەر ئەوە پەشیمان بونەوە وەرگری بەزۆری لەبەندەکانی خۆی، زۆر خاوەنی بەزەیی و میهرەبانیە بۆ هەمو بەندەکانی خۆی. کاتێ ئەو ئایەتانە هاتە خوارەوە لەدووای پەنجا شەو باوەڕداران بەو ئایەتە زۆر خۆش حاڵ بون و جەژنە پیرۆزەیان لەیەکتری ئەکرد و لەو سێ کەسەیش، ئەو سێ کەسانە بەجۆرێ خۆش حاڵبون نەئەهاتە ژمارە، کەعبی کوڕی مالیك ویستی لەخۆشی و لەموژدەدا

هەموو دارایی خۆی ببەخشێ.پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ فەرمانی پیٚ‌دا هەندێکی ببەخشێ هەندێکی بەجێ بێڵێ بۆ خۆیو خێزانەکەی و پەیمانی دا لەمەو دووا هەرگیز درۆ نەکا.

﴿ یا أیها الذین امنوا اتّقوا الله ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێوە لەخوا بترسن و خۆتان بپارێزن لەبێ فەرمانی خوا،مەگەڕێنەوە بۆ لای خراپە کردن دووای پەشیمان بونەوە.

﴿ وَکُنُوا مَعَ الّصادَقینَ ﴾ وە ئێوە لەگەڵ پیاو چاکان بن لەگفتوگۆ لەکردارتانا.وێنەی ئەو کەسانە بن لەڕاست گۆییدا. لەگەڵ دووڕوان و درۆزنانا مەبن و دوایان مەکەون.کاتێ خوای مەزن فەرمانی دا بەهاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ هاوڕیی ڕاست گۆیان بن لەهەمو جەنگێکا، دووپاتیشی ئەکاتەوەو قەدەغەی ئەکا نەچون لەگەڵ پێغەمەردا بۆ هەمو جەنگێ و ئەفەرموێ:

مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَٰلِحٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا۟

يَعْمَلُونَ ﴿١٢١﴾

﴿ ماكانَ لأَهْلِ الْمَدِينة وَمَنْ حَوْلَهُمْ مِنَ الأَعْرابِ أنْ يَتَخلَّفُوا عَنْ رَسُولِ اللهِ ﴾ نابێ و دروست نیە بۆ دانیشتوانی مەدینە و کەسێ لەدەورو پشتی ئەوانن لەعەرەبە دەشتەکیەکان کە دووا بکەون لەنێرراوی خوا لەهەمو فەرمانە ڕەواکاناو قەدەغە کراوەکانا بەتایبەتی لەجەنگ کردندا.

﴿ وَلا يَرْغَبُوا بِأَنفُسِهِمْ عَنْ نَفْسِهِ ﴾ وە بۆیان نیە ئازار بپارێزن لەخۆیان و نەیپارێزن لەپێغەمەر، شایان نیە بۆیان خۆیان لەخۆشیدا بژین و پێغەمەرلەناخۆشیدا یانێ دروست نیە بۆ ئەوان و بۆ هەمو باوەڕداران کە داوای سودی خۆیان بکەن و لەشی خۆیان بپارێزن لەئازارو واز لەپێغەمەر بهێنن و نەی پارێزن،ئەو فەرماندانە دەربارەی پێغەمەر پێویستێکە خوا پێویستی کردوە بۆ پاراستنی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ لەو شتانە خوا داوای کردوە لەباوەڕداران کە پاراستنی پێغەمەر ئەبێتە هۆی ڕانموییان و دەرچونیان لەتاریکی بێباوەڕیەوە بۆ لای ڕوناکی باوەڕهێنان. بەکورتی نابێ خۆیانیان لەپێغەمەر خۆشتر بوێ.

ئەگێڕنەوە ئەبو خەیسەمەی هاوڕێی پێغەمەر گەیشتە نێو باخەکەی خۆی و ژنێکی زۆر جوانی هەبو ژێرەخەری بۆ ڕاخست لە سێبەرداو خورماو ئاوی ساردی بۆ هێناو نزیکی کردنەوە لەئەبو خەیسەمەوە، ووتی: سێبەری چڕو خورمای تازەو ئاوی ساردو ژنی جوان و پێغەمەریش لە ژێر گەرمای خۆرو بای گەرمدا بێ ئەوانە هەمویان چاك نین.هەڵساو سواری هوشترەکەی خۆی بو شمشێرو تیرەکەی هەڵگرت بەتیژی ڕۆیشت بەنێو تۆزدا. پێغەمەر فەرموی: ئەبو خەیسەمەیە. بەڵێ: ئەوە، پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ زۆر خۆش حاڵ بوو داوای لێخۆشبونی بۆ کرد.

پوختەو کورتەی ئەو ڕستانە ئەمەیە:یانێ پێویستە لەسەر هەمو موسڵمانانێ یاریدەی کردەوەی ڕاستی بداو خەبات بکەن لەدژی کاری پوچ و خراپ. سودی تایبەتی خۆیان

کاریان تیٚ نەکاو واز لەئایین بـهیٚنن و واز لەپیٚغەمـەر بـهیٚنن بـەدرۆو بەدەلەسـە ویٚنـەی دوورڕوەکانی سەردەمی پیٚغەمەر ﴿ ﷺ﴾ کەواتـە باسـکردنی دانیشـتوانی مەدینـەو دەورو پشتی لەبەر ئەوەیە نزیکبون لەڕوداوی تەبوك و باسەکە باسی ئەوانە.

﴿ ذٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لايُصِيبُهُم ظَمأٌ وَّلا نَصَـبٌ وَّلا مَخْمَصَـةٌ فـى سَبيلِ اللهِ ﴾ ئـەو قەدەغـە کردنـەی دوواکـەوتن و نـەچون بـۆ جـەنگی تـەبوك لـەدژی خراپـەکاران بـۆ ئـەوەبو کەبەڕاستی ئەوان لەگەڵ پیٚغەمەر بن توشی ئەوان نابیٚ تنویٚتی و ئازار و برسیٚتی لەڕیٚگـەی خوادا.

﴿ وَلايَطَئُونَ مَوْطِئاً يَغيظُ بِهِمُ الْكُفارُ وَلايَنالُونَ مِنْ عَدو نَّيْلاً ﴾ وە ئەوان دانـانیٚن پیٚیـان بە جیٚگەیەکدا تورەبکا بەهۆی ئەو پیٚ دانانەی ئەوان بیٚ باوەڕان و ئازاریان ئـەداو ڕقیـان ئەجولیٚ و، توشی ئەوان نابیٚ لە دوژمنەوە هیچ شتیٚ لەکوشتن و دیل کردن و برینـداری و لەناوچونی دارایيان و هەرشتیٚ توشی خەفەتیان بکا بەو بۆنەوە ڕق جولاٚنی بیٚ باوەڕانی تیٚدا، بیٚ،ئیتر ئەو ئازارە کەمبیٚ یا زۆر ئەوانە هەمویان بەفیڕۆ ناچن و بیٚ پاداشت نابن.

﴿ إلاّ ماكُتِبَ بِه لَهُمْ عمَلٌ صالِحُ ﴾ مـەگر ئەنوسـریٚ و پیٚویسـت ئـەکریٚ بـۆ ئـەوان بەهۆی ئەو کارانەیانەوە پاداشتی کردەوەیەکی چاك و دەستیان ئەکـەویٚ لەپاشـەڕۆژدا و لەجیهاندا بەسەربەرزی ئەژین .

﴿ إنَّ اللهَ لايُضيعُ أَجْرَ الْمُحسِنينَ ﴾ بەڕاستی خوا بەفیڕۆ نادا پاداشتی چاکەکاران لـە ڕۆژی دووایدا بەو بۆنەوە جەنگیان کردوە لەگەڵ پیٚغەمەر ﴿ ﷺ﴾ .

بۆ زانین: ئەبیٚ بزانین ئازار دەرترین و گرانترین شت بۆ ئادەمیزاد ئەمەیە: **دوژمن زەوی** و نیشتمانیان داگیر بکەن، ئیتر ئەو دوژمنە بیٚباوەڕبن یا موسڵمان مەگەر لای یەکیٚ گران نـەبیٚ بـەکریٚ گـیراوی دوژمنبـیٚ و خـاوەنی ئـایین و نـاموس نـەبن و بـیٚ ویـژدان و خۆفرۆشبن،وێنەی کوردان نیشتمان داگـیراوو دەربـەدەر کـراو، خۆفرۆشـانیان یـاریدەی دوژمنیان ئەدەن و بەپارەیەکی کەمی دوژمن گوندو شارەکانیان ئەڕوخیٚنن.

ئیسلام هەرگیز لای ڕەوا نیە و پەسەند نیە نیشتمانی جگەی خۆی داگیر بکا بەجگەی ئەم دووهۆیانە:

١-مەگەر بۆ ئەوەی زیانێ توشی نیشتمانی جگەی خۆیان بوبێ و موسڵمانان بیانەوێ ئەو ئازارە نەیەڵن، وەك ئەوەی ئاگر بەربوبێتە خانوی یەکێ لەو کاتەدا بۆ لابردنی ئەو زیانە دروستە بچنە نێو خانوی‌یەکی تر بۆ کوژانەدنەوەی ئەو ئاگرە لە خانوی دراوسێکەیا، وێنەی ئەوەی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ پەلاماری ڕۆمەکانی دا لەکاتێکا ویستیان مەدینە داگیر بکەن و ئیسلام بنە بڕ بکەن.

٢-بۆ هێزێکی دادپەروەر هەیە بچێ بەهاواری دانیشتوانی هەرێمێ بۆ ڕاونانی داگیر کەران و سەرکوت کردنی ستەمکاران و گەڕانەوەی ئاسایش بۆ ستەم لێ کراوان.

﴿ وَلا يُنفِقُونَ نَفَقه صَغيرةً وَلا كَبيرةً وَلا يَقْطَعُونَ وادِيا ﴾ وە خەرج ناکەن لەڕێگەی خواداو نایبەخشن خەرجیەکی کەم وێنەی دەنکە خورمایە یاتورەکەیەو، نایبەخشن خەرجی گەورە وێنەی عوسمان لەو شتەی بەخشی بۆ هەڵسوڕاندنی جەنگی تەبوك و، نای بڕن و نایدەنە دووا،هیچ شیوبێ و ماندوبون و ناخۆشیە توشیان بێ.

﴿ إلاّ كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمْ الله أحْسَنَ ماكانُوا يعْمَلُونَ ﴾ مەگەر خوا نوسیوێتی بۆ ئەو کەسانە لەبەر ئەوەی پاداشتیان بداتەوە بە شیرینترین پاداشتی شتێ ئەیکەن لەجیهانداو ئەیبەخشن .

کاتێ ئایەتی (١٢٠-١٢١) ی ئەم سورەتە هاتنە خوارەوە هۆزو دێهاتی موسڵمانا ووتیان: سوێندمان بەخودا لەدووای ئەم ڕۆژە لەهیچ جەنگێ دوواناکەوین و دابارین بەسەر مەدینەداو بۆ ئەو مەیەستە. خوای گەورە فەرموی:

وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَـٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾

﴿ وَماكانَ الْمؤُمنُونَ لِينفَرِدُ واكافَةَ ﴾ وە نابێ و شایستە نیە بۆ باوەڕداران کە بڕۆنە دەرەوە هەمویان بۆ جەنگ ،چونکە هۆی ژیان و گوزەرانیان ئەکەوێتە تەنگانەوەو کەسنابێ خێزانەکانیان بۆ بەخێو بکەن.بەڵکو چونە دەرەوە ئەگۆڕێ هەر جارێ بەگوێرەی پێویست ،وا ئەبێ پێویستە بچنە دەرەوەو وایش ئەبێ پێویستە هەندێ لەموسڵمانان بچنە درەوە،ئەو پێویستیانە ئەگەڕێنەوە بۆ فەرماندانی پێغەمەر (د.خ) لەدوای پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بۆلای بیرو بۆچونی کاربەدەستانی نیاز پاك و دادپەروەر بۆ موسڵمانان.

﴿ فَلَو لانَفر مِنْ كُلِ فَرقة مِنهُمْ طائِفة لِتَفَقَّهُوا فى الّدينِ ﴾ دووایی بۆ نەچنە دەرەوە لەهەمو کۆمەڵێکی زۆر لەباوەڕدران تاقمێکی کەم و ئەوانی تریان نەچنە دەرەوە لەجێگەی خۆیان هەتا ئەو تاقمە کەمە بگەڕێن بەشوێن زانست و زانیندا، ئازاری خۆیان بدەن بۆ فێربونی پێویستیەکانی ئایین و کارە ڕەواکان. وەك فێربونی زانیاری ئایین و فێربونی نەخشەی سەربازی و ڕامیاری و ئابوری و بەرگری و کارە ڕەواکان و قەدەغەکراوەکان لەیك جوێ بکەنوە.

﴿ وَلِينْذِرُ واقَوْمَهُمْ إذا رَجَعُوا إلَيْهُمْ لعَلَّهُمْ يَحذِرُونَ ﴾ وە لەبەر ئەوەی تاقم و خزمەکانی خۆیان بترسێنن لەسزای خوا لەسەر لادانیان لەفەرمانی خوا هەرکاتێ هاتنەوە بۆ لایان، بۆ ئەوە بترسن لەخواو کاری چاك بکەن. ئەوەی چاکەو ئەوەی خراپە بیانزانن، خزمەکانیان پێویستە گوێ بگرن لەڕێگە پیشان دەریان و پەیڕەویان بکەن.

هەندێ لەزانایان و بگرە زۆر بەیان مانای ئەو ئایەتانەیان بەم جۆرە کردوە: هەتا ئەو تاقمەیان ماونەتەوە فێری خوێندن بن لەخزمەت پێغەمەر و زاناکاندا فەرمانەکانی خوا فێر

بن لەهەمو ڕویەکەوەو ئەو تاقمە فێری ئەوانە بکەن چونەتە دەرەوە بۆ جەنگ ئەو زانست و زانیاریە فێری بوون لەخزمەتپێغەمەرو زاناکانەوەو بیشان ترسێنن لەسزای خوا کاتێ گەڕانەوە لەجەنگ. یانێ بن بە دوو بەشەوە: بەشێکیان بچن بۆ جەنگ و بەشتێ تریان شارەزای سنورو دەستور بن لەمەدینە.ئەو ئایەتە پیرۆزە شارەزای ئەوەمان ئەکا لەم سەردەمەی ئێمەیشدا پێویستە لەسەر موسڵمانان کۆمەڵێکیان تەرخان بکەن بۆ فێربونی هەموو زانستەکان لەهەر جێگەیە فێر بکرێن، ئیتر ئەو زانستیە دەستوری پەرستبێ یا یاسایی یا فەرمودەی خواو پێغەمەر بێ، یا فێربونی زانستی پزیشکی و ئەندازیاری یا دۆزینەوەو دەرهێنانی پیت و فەڕی نێو زەوی و سەرزەوی و سروشتزانی و شتی تر،یادروست کردبێ چەك و کەشتی و زانستی کارەبایی، هەتا دێ کاتێ خوای مەزن فەرمانی دا بە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کەیەکەم جار خزمەکانی بترسێنێ نزیکتر بۆنزیك، فەرمانیشی دا بەپێغەمەر جەنگ بکا لەگەڵ نەتەوەکانی تردا پێ بەپێ و نزیك بۆ دور. ئەوەبو پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ یەکەم جار جەنگی کرد لەگەڵ خزمەکانی خۆی،لەپاشا عەرەبەکان، دووای ئەوان خاوەن نامەکان وەك بەنو قورەیزەو بەنینەزیرو خەیبەرو فەدەك، دووبارە گاورەکانی ڕۆم وشام، دووای پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ هاوڕێکانی پاش ماوەیە شام و عێراق و جێگەکانی تریان داگیر کرد، بۆجێبەجێکردنی ئەو کارانە خوا فەرموی:

﴿ وَقَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُمْ مِنْ الْكُفَّارِ ﴾ وە ئێوەی موسڵمان جەنگ بکەن لەگەڵ کەسانێکی ئەوتۆ لەبێ باوەڕان نزیکن لەئێوە نزیك لەدووای نزیك. کەواتە پێویستە لەسەر هەمو لایەك لەموسڵمانان کاتێ ترسیان پەیدا کرد لەدوژمنی خۆیان خۆیانیان بۆ ئامادە بکەن و پەلاماریان بدەن وتەفرو تونایان بکەن بەگوێرەی توانا. بەو مەرجەی پەیمانی ئاشتی نەبەسترابێ لەگەڵ ئەو بێ باوەڕانە.

﴿ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ ﴾ وە بۆ ئەوەی ئەو بێ باوەڕانە دەستیان بکەوێ و بزانن لەئێوەوە سەختی و ئازایی، بۆیان دەرکەوێ ئێوە خۆتانتان ئامادە کردوە بۆ بەرگری و، ئێوە بزانن بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەو کەسانەیە خۆ پارێزن لەبێ فەرمانی خوا،لەگەڵ کەسانێکە باوەڕیان پاکەو نیازیان خاوێنە لەجەنگ کردندا،ئەوەی لەتوانایانە لەچەك و کەرەسەو تفاق ئامادەیان کردوە، خوای گەورەیش یارمەتیان ئەدا.

تەفسیری زمناکۆیی

لەپاشا خوای مەزن باسی هەندێ تر لەپاش ماوەی کردەوەی خراپی تری دووڕووانە ئەکاو ئەفەرموێ:

وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾ أَوَلَا يَرَوۡنَ أَنَّهُمۡ يُفۡتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٖ مَّرَّةً أَوۡ مَرَّتَيۡنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ نَّظَرَ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ هَلۡ يَرَىٰكُم مِّنۡ أَحَدٖ ثُمَّ ٱنصَرَفُواْۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ﴿١٢٧﴾

﴿ وَإذا ماأُنْزِلتْ سُورةٌ فَمِنهُمْ مَّنْ يَقُولُ أَيُّكمْ زادَتهُ هذِهِ إيماناً﴾ وە هەر کاتێ بنێررایەتە خوارەوە سورەتێ یا پارچەچە لەقورئان دوابی هەندێ لەو دووڕووانە کەسی وا هەیە بەگاڵتە کردنەوە بەو سورەتەی قورئان بەموسڵمانان ئەڵێ: چ کەسێ لەئێوە ئەو پارچە سورەتە باوەڕهێنانی زۆر کردوە بە پێغەمەر و بترسن لەو شتەی ئەیڵێ. خوای مەزن وولامیان ئەداتەوە و ئەفەرموێ :

﴿ فَأماَّ الَّذِينَ أمَنوا فرادَتْهُمْ إماناً وَّهُمْ يَسْتَبْشرُونَ ﴾ دووایی ئەگەر کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێنابێ ئەو سورەتە بڕواو ترس و بەردەوامبون لەسەر باوەڕ بۆ ئەوان زۆر ئەکا، زانستیان زۆر ئەبێ بەبیر کردنەوەیان لەمانای بێ وێنەی مانای ئەو سورەتەوەو، ئەوان موژدە ئەدەن بەیەکتری بەزۆر بونی باوەڕیان و بەبەرزبونەوەی پلەو پایەیان و شارەزای ڕێگەی ڕاستیان زۆرتر ئەکاو گومانیان نابێ کە خوا بەهەشتیان ئەداتێ.

﴿ وَأماَّ الَّذِينَ فی قُلُوبِهُمْ مَرَضُ فَرادَتْهُمْ رجْسَاً إلی رجسِهِمْ ﴾ وە ئەگەر کەسانێکی ئەوتۆ نەخۆشی دووڕوی وگومان لەدڵیانایەو ڕقیان لەئیسلامە، دوایی ئەو پارچە قورئانە بۆ ئەو دڵ نەخۆشانە زۆرتر ئەکا گومان و خراپە بۆلای گومان و خراپە بۆیان، لەدووڕویی تازەوە بۆلای گومان وبێباوەڕی و دووڕویە کۆنەکانیان.

﴿ وَماتُوا وَهُمْ کافِرُونَ ﴾ وە ئەو دووڕوانە ئەمرن و ئەوان بێ باوەڕن و خراپەکەیان جێگەی خۆی گرتوە لەدڵیانا. بەوێنەی کرمی ئەوریشم هەمو کاتێ پارچەیە زۆرتر لەخۆیەوە بپێچێتەوە دورتر ئەبێ لەدەرچون هەتا وای لێدێ لەتاو ئەچێ، ئەو دووڕوانەیش خراپەی زۆرتر ئەکەن هەتا ئەیان مرێنێ بەبێ باوڕی.

﴿ أولا يَرَوْنَ أنَّهُمْ يفْتَنُونَ فی کُلِ عامٍ مَرَّةً أوْ مَّرتَين ﴾ ئایا ئەو دووڕوانە نازانن و نابینن کە بەڕاستی تاقی ئەکرێنەوە بەنەخۆشی و بانگ کردنیان بۆلای جەنگ لەساڵێکا جارێ یادووجار.

﴿ ثُمَّ لايَتُوبُونَ وَلاهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾ لەپاشا ئەو دووڕوانە پەشیمان نابنەوە لەدووڕویی خۆیان و، ئەوان ئامۆژگاری وەرناگرن و ئابڕویان ئەچێ لای دانیشتوان، هەواو هەوەس دڵیان کوێر ئەکا.

دووای ئەوەی خوای مەزن ڕونی کردەوە ئەو شتە پیسانەی لەو دووڕوانەوە پەیدا ئەبێ لەو گفتوگۆیەو گاڵتە پێ کردنیان کاتێ پارچەیە لەقورئان بنێررایەتە خوارەوە، ڕونیشی ئەکاتەوە ئەو شتانەیش لەوانەیە پەیدا ئەبێ بەکردەوەکانیان و ئەفەرموێ:

﴿ وَإذا ماأُنْزِلَتْ سُورةٌ نَّظَرَ بَعْضَهُمْ إلى بعْضٍ هَلْ يَراكُمْ مِنْ أحَدٍ ﴾ وە هەر کاتێ بنێربێتە خوارەوە پارچەیە لەقورئان تەماشایان ئەکرد هەندێکیان بۆلای هەندێ تریان و چاویان لەیەك دائەگرت و پێ‌ئەکەنین و گاڵتەیان ئەکرد بەو پارچە قورئانەو ئەیان ووت: ئایا یەکێ لەموسڵمانان ئێوە ئەبینن ئەگەر بچینە دەرەوە، نەوەك نهێنیمان دەربکەوێ ئابڕویان بچێ ، ئەگەر دووایی ئەگەر بیانزانیبایە یەکێ لە موسڵمانان ئەیان بینێ دائەنیشت لەسەر شێوەی خراپەی دڵی پیسیانەوە.

﴿ ثُمَ انْصَرَفُوا صَرَفَ اللهُ قُلُوبَهُمْ ﴾ لەپاشا ئەو بێ باوەڕانە هەڵسان لەخزمەت پێغەمەرو ئەچون بەلای کاری خۆیانەوە بێ ئاگا بون لەتاوانی خوا وەك هیچ شتێکی خراپیان نەکردبێ،خوا دڵی ئەوانی وەرگێڕابو لەئاستی ڕاستی لە دووای ئەو بەڵگانە بۆیانی دانابو،دووایی باوەڕیان نەهێنا کەوواتە خۆیان بەرپرسیاری ئەو وەرگەڕانەن ڕاستەو خۆ.

﴿ بأنَّهُمْ قَوْمٌ لايَفْقَهُونَ ﴾ بەو هۆیەوە بەڕاستی ئەو دووڕوداوانە تاقمێکن نەزانن و بیر لە فەرمودەکانی خوا ناکەنەوە بۆ زانینی ڕێگەی ڕاست.

لەپاشا خوای مەزن ڕوی فەرمودەی خۆی ئەکا بۆلای هەمو ئادەمیزادو بەتوندی سوێند ئەخواو ئەفەرموێ :

لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾

﴿ لَقَدْ جاءَ كُمْ رَسُولٌ مِنْ اَنفُسكُمْ ﴾ بەڕاستی هاتوە بۆلای ئێوەی ئادەمیزاد ئەگەر بتانەویٚ بگەڕێن بە داواى ڕاستیدا و ڕێگەی ڕاست بناسن فروستادەیە لەڕەگەزی خۆتان و لەنەوەی ئادەم،لەبەڕێزترین هۆزتان هەتا بیٚ بەهۆی ڕزگاریتان لەنەزانین ووشکیتانەوە بۆلای زانین و دڵ نەرمی.

﴿ عَزيزٌ عَلَيْهِ ما عَنتُّمْ ﴾ گران و ناخۆشە لەسەری شتیٚ تووشی ئێوە بیٚ لەئازار بەهۆی گوناهتانەوەو لەڕێگەی ڕاست لادانتان لەهەمو ئادەمیزادیٚ بەبیٚ جیاوازی ،لایشی گرانە بونەوەرانی تریش توشی ئازارو خراپە بن.

﴿ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ ﴾ زۆر بەپەرۆشەوە کۆڵ نەدەرە لەسەر ئێوەی ئادەمیزاد بەگشتی بۆ دۆزینەوەی ئاسایش و بەختیاری و خۆشیتان لەهەمو کارێکتانا لەئەمڕۆو لەدوا ڕۆژدا،بۆ ئەوەی ئێوە باوەڕ بەخودا بهێنن هەتا توشی ئازاری پاشە ڕۆژ نەبن.

﴿ بالْمؤُمْنينَ رَؤُوف رَّحيمٌ ﴾ زۆر بەبەزەیی و میهرەبانە بە باوەڕداران،بەخشندەیی زۆرە بۆیان هەمو کاتیٚ لەهەوڵدایە کە ئازارو ناخۆشی توشیان نەبیٚ، لەهەوڵدایە بۆ بەرگری کردن لەدەست درێژلای بۆسەریان و ئاواتی خۆشی ئەوانە.

پێغەمەری خوا هەرچەندە خاوەنی بەزەیی و بەخشش بۆهەمو ئادەمیزادو هەمو بونەوەران. بەلاّم هەرکەسیٚ بەناڕەوا پەلاماری باوەڕداران بداو بیەویٚ یاری بکا بەبونیان و ناموسیان و نیشتمانیان و دارایی ئەوان،زۆر بەتوندی و بەتیژی ڕێگەیان لیٚ ئەگریٚ،بۆ ناڕەوایی بیٚباوەڕی و ستەم و داگیرکردن لەئادەمیزاد بەتایبەتی لەباوەڕدراران نەرم و نیان نیە لەبەر ئەوەی ئایینی ئیسلام ئایینی مرۆڤایەتیە، بەبیٚ ئەو ئایینە مافی ئادەمیزاد ناپارێزریٚ،پێویستە لەسەر باوەڕدراران بێتە وولاّم و ئایینی ئیسلام بچەسپێنیٚ.

﴿ فَاِنْ تَوَلوا ﴾ دووایی ئەگەر پشتیان کردە ڕاستی و پەیڕەوی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾، باوەڕیان نەهێناو هەوڵی جەنگ و دووڕویی و پڕوپاگەندە بلاّو کردنیاندا لەدژی موسڵمانان.

﴿ فَقُلْ حَسْبَى اللّهُ لااِلَه اِلاّ هُوَ ﴾ دووایی تۆ بڵیٚ: من خوام بەسەو سەرم ئەخاو زاڵم ئەکا بەسەر بیٚباوەڕاندا، هیچ کەسیٚ نیە پەرستنی ڕاستی بۆ بکریٚ مەگەر هەر خوای تاك و تەنها.

﴿ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ﴾ هەر لەسەر خوا من پشت ئەبەستم، هەمو کارێکم هەواڵــەی خـوا ئەکەم، هەر خوایە توانای بەسەر هەمو شتێکا هەیە.

﴿ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴾ وە هەر خوایە پەروەردگارو خاوەنی کورســی و تـەختی زۆر گـەورەو خـاوەنی هـەمو بونـەوەران.یـانیٚ بونـەوەران زۆر گـەورەترو فـراوان تــرە لەئاسمانەکان و زەوی و جگەی ئەوانیش.(عەرش) هێمایە لــەتوانای بـیٚ وێنـەی خـوا بـۆ هەمو بونەوەران.

****************************************

******************************

*****************

لەمەکەی ڕێزدار هاتوەتە خوارەوە، جگە لەئایەتی (٤٠-٩٤-٩٦) ژمارەی ئایەتەکانی (١٠٩) ئایەتن.

کاتێ خوای مەزن بەسورەتێ کۆتایی هێنا بەباسکردنی پێغەمەر﴿ ﷺ﴾، دەست بەباسی توانای خۆی ئەکا لەم سورەتەدا بەباسکردنی گەورەیی بێهاوتای خۆی و ئەو شتەیش ناردوویەتی بۆ سەر فروستادەی خۆی و ئەفەرموێ:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓر ۚ تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْحَكِيمِ ﴿١﴾ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَا إِلَىٰ رَجُلٍ مِنْهُمْ أَنْ أَنْذِرِ النَّاسَ وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِنْدَ رَبِّهِمْ ۗ قَالَ الْكَافِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَاحِرٌ مُبِينٌ ﴿٢﴾

( بسم الله الرحمن الرحيم )

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿ الرا ﴾ زانایان بیری زۆر جیاوازیان هەیە لەمانای ئەو پیتانەدا، لەسورەتەکانی پێشودا باسیان کراوە بەجۆرێ بچێتە مێشکەوەو جێگەی بروای زۆربەی زانایان بێ.

﴿ تِلْكَ اياتُ الْكِتابِ الْحَكيم ﴾ ئەو ئایەتانەی لەمەو پێش باسیان کراوە، ئەو ئایەتانەی ڕەوانە کراونەتە سەر موحەمەد ئایەتەکانی نامەیەکن پڕن لەزانست و مانایەکیان هەیە دورن لەتێك چوون.

بەپێی کات ماناکانیان ناگۆڕێن، پاکن و دورن لەدژایەتی یەکتری، لەسەر بنچینەیەکی بەهێز دانراون، دەست کاری و لەناو چون ڕویان تیّناکا، قەدەغە کەری هەمو جۆرە خراپەیەکن بیّباوەڕانی قوڕیش سەریان سوڕ ئەما کە خوا موحەمەد هەڵبژێریّ بۆ پێغەمەرایەتی لە جگەی ئەوان، ئەیان ووت: خوا کەسی دەست نەکەوتوە بیکا بەپێغەمەر جگەی هەتیوی ئەبو تالیب، وایان دانابو لەو دووشارە گەورەی مەکەو تایف ئەبوایە پیاوی گەورە بکرایە بە پێغەمەر، خوای مەزن وولاّمیان ئەداتەوەو ئەفەرمویّ .

﴿ أكانَ للِناسِ عَجَبا أنْ أوحَينا إلى رَجُلٍ مِنْهُمْ ﴾ ئایا جێگەی سەرسوڕمانە بۆ ئادەمیزادە بیّ باوەڕەکان کە ئێمە سروش بنێرین بۆلای پیاو یّ لەخۆیان، ئەو پیاوەیش بریتی بیّ لەموحەمەد خوا هەڵی بژێریّ، خۆیان ئەیناسن بەبنەماڵەو ڕەگەزەوە، بۆیان ڕونە ڕاست گۆو داوێن پاکە.

لەپاشا خوا ڕونی ئەکاتەوە هۆی ڕەوانە کردنی پێغەمەرو ئەو شتەی ئەتۆ بۆی هاتوەتە خوارەوە ڕای بگەیەنیّ بەئادەمیزاد و ئەفەرمویّ ئێمە سروشمان ناردوە.

﴿ أنْ أنذِرِ الْناسَ ﴾ کە بەڕاستی تۆ ئادەمیزاد بترسێنی و هەواڵ بدەی بەوانەیان دژی فەرمانی خوان و گوناهبارن بەسزادانیان لەلاین خوای گەورەوە.

﴿ وَبَشِّرِ الَّذِينَ أمَنُوا أنْ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِنْدَ رَبِّهِم ﴾ وە تۆ موژدەیش بدەی بەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و فەرمانبەرداری خوان و پەرستنی بۆ ئەکەن بەپاداشتێکی زۆر گەورە لەخزمەت پەروەردگاری خۆیانا بدریّ بەوان پێشکەوتن و پاداشتی شیرین و پلەو پایەی بەرز لەخزمەت پەروەردگاری خۆیانا بەهۆی کردەوەی پێشینی خۆیانەوە.

﴿ قَالَ الْكافِرُونَ إنَّ هذا الساحِرٌ مُبِينٌ ﴾ بیّ باوەڕان ئەیان ووت دووای ئەوەی پێغەمەر هات بۆ لایان بەو کارە یەك خەرانەوە: بەڕاستی ئەو پیاوە جادوو گەرێکی ئاشکرایە، کاتیّ ئەو شتانەیان ئەووت بیّ دەستەلاّتی و لاوازی خۆیانیان بۆ دەرکەوت و هیچیان بۆ نەماوەتەوە جگەی لەوە درۆ هەڵبەستن، خوای مەزن ڕوی خۆی ئەکا بۆلای

ئەو کەسانە سەریان سورِ ئەما لەوەی کە خوا بنێریٚ سروش بۆ پیاویٚ لەوان و بیانترسێنیٚ و موژدەیان بداتیٚ،ڕونیشی ئەکاتەوە خوایە توانایە بەگوێرەی ئارەزوی خۆی بونەوەران هەڵئەسوڕێنیٚ و سروش ئەنێریٚ بۆ لای کەسیٚ شایستە بیٚ و ئەفەرمویٚ:

إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا إِنَّهُۥ يَبْدَؤُا ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلْقِسْطِ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ ﴿٤﴾

﴿ إنَّ رَبَّكُمُ الله الَّذِی خَلَقَ السَّماواتِ وَالأَرضَ فی سِتَة أیامٍ ﴾ بەڕاستی پەروەردگار و هێنەرەدی ئێوەو خاوەن و هەڵسوڕێنەرتان و ئەو کەسەی پێویستە ئێوە بیپەرستن خوایەکی ئەوتۆیە دروستی کردوە ئاسمانەکان و زەوی بەو قەوارە گەورەو هەیانە لەئەندازەی ماوەی شەش ڕۆژی ئەمڕۆدا، ڕۆژی خوا وەك ڕۆژی ئێمە نیە، چونکە پێش دروستبونی بونەوەران ڕۆژ کەلە سوڕانی زەوی بەدەوری خۆردا پەیدا ئەبیٚ لەوکاتەدا نەبوە. مانای وانیە خوا توانای دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی بەیەك جار نیە، چونکە خوا ئەتوانیٚ بفەرمویٚ بن، بەماوەی کەمتر لەچاو نوقانیٚ دروست ئەبن بەڵام لەبەر شتێکی شایستە و

شایان بەچەند جارێ دروستی کردوون و ئێمە نایزانین، بۆ فێر کردنی ئێمە کە کارو کردەوەمان هێدی و خاوەن پشو بن.

﴿ ثُمَّ أسْتَوى الْعَرْشِ ﴾ لەپاش دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی خوا تواناو دەستەلاتی خۆی داناو لەسەری عەرش. یانێ بەسەر هەمو بونەوەران و دروست کراوانی خۆی. مانای ئەو رِستەیە هێمایە بۆلای ئەوەی چۆن ئەبێژرێ پاشا لەسەر کورسی خۆی دانیشت بۆ هەڵسوراندنی کاروباری نیشتمان. ئەگینا خوای مەزن پاك و خاوێنە لەوەی لەجێگەیە دانیشێ.مانای ئەو ئایەتە لەئایەتی (٥٤) ی ئەلعەعرافدا تێپەڕیوە.

﴿ يَدُ بِّرِ ٱلاٴَمْرَ ﴾ خوا ئەسازێنێ و رێك ئەخا ئیشی هەمو بونەوەران بەگوێرەی دیاری کردن و دانانی هەمو کارێ لەجێگەی شیاوی خۆیا، هەمو شتێ ساز ئەکا لەسەر پلەو پایەی شیاوی خۆی بت پەرستان ئەیان ووت: بتەکانمان تکامان بۆ ئەکەن لای خوا، دوایی خوای مەزن رِونی ئەکاتەوە هیچ شتێ نیە تکاکاربێ مەگەر کاتێ خوا دەستوری پێ بدا. ئەو بتانە لەهیچ شتێ ناگەن چۆن ئەبن بەتکاکار؟ زۆر رِون و ئاشکرایە فریشتەکان و پێغەمەران ناتوانن ببنە تکاکار بەبێ دەستوری خوا، بۆ رِون کردنەوەی ئەو شتانە خوا ئەفەرموێ:

﴿ مامِنْ شَفيعٍ إلاّ مِنْ بَعْدِ إذْنهِ ﴾ هیچ تکاکارێ نیە لەرِۆژی دوواییدا مەگەر لەپاش دەستوری خوا،ئەو رِستەیە گفتوگۆی بت پەرستان زێراو زۆر ئەکاو ئەی رِوخێنێ.

﴿ ذلِكُمْ اللهُ رَبُّكُمْ فاعْبُدُوهُ أفَلا تَذكَّرُونَ ﴾ ئەو کەسەی خاوەنی ئەو جۆرە شتانە بێ لەدروستکردن و بەرِێوە بردنی هەمو بونەوەران پەروەردگاری ئێوەیە بەتەنها نەك جگەی ئەو، چ کەسێکە ئەو توانایەی ببێ جگەی خوا. کەواتە ئێوە ئەو خوایە بپەرستن بەتەنهاو بتەکان مەپەرستن کە لەهیچ شتێ ناگەن. ئایا بۆ ئێوە ئامۆژگاری وەرناگرن و بیرناکەنەوە چ کەسێکە شایانی پەرستنبێ ؟ هەتا تێبگەن هەر خوایە تەنها شایستەیە بۆ فەرمانداری و پەرستن.

﴿ إلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً وَّعْدَ اللهِ حَقاً إنهُ يُبْدِءُ الْخلْقَ ثُمُّ يَعيدُهُ ﴾ هەر بۆ لای خوایە گەڕانەوەی ئێوەی ئادەمیزاد دووای مردن و زیندو بونەوەتان بەگشتی.کەواتە خۆتان ئامادە بکەن بۆ پرسیار و وولاّم خوا بەلّێنی داوە بەو گەڕانەوەیە بەبەلّێنێکی ڕاست و بێگومان. بەڕاستی خوا یەکەم جار ئەیان هێنێتە بونەوە دروست کراوانی خۆی لەنەبونەوە بۆلای بون بەو جۆرە سەرسوڕینەرانە ئێوە ئەیان بینن لەپاشا دووای مردن ئەتان هێنێتەوە و زیندوتان ئەکاتەوە بۆ جاری دووهەم. مەبەست لەدروست کردن و مردن و زیندوبونەوەیان وەرگرتنی پاداشت و تۆلّەیە، وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ لِيَجْزِی الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّلِحاتِ بالْقسْطِ ﴾ لەبەر ئەوەی خوا پاداشتی کەسانێکی ئەوتۆ بداتەوە باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوە بەهۆی دادپەروەری خۆیەوە، بەشی خۆیان وەرگرن بەبێ کەم و کوڕی

﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوْ لَهُمْ شَرابٌ حَمِيمٌ وَّعَذابٌ أليمٌ بِما كانُوا يَكفُرُونَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بۆیان هەیە ئاوێکی زۆر گەرم کە ڕیخۆلّەیان پارچەپارچە ئەکاو، بۆیشیان هەیە سزایەکی خاوەن ئازار و جگەریان ئەڕزێنێ و لەشیان ئەتوێنێتەوە بەهۆی شتێ باوەڕی پێ نابەرن لەخواو لەپێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ .

خوای مەزن تواناو ئەقلّی داوە بە ئادەمیزاد بۆ کردنی هەرشتێ خۆیان ئارەزویان هەبێ لەچاکەو لەخراپە بەگوێرەی هەلّبژاردەی خۆیان، فەرمانی داوە بەچاکە کردن و قەدەغەی کردوە خراپە کردن. دوایی هەیانە فەرمانبەرداری خوایان کردوەو هەیانە دژی فەرمانی خوا وەستاون. لەپاشا هەردوولایان ئەمرن و بەرەو گۆڕی خۆیان ئەنێررێن بەبێ ئەوەی پاداشتی چاکەکاران درابێتەوە سزای گونهباران درابێتەوە لەجیهاندا. بەلّکو زۆر کەس لە گوناهباران یاخی بوون و ستەمیان کردوە، کەسێ نەبوە پرسیاریان لێ بکا. کەواتە زیندو بونەوەو پرسیاری پاشەڕۆژ نەبێ مانای وایە ستەمکارو ستەم لێکراو، باوەڕدارو بە باوەڕ یەکسانن. بەلّکو بێ باوەڕ چاکترو بەڕێزتر بێ لای خودا لەباوەڕدار، خراپە کار بەڕێزتر بێ لەو کەسەی لەڕێگەی خودا کوژرابێ. بێگومان ئەوانەیش دژی

دادپەروەری و توانای خودایە، خودای مەزن بەرزترو دورترە لەبێ دادی و بێ توانایی، دوایی بێگومان دوای زیندو بونەوەو پرسیارو وەلاّم هەیە و خودای مەزن پاداشتی ستەم لێکراوان ئەداتەوە بەبەهەشتی بەرین و پلەی بەرز، تۆلّەی زۆر سەخت لەستەمکار ئەسێنێ و ئەیانخاتە ناو دۆزەخ بەبێ گومان.

لەوانەیە هەندێ کەسی ستەم لێ کراو هاوار بکاو بپارێتەوە لەخودای مەزن،بلّێ:ئەی پەروەردگار: چ کاتێ تۆ ستەمکاران لەناو ئەبەی؟ هەرچەندە خاوەنی باوەڕە بەلاّم دلّی سوتاوە، وائەزانێ خودا لەناویان نابا، ئەو پەلەیەتی، خودای مەزن پەلەی نیە.

ئەبێ بزانین: ئەوکەسەیش بڕوای بەزیندو بونەوەو پرسیارو پاداشت و تۆلّەی پاشەڕۆژ نەبێ بەڕاستی بڕوای بەبونی خوا نیە بیەوێ یا نەیەوێ، ئیتر جێگەی سەرسوڕمان نیە بلّێ: ئەگەر خوا هەبوایە ستەمکاری بنە بڕ ئەکرد.

بۆ زانین: دروست کردنی بونەوەران و زیندوبونەوەیان دووای مردنیان یەکێکە لەگرێ کوێرەکانی زۆر گەورەی لای هەندێ لە ئادەمیزادە، هەندێکیان ئەلّێن: بونەوەران خۆیان لەخۆیانەوە دروست بوون بەبێ ئەوەی کەسێ دروستیان بکا، ئەو کەسانە وێنەی کەسێکن نوسراوێ ببینن، دوایی بلّێن: بەبێ نوسەر لەخۆیەوە نوسراوە، هەر لەبەرئەوەی نوسەرەکەی نابینێ. بەڕاستی ئەو کەسانە ئەبێ بزانن ئەو کسەی ئەم بونەوەرانەی دروست کردوە زۆر زۆر گەورەترە لەو کەسەی نەخشەی نوسراوەکەی کێشاوە بەسەر کاغەزدا کەچی نوسەرەکەی نابینرێ، ئەو کەسەی بونەوەرانی دروست کردوە مەرج نیە بەچاو ببینرێ ئەقلّ لەلایەترەوە بەجگەی بینینی چاو باوەڕ ئەهێنێ بەبونی خوا بەبێ گومان، وەك هەندێ لەئادەمیزاد باوەڕیان هێناوە بەبونی خواو باوەڕیشی هەیە بەبونی نوسەر بۆ ئەو کاغەزە.

لەپاشا خوای مەزن فێری بەلّگەیە ترمان ئەکا لەسەر یەکێتی خواو توانای دروست کردنی خۆی بۆ هەمو بونەوەران و ئەفەرموێ :

هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلشَّمْسَ
ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ
وَٱلْحِسَابَ ۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ
لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ إِنَّ فِى ٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ
ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَّقُونَ ﴿٦﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّوا۟
بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ
ٱلنَّارُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْ ۖ تَجْرِى مِن
تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٩﴾ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ
ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ۚ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ
رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾

﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِياءً ﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیە خۆری گێڕاوە بە پەخشدەری ڕوناکی بەجۆرێ ئەو ڕوناکیە هەڵئەقوڵێ لە خۆیەوە بێ ئەوەی لەشتێ ترەوە وەرگیرێ.

﴿ وَالْقَمَرَ نُوراً ﴾ و مانگی کردوه بـەڕوناکی دەر بـەهۆی پـرژەی خـۆرەوە، مـانگ خۆی لەخۆیا تاریکەو ڕونـاکی لـەخۆرەوە وەر ئـەگریٚ. مـانگ و هـەمو ئەسـتیٚرەکان و زەوی لەخۆر جیا بونەتەوە بەهۆی توانای خوای گەورە. هەندیٚ لەزانایان ئەڵین: (ضیاء- نور) هەردووکیان بەمانا یەکن -مەبەست لەو ئایەتە ئاگادار کردنەوەیـە لەسـەر یـەکیٚتی وتوانای خوا، سودی دروست کردنی خۆرو مانگ ئەو شتەیە خوا ئاماژەی بـۆ ئـەکا بـەم ڕستەیە کە ئەفەرمویٚ:

﴿ وَقَدَّرَهُ مَنازِلَ ﴾ وە خوا دیاری کردوە بۆ هـەر یەکـە لـەخۆرو لـەمانگ چـەندین جیٚگەیە بۆ سوڕ خواردنیان لەشویٚنیٚ تایبـەتی خۆیـان بـەجۆریٚکی نـەگۆڕاو بەشیٚوەیەکی تایبەتی بۆ سودی بونەوەران و گەشە کردنی ئەو شتانە لەسەر زەوین.

﴿ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِنِينَ وَالْحِساب ﴾ لەبەر ئەوەی ژمارەی دووازدە مانگەی سـاڵەکان و ژمارەی کاتەکانی مانگ و ڕۆژەکان بزانن لەمامەڵەو جیٚبـەجیٚ کردنـی کارەکانتـان و زانینی کاتی نویٚژو ڕۆژو حەج و بەخشینی زەکات.

﴿ ما خَلَقَ اللهُ ذٰلِكَ إلا بالْحَقّ ﴾ خوا ئەو شتانە باسکران لـەخۆرو لەمانگ بـەو شـیٚوە نەگۆڕانەوەو لـە دیاری کردنی جیٚگەکانی خۆرو مانگ دروستی نەکردون مەگەر بەڕاستی و لـەجیٚگەی شیاوی خۆیانا دای ناون.بەبیٚ سود

دروست نەکراون لـەواندا هەیە سـودی زۆر بـۆ ئـادەمیزاد بەتایبـەتی بـۆ ئـایین و بـۆ کاروباری جیهان و بۆ هەمو بونەوەران. بەڵگەیشن لـەسەر یەکیٚتی و توانای خواو زانیاری خوا.

﴿ يُفصِلُ الايات لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ خوا ڕونی ئەکاتەوە بەڵگەو نیشانەی ڕون و ئاشـکرا لـەسەر یەکیٚتی خۆی بۆ تاقمیٚ بیانەویٚ بەڵگـە لـەسـەر یـەکیٚتی خـوا بزانـن و سـودی لیٚ وەربگرن دووای بیرکردنەوە.

بۆ زانین: بۆ هەر یەکـە لـەخۆرو لـەمانگ و لـەئەسـتیٚرەکان و زەوی جیٚگـە سـوڕی تایبەتی خۆیان هەیە، هەمویان دووسوڕیان هەیە، سوڕیٚکیان بەدەوری خۆیاناو بـەو سـوڕە چوار وەرز پەیدا ئەبیٚ کەئەکەنە دووازدە مانگ، سوڕیٚ تریان بەدەوری خۆردا کە شەوو

ڕۆژ پەیدا ئەبێ. بەپەیدا بونی شەوو ڕۆژ هەمو کاتێ ئەزانرێ لەشەوو ڕۆژو هەفتەو مانگ و ساڵ بەبەشکردنی شەوو ڕۆژ بە (٢٤) بەش کات ژمێر پەیدا ئەبێ، بەو ژمارانە کاتی نوێژ لە شەوو ڕۆژێکا ڕون ببێتەوە، لە ساڵێکا کاتی حەج و ڕۆژو زەکات ڕون ئەبێتەوە، کاتی دیاری بۆهاتو چۆو مامەڵە لەنێو ئادەمیزاد دیاری ئەکرێ.

ئەوەی شایانی باسبێ یاسای ئیسلام کاتی دیاری کردوە بۆ ڕۆژو بۆ زەکات و حەج و عیدەی ژنان و جگەی ئەوانیش لەکارە پێویستیەکانی تری ئاییندا بەهۆی مانگەوە نەك بەهۆی خۆرەوە، چونکە خۆر هەمو بەیانیەك هەڵدێ و هەمو ئێوارەیە ئاوا دەبێ لەسەر ڕچەیەکی نەگۆڕاو قەوارەکەشی ناگۆڕێ لەکاتی هەڵهاتن و ئاوابوندا. بەڵام گۆڕانی سەرما و گەرما بەهۆی دوری و نزیکی خۆر وەك یەك نین لە وەرزەکانا و لە هەمو جێگەیە. کەواتە کات دانان بەهۆی خۆرەوە پێویستی هەیە بۆ دیاری کردنی کات بۆلای لێ کۆڵینەوەیەکی یەك جار زۆرو قوڵ و گران. بەڵام مانگ خۆی دەر ئەخا بەوێنەی جیاجیا یانێ لە یەکەم ڕۆژی مانگەوە بچوکەو شەو لەدوای شەو گەورە ئەبێ، لەنیوەی دووایی مانگدا ووردە ووردە شەو لەدووای شەو بچوك ئەبێتەوە هەتا وای لێ دێ نابینرێ لەدووایدا خۆر بەحێ دێڵێ بەوێنەی مانگی پێشو، دووازدە مانگە پەیدا ئەبێ و ساڵی پێ دروست ئەبێ. کەواتە زۆر ئاسانە بۆ ئادەمیزاد بە خوێنەوارو نەخوێنەوارەوە بەهۆی مانگەوە ژمارەکانی حۆیان دیاری بکەن.

﴿ إنَّ في أختِلافِ اللّيلِ وَالنَهار وَما خَلَقَ الله في السَّماواتِ وَالأرْضِ لاياتٍ لِقَومٍ يَتَّقُونَ ﴾ بەڕاستی لەگۆڕانی شەوو ڕۆژدا. یانێ هاتنیان بەدووای یەکداو گۆڕینی ڕەنگەکانیان و زۆر بون و کەمکردنی ئەندازەیان هەندێ جارو، هەیشە لەشتێ خوا دروستی کردوە لەئێوە ئاسمانەکان و زەویدا لە ئەستێرەو جگەی ئەستێرەو لەگیان لەبەرو گیاو درەخت و میوەو خواردەمەنی و کانەکان و ڕوبارو چەندین شتی تر چەندین بەڵگە و نیشانە لەسەر یەکێتی و تووانای خوا بۆ تاقمێ بترسن لەپاشە ڕۆژی خۆیان و بترسن لەبێ فەرمانی خواو لەباوەڕنەهێنان و لەپاشەڕۆژیان ئەگەر پەشیمان نەبنەوە.

بۆ زانین: خوای مەزن خۆری دروست کردوە بەو ڕوناکیەوە هەر لەخۆیەوە نەك بەهۆی شتێ ترەوە، ڕوناکی و گەرمی ئەبەخشێ بەبونەوەران هەتا ببێتە هۆی ژیانیان.مانگی دروست کردوە بەو ڕوناکیەوە لەخۆرەوە وەری ئەگرێ و ئەبێتە هۆی شارەزاکردنی ئەو کەسانە شەو ڕەوی ئەکەن بۆ کاروان و فرمان. وەك لەمەو بەر باسمان کرد هەمو ئەستێرەکان بەزەویشەوە دووسوڕیان هەیە یەکێکیان بە دەوری خۆیاناو ئەوی تریان بەدەوری خۆردا، پێشینەکان ئەوەیان نەئەزانی و گومانیان وابو خۆر ئەسوڕێتەوە بەدەوری زەویدا و بەدەوری ئەستێرەکاندا. لەپاشا کاتێ (گالیلۆ) زانای ئیتالی لەسەدەی هەڤدە هەمدا ڕونی کردەوە ئەو شتەی قورئانی پیرۆز لەسەدەی حەوتەمی زاینیدا فەرمویەتی کە ئەستێرەکان هەمویان بەدەوری خۆردا ئەسوڕێنەوە بۆ نمونە: خوا ئەفەرموێ:﴿ وَتَرَى الْجِبالَ تَحْسَبُها جامِدَةً وَّهِيَ تَمُر مَرَّ السَّحابِ ﴾ وە تۆ کێوەکان ئەبینی گومانت وایە وەستاون و،ئەوان ئەڕۆن بەوێنەی ڕۆیشتنی هەور. مەبەست لەڕۆیشتنی کێوەکان ئەمڕۆیە نەك پاشەڕۆژ چونکە لەپاشەڕۆژدا کێوەکان نەماون. هەروەها بۆ زەویش هەیە جولانێ بەدەوری حۆرا لەهەمو شەوو ڕۆژێکا کە (٢٤) کات ژمێر ئەکا، سورێ تری هەیە بە دەوری خۆیا لەماوەی سالێکا کە دووازدە مانگی تەواو ئەکا. لەم دوو سورەی زەوی ئەمانەی خوارەوە پەیدا ئەبن:

١- پەیدا بونی شەوو ڕۆژو گۆڕانیان بەکورتی جارێك و جاریتر بەدرێژ بونیان.

٢- پەیدا بونی هەوا بەگوێرەی شوێنەکانی زەوی و بەگوێرەی دورونزیکیان لەخۆرەوەو لەناوەڕاستی زەوی، ئەم لاولای هێلی ناوەڕاستی زەوی هوای مام ناوەندیان هەیە، لەهەرێمەکانی باکورو باشور بەسەرمای زۆرو بەستەلەك و سەهۆل بەندان، بەگۆڕانی پلەی گەرما و سەرما لەهەرێمی بەدژی هەرێمی تر.

لەپاشا خوای مەزن هەڕەشە ئەکا لەو کەسانە ئومێدیان بڕیوە بەگەیشتنی خزمەتی خواو خۆیان گێل ئەکەن لەو بەلگانەی پێشوو لایانداوە لەخوا پەرستی لایان وایە پاشەڕۆژ درۆیەو ئەفەرموێ :

﴿ إنَّ الَّذِينَ لايَرْجُونَ لِقاءَنا وَرَضُوا بالْحَياةِ الدُّنْيا وَاطمأنُّوا بِها ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ ئومێدیان بە گەیشتن بەخزمەتی ئێمەو بڕوایان بەپاشە ڕۆژ نیە و بەتەمای پاداشت و تۆڵە نین و ڕازی و خۆش حاڵن بەزیندەگانی و ژیانی جیهان و بەپەسەندی ئەزانن و بڕوایان بەپاشەڕۆژ نیە و دانیشتوون لەنێو جیهاندا بەئارام گرتنەوە هەمو مەبەستیان خۆشی و ڕابواردنە بەشتێ کۆتایی پێ دێ، جوانی پڕوپوچی جیهان وای لێ کردوون واز لەخۆشی بەردەوامی بەهەشت بهێنن .

﴿ وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ أياتِنا غافِلُونَ ﴾ وە بەڕاستیش کەسانێکی ئەوتۆ ئەوان بێ ئاگان لەئایەتەکانی نامەی ئێمەو بێ ئاگان لەو بەڵگانە لەسەر یەکێتی خواو خۆیان گێل و گەوج کردوە لە بیرکردنەوە لە بونەوەران و لەو شتانەی لەواندان و ئامۆژگاری کاریان تێ ناکات و خۆیانیان گێل کردوەلە بانگەوازی پێغەمەرو پیاوچاکان، هەمو مەبەستیان ئاڕاستەی جیهان و ڕابواردنی جیهان کردوە.

﴿ أوُلئِكَ مَاوْ اهُمُ النارُ بِما كانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ ئەو تاقمانە جێگەیان ئاگری دۆزەخە بەهۆی شتێکەوە ئەیکەن لە گوناهو بێباوەڕی و بت پەرستی ودووڕویی.

لەو ئایەتەوەبۆمان ڕون ئەبێتەوە ئەو کەسانە جێگەیان ئاگری دۆزەخە ئەم تاقمانەی خوارەوەن:

١-ئەو کەسانەن ئومێدیان بەخزمەت گەیشتنی خوا ئەبێ و لەزیندو بونەوە نەترسن. بەتەمای پاداشت و تۆڵە نەبن، ئەوانە هەمویان بەدرۆ ئەژمێرن و بڕوایان پێیان نیە.

٢-خۆش حاڵن بەزیندەگانی و ڕابواردنی جیهان، چونەتە خوارەوەو ئەو پەڕیان گرتوە بۆ پەلاماردانی و پەیداکردنی خۆش گوزەرانی و ڕابواردن و پڕکردنی گەدەیان، خەڵەتاون بەجوانی و ڕوکەشی جیهان، ڕویان کردوە بۆلای ڕابواردنی جیهان بەهەر شێوەیە بۆیان بلوێ ڕائەبوێرن.

٣-خۆیانیان گێل کردوە لەباسی خوای مەزن و بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی قورئان و بەڵگە لەسەر یەکێتی خوا،گوێ ناگرن لەو کەسانە ئامۆژگاری چاکەیان بکەن،ئەوەی سود بگەیەنێ بەبەختیاری ڕاستەقینەیان خۆیانی لێ گێل ئەکەن.

٤–ئارام و دڵ نیان بەزیندەگانی جیهان و ڕاوەستانی، دڵیان خورپەی پیٚ ناکەویٚ لە هەڕەشەی خوا، چونکە دڵیان مردووە لەئاستی ناوی خوا.

ئەو چوار تاقمانە جیٚگەیان ئاگری دۆزەخە، ئەو هەڕەشانە بەتەنها بۆ ئەو کەسانە نیە باوەڕیان بەخوا نەبیٚ بەکردەوەو بەزمان. بەڵکو ئەو کەسانەیش ئەگریٚتەوە نویٚژ ئەکەن و ڕۆژو ئەگرن و زەکات ئەدەن و حەج ئەکەن کەچی خۆیان ناپاریٚزن لەقەدەغەکراوەکان و پەشیمان نابنەوە.

لەپاشا خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە چۆنیەتی و شیٚوەی باوەڕداران و ئەو پلە خوا ئەیانداتیٚ لەکاتی گەڕانەوەیان بۆلای خوا،ئەفەرمویٚ.

﴿ إنَّ الَّذِينَ أمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحاتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهِمْ بأيمانِهِمْ ﴾ بەڕاستی کەسانیٚکی ئەوتۆ باوەڕیان هیٚناوەو چاکەکانیان کردوە پەروەردگاری ئەووان شارەزای ئەوان ئەکا بۆلای ڕیٚگەی ڕاست و پاداشتیان ئەداتەوە بەهۆی باوەڕی خۆیان کە جیٚگەی گرتوە لەدڵیانا. بەو باوەڕهیٚنانەیان ڕیٚگەو شویٚنی بەختیاری خۆیانی پیٚ ئەدۆزنەوە .

﴿ تَجرِى مِنْ تَحْتِهُم الاَنْهارُ فى جِناتِ النَعِيم ﴾ ئەڕوا بەژیٚر کۆشکەکانی ئەواناو بەم لاولای ئەو کۆشکانەدا چەندین ڕوباری ئاوی شیرین و بیٚ گەرد لەنیٚو چەندین باخ و بیٚستانی خاوەنی خواردەمەنی و گوزەرانی چاك و خۆشن.

﴿ دَعْواهُمْ فِيها سُبْحانَكَ اللّهُمَّ ﴾ داخوازی و پاڕانەوەیان و گفتوگۆیان لەبەهەشتا ئەمەیە: ئەڵیٚن: ئەی خوایە پاك و خاویٚنی بۆتۆیەو دوری لەهەمو کاری ناشایستە.

﴿ وَتَحيَّتُمْ فِيها سَلامٌ ﴾ وە سڵاوو کات باشی ئەو بەهەشتیانە لەنیٚو بەهەشتا لەیەکتری و لەپاسەوانانی بەهەشت و سڵاووکات باشی فریشتەکان لەوان ئەمەیە: بەیەکتری ئەڵیٚن: یاخوا بیٚوەی بن و بەئاسایشەوە بژین.

﴿ وَاخِرُ دَعْواهُمْ أنِ الْحمدُ الله رَبَّ الْعالَمِينَ ﴾ وە کۆتایی پاڕانەوەو داخوازی ئەوان ئەوەیە بەزمان و بەدڵ ئەڵیٚن: بەڕاستی هەمو سوپاسیٚ بۆ خوایە پەروەردگارو بەخیٚوکەری هەمو بونەوەرانە.

یانیٚ پاڕانەوەو هاواریان لەدوای ئەوانەی دەستیان کەوت ئەو ڕستەیە دێت بەدەمیاناو مانای وانیە دووای ئەوە شتیٚ نالێن و داوای ناکەن.

لەپاشا خوای مەزن ئەیگێڕێتەوە فەرمودەی خۆی بۆلای ئەو کەسانەڕوئەکەن بۆلای جیهان و دڵیان بەجیهانەوە بەستراوە، خۆیانیان گێل کردوە لەپاشەڕۆژ. کاتیٚ پێغەمەری خوا داوای کرد لە دانیشتوان بۆلای ئایینی ئیسلام لە پاشا ئەوان پێغەمەریان بەدرۆ خستەوە، لەبەر ئەوەی لەقولایی بێباوەڕیدا بون و گاڵتەیان بەفەرمودەی پێغەمەر ئەکردوو وتیان: ئەی خوایە ئەگەر ئەو شتەی موحەمەد ئەیلێ لای تۆ ڕاستە بارێنە بەسەرمانا بەرد لە ئاسمانەوە، یا بیهێنە بۆلامان سزایەکی خاوەن ئازار، خوای مەزن وولامی دانەوە وە فەرموی:

وَلَوۡ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسۡتِعۡجَالَهُم بِٱلۡخَيۡرِ لَقُضِيَ إِلَيۡهِمۡ أَجَلُهُمۡۖ فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿١١﴾ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمٗا فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمۡ يَدۡعُنَآ إِلَىٰ ضُرّٖ مَّسَّهُۥۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡمُسۡرِفِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٢﴾ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٣﴾ ثُمَّ جَعَلۡنَٰكُمۡ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لِنَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٤﴾

﴿ وَلَوْ يُعَجِّلُ اللهُ لِلنّاسِ الشَّرَّ أستِعْجالَهُمْ بِالْخَيرِ ﴾ وە ئەگەر خوا پەلە بکا بۆ ئادەمیزاد وولأمیان بداتەوە بۆ ناردنە خوارەوەی ڕووداوی نالەبارو خراپ و بیٚ سـود کـاتیٚ داوای ئەکەن بەوێنەی پەلە کردنی ئەوان بۆناردنە خوارەوەی چاکە بۆیان و لایـان چاکـە خـوا بەگورجی وولأمی پاڕانەوەیان بداتەوە بۆ چاکە.

﴿ لقضَى إِلَيْهِمْ أَجلُهُمْ ﴾ بەڕاستی خوا لەناوی ئەبردن و ،هەمویان ئەمردن و کۆتـایی بەژیانیان ئەهات.بەلأم خوا بنەبڕ کردنیـان دووا ئـەخا لەبـەر سـودیٚ خـوا ئـەیزانیٚ کـە وولأمی پاڕانەوەی ئادەمیزاد نەداتەوە بۆ خراپەو ئەیان هێلێتەوە هەتا ماوەیە، دوایی هـۆی داواکردنی خراپەیان نامێنیٚ و چاکەیان بۆ ئەڕەخسیٚ، بە وێنەی تـاقمیٚ دوایـی موسـلْمان بون و لەپشتی ئەوان باوەڕداری زۆر پەیدا بون،ئەگەر خوا لەناوی ببردنایە ئەو شـتانەیان لەکیس ئەچو.

بۆ زانین: مەبەست لەخەیر هەمو شتێکە ئادەمیزاد سودی بیٚ وەربگریٚ لـەژیانیا پەلـە ئەکەن بۆ پەیدا بونی و ئارامی بۆ ناگرن. مەبەست لەشەڕ شـتێکە زیانیـان پـیٚ بگەیـەنیٚ، ئادەمیزاد لای گرانەو داوای ناکا مەگەر لەبەر شتیٚ ڕوی تیٚ بکـا لەخراپـە بـەو نەوعـە داوای خراپەیە ئەکا سوکتر بیٚ لەو خراپەیە توشی بوە، یـا وائـەبیٚ ئـادەمیزاد بـەجۆرێکی نائاسایی خۆی ئـەخنکێنیٚ، یـا لەبـەر ئـەوەی نـاتوانن لـە ڕوی دوژمنەکـەیانا ڕاوەسـتن. بەوێنەی بت پەرستان ئەیان ووت: ئەی خوایە ئەگەر موحەمەد ڕاست ئەکا بـەرد بـارێنـە بەسەرمانا.

﴿ فَنَذرُ الَّذِين لايَرْجُونَ لِقاءَنا فى طُغْيانِـهِمْ يَعْمَلُونَ ﴾ دوایـی ئێمـە واز ئـەهێنین لـە کەسـانێکی ئـەوتۆ بـەئومێدی ئـەوەنین بەخزمـەتی ئێمـە بگـەن لەسنور لادانـی خۆیانـا سەرگەردانین، لەبەر ئەوەی بەلْگەو نیشانەی ڕونمان بۆ داناون و ئەقلْمان داونەتیٚ ئەگـەر باوەڕیان نەهێنا بیانویان لیٚ وەرناگیریٚ، خوا پەلە ناکا بۆ سزادانیان.

لەپاشا خوای مەزن هەوالْ ئەدا بەبەرگە نەگرتنی ئادەمیزاد لەسە ئازارو لە تەنگانـەداو ئەفەرمویٚ :

﴿ وَإِذا مَسَّ الانْسانَ الضَّرَدعانا لِجَنْبِهِ أوْ قاعِداً أوْ قائِماً ﴾ وە هەر کاتێ توشی ئادەمیزاد ببوایە سەختی و ئازار لەهەژاری و نەخۆشی یا خنکان بەئاو یانەمانی کشت و کاڵ و ئاژەڵ و تەنگ و چەڵەمەو ناخۆشی تر ئەپاڕانەوە لەئێمە بەڕاکشاوی لەسەر تەنشت یا بەدانیشتن یا بە ڕاوەستانەوە بەکزوڵی و هەژارییەوە بۆ لابردنی ئەو شتانە.

﴿ فَلَمّا كَشَفْنا عَنْهُ ضُرَّهُ مَرَّ كَأَنْ لَمْ يَدْعُنا إلى ضُرٍّ مَسَّهُ ﴾ دوایی کاتێ ئێمە لامان برد لەسەری سەختی و ئازارو پاڕانەوەکەمان لێ وەرگرت ئەڕوا بەرێگەو بۆلای کارە خراپەکانیان وەك لەئێمە نەپاڕابێتەوە بۆ لابردنی ئەو سەختی و ئازارە توشی بو وەك هیچ شتێ نەبوبێ.

بۆ زانین:ڕووداوی گرانی وا هەیە پاڵ بەئادەمیزادەوە بنێ و ناچاری بکا بۆئەوەی درۆو دووڕویی بکا بۆ کەسێ پێویستێکی هەبێ بۆی جێبەجێ بکا. بەلاّم چ شتێکی ئەوتۆیە پاڵی نابێ بەو کەسەوە بۆلای بێ فەرمانی و لەبیر چونەوەی چاکەی کەسێ لەوەو بەر لەو کەسە پاڕاوەتەوە بۆلای جێ بەجێ کردنی پێویستیەکەی خۆی بەکزوڵیەوەو بۆیشی جێبەجێ کردو ئێستا لەبیری خۆی ئەباتەوەو ئەڕوا وەك لەو کەسە نەپاڕابیتەوە؟ بێگومان ئەو کەسە زۆر نەفامەو ئەوپەڕی گرتوە لەخراپیدا.

﴿ كَذلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ ما كانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ وەك ڕازێنراوەتەوە بۆ ئەو کەسە ئەو کارە خراپانەی ڕابواردن بینکا، ڕازێنراوەتەوە بۆ ئەو کەسانە لەسنوری خوا دەرچون شتێ ئەیکەن لەبت پەرستی، ئەو شتە بۆ ئەو کەسەی ڕازاندۆتەوە گوێ نەدانە بەهەمو شتێ جگەی سودی خۆیەتی.

لەپاشا خوای مەزن هەواڵ ئەدا بەو شتەو بەو سزایە هاتوەتە خوارەوەو بۆ نەتەوە پێشوەکان. بۆ ئەوەیش ئەم نەتەوانەی سەردەمی پێغەمەرو سەردەمی ئێمەیش بترسێنێ لەو سزایەی هاتوەتە خوارەوە بۆ ئەو گەلانەی پێشو پێی بنەبڕ بوون و ئەفەرموێ :

﴿ وَلَقَد أهْلَكْنا الْقُرُونَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَمّا ظَلَمُوا وَجاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بالْبَيِّناتِ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە لەناومان بردن دانیشتوانی هەمو نەتەوەیە لەپێش ئێوەوە بون کاتێ ستەمیان کردوە

لەخۆیان و کاتیٚ پێغەمەرکانیان هاتن بۆلایان بەچەندین بەڵگەی ڕون لەسەر ڕاستی پێغەمەرەکانیان. دوایی وولاّمی پێغەمەرەکانیان نەدایەوەو باوەڕیان بەخواو پێغەمەرایەتی ئەوان نەهێنا.

﴿ وَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا ﴾ وە ئەو نەتەوانە باوەڕیان بەپێغەمەرەکانی خۆیان نەهێناو ئەگەر لەناویش نەبرانایە باوەڕیان نەهێنا،خودا ئەیزانی هەر بەردەوام ئەبن لەسەر بیٚ باوەڕی .

﴿ كَذَلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴾ هەر بەو جۆرەی سزای گەلانی پێشوانمان دا، ئێمە سزای تاقمیٚ ئەدەین تاوانبارن بەهۆی بت پەرستیانەوە لە دانیشتوانی مەکەو جگەی مەکە.

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَا كُمْ خَلَائِفَ الْأَرْضِ مِنْ بَعْدِهِم ﴾لەپاشا ئێمە ئێوەی پەیڕەوانی موحەمەدی ڕەوانە کراوی خۆمانمان کرد بەجێگە نشینی ئەو گەلانەی پێشو لەسەر زەوی لەدوای ئەوەی ئەوانمان بنەبڕ کردوون، ئەتان کەین بەجۆریٚ زەوی ئاوەدان بکەنەوەو داد پەروەری بلاّو بکەنەوەو شاراوەکانی زەوی دەربهێنن بۆ سودی ئادەمیزاد.

﴿ لِنَظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴾ هەتا بزانین و تەماشا بکەین و نیشانی بدەین بەدانیشتوان بەچ جۆریٚ کار ئەکەن لەچاکەو داد پەروەری و خراپەو تاوان، خراپەکان بۆ خۆتان ئەگەڕێنەوە .

خوای مەزن بەرلەوەی کردەوەکانتان بکەن ئەزانیٚ ئێوە چ شتیٚ ئەکەن ،وەك ئەزانیٚ نەتەوەیە دێتە سەر زەوی و ئەڕواو مێژوی کردەوەیان ماوەتەوە دوایی ئەوان نەتەوەیە جێگەیان ئەگرێتەوە، ئەوانیش کاتیٚ خۆیان بەسەر ئەبەن، هەروەها یەك لەدووای یەك دێن و ئەڕۆن. مەبەستیش لەدروستکردنی ئادەمیزاد لەسەر زەوی بۆ ئەوەیە خواپەرستی بکەن و فێری زانست و زانین و کردەوەی چاك بن بەهەمو شێوەیە داد پەروەری بلاّو بکەنەوە، پیتی زەوی بەکار بهێنن لەسودی دانیشتوانا نەك بۆ ئازارو لەناو بردنیان.

لەپاشا خوای گەورە هەواڵ ئەدا بەبت پەرستان کە بە ئومێدی بەخزمەت گەیشتنی خوا نین و ئەفەرمویٚ:

وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٧﴾

﴿ وَإذا تُتْلى عَلَيْهِمْ أياتنا بَيْنات قالَ الَّذِينَ لايَرْجُونَ لِقاءَنا أئـت بِقُـران غَـيْرِ هـذا ﴾ وە هەر کاتیٚ بخوێنرێتەوە بەسەر بتپەرستانا ئایەتەکانی قورئانی ئێمە بەڕونی و ئاشکرا کردنـی فەرماندان بە چاکەو بەقەدەغە کردنی خراپەکان کەسانێکی ئوتۆ بەئومێدی گەیشـتن نـین بەئێمە ئەیان ووت:

تۆ قورئانیٚ بهێنە بۆلای ئێمە جگـەی ئەمـەی ئەیخوێنیتـەوە بەسـەرمانا،باسـی زینـدو بونەوەو کۆکردنەوەو ڕۆژی دووایی و پرسـیارو پاداشـت و سـزاو جنێـو دان بەبتـەکانی ئێمەی تێدا نەبیٚ.

﴿ أوْ بَدِلْهُ ﴾ یا ئەو قورئانە بگۆڕە و تێکەلاّوو موتربکەی بەچەند شـتیٚ لـەجێگەیـەکی ئەو قورئانەدا سزاو پاداشت وەرگرتن دانیٚ، لـەشوێنی تردا قەدەغە کراوەکـان بـە ڕەوادا

دانیٚ. لەجیٚگەیە تردا ئەو شتانە قەدەغەن بیانکەن بەڕەوا. مەبەستیان ئەوە بو کە پیٚغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ دوای هەواو هەوەسی ئەوان بکەویٚ و ناچاری بکەن بەبیروڕای ئەوان هەڵسیٚ.

بۆ زانین: پیٚغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەڵگەی ئەهیٚنایەوە بۆ بت پەرستان و بۆ جوو گاورەکان بەقورئانی پیرۆز. بەلاٚم بەنەرمی و لەسەر خۆ لەگەڵیان ئەدوا. لەگەڵ بت پەرستان و جوەکان بەتوندو تیژی لەبەر ئەوەی ئەوان و زۆرتر دوژمنی پیٚغەمەر بون و بەزۆری ڕویان لیٚ وەرئەگیٚرا. بەلاٚم گاورەکان وێنەی ئەوان نەبون،بوبون بە دوو تاقم: تاقمیٚکیان نویٚنەری خۆیانیان نارد بۆ لای پیٚغەمەرو سەرانەیان دا بەموسڵمانان، تاقمیٚ ویستیان مەدینە داگیر بکەن، ئەوەبو پیٚغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ڕیٚگەی لیٚ گرتن و سەر شۆڕی کردن لەشامدا بەهۆی جەنگی تەبوکەوە، بەژیرانە لەگەڵ پیٚغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ هەڵسان. بەلاٚم بت پەرستەکان زۆر بەگیٚلانە داوایان لە پیٚغەمەر کرد قورئان بگۆڕیٚ لە بەر ئەوەی قورئان ئاینیٚکی تازەی هیٚنابو،فەرمانی دا بو یەکیٚتی خواو یەکسانی نیٚوان ئادەمیزادو فەرمانی ئەدا بەباوەڕکردن بەخوایەکی تاك و تەنهاو وەرگرتنی پاداشت و تۆڵە، ئەیەویست داد پەروەری بلاٚو ببیٚتەوە، چینایەتی و جیاوازی نەمیٚنیٚ، سود خواردن و ستەم کردن لەناویانا نەمیٚنیٚ ئەوە لە لایەکەوە، لەلایەکی ترەوە بت پەرستان باوەڕیان بەچەند خوایە هەبو، باوەڕیان بە زیندو بونەوەو ڕۆژی دووایی نەبو، ئەیان ویست هەرشتیٚ لایان خۆشبیٚ بۆیان ڕەوا بکریٚ.

ئەبیٚ بزانین: هەندیٚ لەلاوانی ئەم سەردەمەی ئیٚستایش شاگردی بت پەرستانی ئەو کاتەن و ئەڵیٚن: ئایین چیە؟هەمو شتیٚ ڕەوایە و قەدەغە کراو هەر نیە، ئارەق خواردنەوەو ڕوتی ژنان شارستانی و پیٚش کەوتنە، هەر بۆئەو مەبەستە خراپانە بت پەرستان داوایان لەپیٚغەمەر ئەکرد کە قورئانیٚکیان بۆ بهیٚنیٚ وێنەی ئایینی خۆیان بیٚ، یاقورئان بگۆڕیٚ بەشیٚوەیە خۆیان لایان حۆش بیٚ. کاتیٚ ئەو داواو بەڵیٚنەیان داوا کرد لەپیٚغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ خوا ئەفەرمویٚ :

﴿ قُلْ مایَکُونُ لی أنْ أبَدِلَهُ مِنْ تَلِقاءِ نَنْسی ﴾ تۆ بڵێ: نابێ و شایستە نیە بۆ من قورئـان بگۆڕم لـە لایەن خۆمـەوە هەرشـتێ خـوا فـەرمانی پـێ بـدا ڕای ئەگەیـەنم بەدانیشـتوان. بەڕاستی زۆریش لـەخوا ئەترسـم و توانـای گۆڕینـی قورئـانم نیـە، وەك خـوا ئەفـەرموێ بەپێغەمەر تۆ بڵێ :

﴿ إنْ أتَّبِعُ إلاّ مـایُوحی إلی ﴾ مـن دووای هیـچ شـتێ ناکـەوم و نـالێم مەگـەر شـتێ بەسروش هێنرابێ بۆ لای من لـەلای خواوە، هەر کەسێ دوواکـەوتوی سروشـبێ نـاتوانێ سەربەخۆ هیچ شتێ بکا، ئەو بتانەی ئێوە بێ گیان و زیان و سودیان بۆ خۆیان نیـــە، ئێـوە چۆنیان ئەپەرستن، پەرستراو ئەبێ خاوەنی هۆش و گۆش و زاین بێ.

﴿ إنّی أخافُ إنْ عَصَیْتُ رَبّی عَـذابَ یَـوْمٍ عَظِیـمٍ ﴾ بەڕاسـتی مـن ئەترسـم لـەسـزای ڕۆژێکی زۆر گەورە کە ڕۆژی دووایيە ئەگەر من بێ فەرمانی پەروەردگاری خـۆم بکـەم، ئەو ئایەتە فێرمان ئەکا ئەو بت پەرستانە بەهۆی ئەو داخوازییـــەوە ئەبنـە جێگـەی سـزای خوا.

﴿ قُلْ لَّوْشاءَ اللّهُ ماتَلَوْتَهُ عَلَیکُمْ وَلاأدْراکُمْ بِهِ ﴾ تۆ بڵێ ئەگەر خوا ئـارەزوی هەبوایـە من نەم ئەخوێندەوە بەسەر ئێوەدا ئەو قورئانە و من ئەو قورئانەم بە ئێوە ڕانەئەگەیاند،منـی بەقورئانەوە ڕەوانە کردوە ئەو شتانەم بەجێ هێناوە لـەبەر فـەرماندانی خـوا. کەواتـە ئـەو قورئانە لـەلایەن خواوە هاتوەو دەستەلاّتی منی تێدا نیە.

﴿ لَقَدْ لَبِثْتُ فِیکُمْ مِنْ قَبْلِهِ أفَلا تَعْقِلُونَ ﴾ دوایی بەڕاستی من لـەنێو ئێوەدابووم لـــەپێش ئەوەی ئەو قورئانە بەسروش بێتە خوارەوە ئەندازەیە لـەتەمەنی خۆم کەچل سـاڵ بـوە،لـەو ماوەیەدا من هیچ شتێکم بەئێوە ڕانەئەگەیاند، زۆر بەباشی ئێوە من ئەناســن ئایـا ئێـوە بـۆ دوایی بیر ناکەنەوە هەتا بزانن و تێبگەن ئەو قورئانە لـەلایەن خواوە هاتوەتە خوارەوە.

بەڕاستی کەسێ لـەناو گەلی خۆی دا ژیانی بەسەر بردبێ ماوەی چـل سـاڵ بەرلـەوەی قورئانی بۆ بێتە خـوارێ و نەخوێنـەوار بوبـێ و لـەهیچ کەسـێ شـتێکی وەر نـەگرتبێ و کردەوەیەکی وای نەکردبێ لۆمەی بکرێ لـەسەری. بەڵکو هەمو ژیانی خۆی بەڕەوشـــتی

بەرز بردبێتە سەر و ڕاست گۆو دەست پاك و داوێـن پـاك بوبـێ بـەجۆرێ نـاوی برابـێ بەدەست پاك و داوێن پـاك، بـەئاگاداری هـەمو هۆزەكـانی مەكـە چـۆن بوختـان و درۆ هەڵئەبەسێ بەدەم خواوە.

﴿ فَمَنْ أَظْلَمَ مِمِنْ أفتَرى عَلى اللهِ كَذِبا أوْكَذَّبَ باياتِهِ إنَّهُ لايُفْلِحُ الْمُجرِمُونَ ﴾ دوایی چ كەسێ ستەم كارترە لـەكەسێ بوختان و درۆ هەڵبەستێ و بیدا بەسەر خواداو هاوبەش بـۆ خوا دانێ یا باوەڕی بەئایەتەكانی قورئانی خوا نەهێنابێ؟ بەڕاستی ڕزگاری نابێ تاوانبـاران لـەسزای خوا بەهۆی ئەوەی هاوبەش دانێن بۆخـواو كـوڕو كچـی بـۆ بڕیـاربدەن، ئـەبێ بزانرێ ڕزگاری و سەر كەوتن بەڕاست گۆیی ونیـازی پـاك پـەیدا ئـەبێ، دۆرو بوختـان ڕێگەی لـەناوچون و نەمانە، كەس ئەو ڕێگەیە وەرناگرێ مەگەر ئەو كەسانەی تاوانبارن.

لەپاشا خوای مەزن هەواڵ ئەدا لـەوبێ باوەڕانەوەو ئەفەرموێ :

وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٨﴾ وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَٱخْتَلَفُوا۟ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٩﴾ وَيَقُولُونَ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ فَقُلْ إِنَّمَا ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٢٠﴾

﴿ وَيَعْبُدُونَ مِنْ دونِ اللّهِ مالايَضُرُّهُمْ وَلايَنْفَعُهُمْ ﴾ وە ئەو بت پەرستانە لەجگەی خوا شتێ ئەپەرستن زیان بەوان ناگەیەنن و سودیان پێ نابەخشن ئەگەر هەمو کاتی خۆیشیان بەفیرۆ بدەن بۆ پەرستنیان.

﴿ وَيَقُولُونَ هَؤُلاءِ شُفَعاءُنا عِنْدَ اللهِ ﴾ وە ئەو بت پەرستانە ئەڵێن: ئەو بتانە تکاکاری ئێمەن لای خوا. بەڵام ئەو بڕوایەی ئەوان خاوەنی پلەو پایەیەکی وای نیە جێگەی متمانە بێ لەجگەی گومان.

خوای مەزن فەرمان ئەدا بە پێغەمەری خۆی بەدرۆیان بخاتەوە لەو گومانەیانداو بڵێ بەوان:

﴿ قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللهَ بِما لايَعْلَمُ فِی السَّماواتِ وَلافی الأَرْضِ ﴾ تۆ بڵێ:ئایا ئێوەی بت پەرست هەواڵ ئەدەن بەخواو ئاگاداری ئەکەن بەشتێ نایزانێ لەپەرستنی بتەکان و لەبونی بتەکان بەهاوبەش بۆ خوا لەنێو ئاسمانەوکان و لەنێو زەویدا، ئەو هەواڵە زۆر نارەوایە. ئەگەر ڕاست بوایە خوا ئەیزانی، کاتێ بونی نەگونجاو بێ لای خوا گفتوگۆی ئەو بت پەرستانە دۆرو بوختانە.

﴿ سُبْحانَهُ وَتَعالَی عَمّا يُشْرِكُونَ ﴾ خوا پاك و بالاّ ترو دورترە لەشتێ بیکەن بەهاوبەش بۆی لەپەرستنداو لەوەی ئەو بتانە ڕێزداربن و بپارێنەوە بۆ بت پەرستان لای خوا.

ئادەمیزاد یەکەم کات هاتونەتە جیهانەوە یەك ئایین و یەك بیروباوەڕیان هەبوە کە ئایینی سروشتی و پاکی بوە، دوربوون لەبێباوەڕی، ئایینیان باوەڕبون بوە بەیەکێتی خوا، لەپاشا بەدرێژایی کات و ڕۆژ هەواو هەوەس و ئارەزوکاری پارچەپارچەی کردن، لەڕێگەی ژیری و ئەقڵ دەرچون، بیروباوەڕیان زۆر بو، هەمە جۆرە ئایینیان لێ پەیدا بو، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿ وَماكانَ النّاسُ إِلاّ أُمَّةً وَاحِدَةً فَاخْتَلَفُوا ﴾ وە ئادەمیزاد پەیدا نەبون لەکاتی دروست بونیان یەکەم جار مەگەر یەك نەتەوە بوون و بەسروشتی پاکەوە خوا پەرستیان ئەکرد و پێك هاتبون لەسەر ڕاستی خاوەنی یەك ئایین بوون کە ئاینی ئیسلام بوە هەر لەکاتی

ئادەمەوە هەتا قابیل هابیلی برای خۆی کوشت،دوایی تێك چون و پارچەپارچە بون و بون بە چەند نەتەوەیەو بەخاوەنی چەندین بیروباوەڕی پڕوپوچ، بۆ ئـەوەی بگەڕێنـەوە بـۆلای ئاینی پاك و خواپەرستی پێشویان خوا پێغەمەرانی بۆ ناردن هەندێکیان باوەڕیان پیێ هێنـان، هەندیێ تریان باوەڕیان پیێ نەهێنان.

﴿ وَلَوْلا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِنْ رَّبِكَ ﴾ وە ئەگەر فەرمودەیـە لەلایـەن پـەروەردگاری تـۆو پێش نەکەوتایە کە خوا پەلە ناکا لەسزادان و لەناو بردنی تاوانباران لە جیـهاندا بـەهۆی میهرەبانی خۆیەوە هەتا کاتی دیاری کردنی کۆتایی تەمەنیان و مردنیان.

﴿ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ فِيما فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ بەڕاسـتی فـەرمان دەرئـەکرا لـەنێوان ئـادەمیزادا لەشتێکا دژی یەکتری بون، لەو شتەدا هەر یەکەیان ئاینێکیان هەڵبژاردبو، بەجۆریێ خـوا بیێ باوەڕنی لەناو ئەبردن و باوەڕداران ڕزگاریان ئەبو لەکردەوەی نالـەباری بیێباوەڕان، پیاو چاکان و تاوانبارانی جویێ ئەبونەوە، بەلاّم خوا هەمویانی مۆڵەت داو دووای خسـتن، بۆ ئەوەی هەمو ئادەمیزادیێ بگا بەو شتەی پیێی خۆشـە لـەچاك و لـەخراپ بـەگوێرەی سەربەستی خۆیان و بیانویان نەمێنیێ و هەریەکەیان پاداشتی ئارەزومەندی خۆیان وەرگرن.

﴿ وَيَقُولُونَ لَوْلا أُنْزِلَ عَلَيْهِ أيَةٌ مِنْ رَّبِهِ ﴾ وە بـت پەرسـتان ئـەڵێن: بۆچـی نەنێراوەتـە خوارەوە بۆ سەر موحەمەد لەلایـەن پەروەردەکـەری خۆیـەوە نیشـانەو بەڵگەیـە ئـەوان داوایان ئەکرد، کارێکی زۆر پەکخەری وا بۆی ڕەوانە بکرایە ئادەمیزادی پاڵ پێـوە بنایـە برۆا بەڕاستی موحەمەد بکەن بەبیێ بیرکردنەوە. ئەوەبو داوایـان ئـەکرد خـوا ڕاسـتەوخۆ گفتوگۆیان لەگەڵ بکا،ئەو کێوەمان بۆ بکا بەزێڕ.باوك و دایکـە مردوەکانمـان بـۆ زینـدو بکاتەوە. چەند داخوازی تر.

﴿ فَقُلْ إِنَّما الْغَيْبُ لِلّهِ ﴾ دووایی تۆ بڵیێ: بەڕاستی هـەمو کـارێکی نادیـاری هـەر بـۆ خوایەو کەس نایزانیێ. ناردنە خوارەوەی ئەو کارە پەك خەرانە شتی نادیـاربن پـەیوەندیان بەخواوە هەیەو لەناردنە خواەوەی ئەو داخوازییەی ئەوان چەندین شـاراوەی تێدایـە نـابیێ بێتە خوارەوە. ئەگەر خوا ئارەزوی هەبیێ ئەیان نێرێتە خوارەوە، هیچ شتیێ بەدەستی من نیە و نایزانم.

﴿ فَانْتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُمْ مِنَ الْمُنْتَظِرِينَ ﴾ دوایی ئێوە چاوەڕووانی فەرمانی خوا بکەن لەنێوان ئێمەو ئێوەدا، بەڕاستی من لەگەڵ ئێوەدا لەوکەسانەین چاوەڕووان ئەکەین هەتا بزانین کام لالەئێمەو لەئێوە شایانترین بەوەی دوربن لەخەشمی خواو توشی ئاسایش ئەبین،هەتا ڕاست و چەوت و باوەڕدارو بێ باوەڕ جوێ بکرێنەوە.

قورەیشەکان کاتێ بێفەرمانی خوایان کرد پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ لەخوا پاڕایەوە کەگرانیەك وێنەی گرانی سالآنی یوسفیان بۆ بنێرێ، لە دوییدا توشی گرانی و تەنگانەبون، هەتا وایان لێ هات ئێسك و گۆشتی مردارۆبویان ئەخوارد،بەو بۆنەوە ئەبو سوفیان هاتە خزمەت پێغەمەر ووتی: ئەی موحەمەد: بەڕاستی تۆ هاتوی فەرمان بدەی بەگەیاندن و چەسپاندنی خزمایەتی، خزمەکانت هەمویان لەناوچون بەهۆی برسێتی و گرانیەوە، داوا بکە لەخوا ئەو سزایە لەسەریان هەڵگرێ ،دوایی خوای مەزن سزاکەی لەسەر لابردن، بارانی بۆ باراندن کەچی لە دواییدا چونەوە سەرکردەوە خراپەکانیان، لەو باوەرەوە خوا ئەفەرموێ:

وَإِذَا أَذَقْنَا النَّاسَ رَحْمَةً مِنْ بَعْدِ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُمْ إِذَا لَهُمْ مَكْرٌ فِي آيَاتِنَا قُلِ اللَّهُ أَسْرَعُ مَكْرًا إِنَّ رُسُلَنَا يَكْتُبُونَ مَا تَمْكُرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ الَّذِي يُسَيِّرُكُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ حَتَّى إِذَا كُنْتُمْ فِي الْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِمْ بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا بِهَا جَاءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءَهُمُ الْمَوْجُ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ لَئِنْ أَنْجَيْتَنَا مِنْ هَذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ

ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٣﴾

﴿ وَإذا أذَقْنا النّاسَ رَحْمَةً بَعْدِ ضَّراءَ مُسْتَهمَ ﴾ وە هەر کاتیٚ ئیٚمە بمان چیٚشتایە بەئادەمیزادی دانیشتوانی مەکە چاکەیە لەهەرزانی و لەش ساغی و میهرەبانی و بەزەیی خواو خۆشی تر لە دووای تەنگانەیە توشیان بوبو.

﴿ قُل اللّٰهُ أسْرَعُ مُكْراً ﴾ تۆ بلّیٚ بەوان: تۆلّە سەندنی خوا بۆ لەناو بردن و پوچ کردنەوەی پیلانی ئەوان تیژترو چوسترە لەفیٚلّی ئەوان بەناردنە خوارەوەی سزا بۆ سەریان ئەگەر ئارەزوی هەبیٚ.

﴿ إنَّ رُسُلنا يَكْتُبُونَ ماتَمْكرونَ ﴾ بەڕاستی نیٚرراوەکانی ئیٚمە کە بریتین لە فریشتەکان ئەینوسن شتیٚ ئەوان پیلانی بۆ ئەگیٚڕن و ئەیکەن لەکارە خراپەکانیان، بەو کردەوانەی خۆیان لەڕۆژی دووایيدا ئابڕویان ئەچیٚ و تۆلّەی ئەو پیلانە وەرئەگرن.

لەپاشا خوای مەزن چاکەو دەستەلاّتی خۆی دەر ئەبڕیٚ بەسەر هەمو بونەوەرانەوە، بەجۆریٚ کە ئەو چاکانە ئەژمیٚریٚ کەبەوانی بەخشیوەو ئەفەرمویٚ:

﴿ هُوَ الَّذِي يُسيّرُكُمْ في الْبَرو الْبَحْرُ ﴾ خوا کەسیٚکی ئەوتۆیە ئیٚوە ئەبا بەڕیٚوە بەبیٚ ئەوەی دەستەلاّتی ئیٚوەی تیٚدا بیٚ لە ووشکاییدا بەسواری چارەویٚ و شتی ترەوەو لەڕوبارو دەرباو زەریاکانەوە بەکەشتی و شتی ترەوە، زۆر شتی تری وایش لەمەو دووا پەیدا ئەکا ئیٚوە هەلّئەگریٚ لەسەر زەوی و لەسەر دەریاو لەهەوادا.

﴿ حَتّى إذا كُنْتُمْ فی الْفَلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِمْ ﴾ هەتا کاتیٚ ئیٚوە لەنیٚو کەشتیەکاندان و، کەشتیەکان بەئەوانەوە ئەڕۆن بەناو ئاوی دەریاکانا.

﴿ بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ ﴾ بەهۆی هەڵکردنی بایەکی نەرمەوە نەبایەکی ئازار پەیدا کەرەو نەبایەکی لاوازە بەڵام بایەکی مام ناوەدیە.

﴿ وَفَرِحوا بِها جاءتْها ريحٌ عاصِفٌ ﴾ وە بەو بایە شادمان و کەیف خۆشن کتوپڕ هات بۆلایان بایەکی زۆر سەخت و شکێنرو ناهەموار و زۆر تیژو ئازاردەر.

﴿ وَجاءَهُمُ الْمَوْجُ مِنْ كُلِّ مَكانٍ ﴾ وە هات بۆلایان شەپۆلی گەورەو بەرزی دەریا لەهەمو لایەکەوەو لەهەمو جێگەیەکەوە، کەشتی لێخورِ دەستە جڵەوی کەشتیەکەی لەدەست دەرئەچێ، مەترسی پەیدا ئەبێ بۆ دانیشتوانی کەشتیەکە بەهەمو جۆرێ.

﴿ وَظَنّوا أَنَّهُمْ أُحيطَ بِهِمْ دَعَوُا اللهَ مُخْلِصينَ لَهُ الدِّينَ ﴾ وە گومانیان ئەبرد کە ئەوان بەڕاستی چوار دەوریان دراوە بەبەڵاو بەناخۆشی و بەلەناوچون، بەتەمای ژیانی خۆیان نەماون، لەخوا ئەپاڕانەوەو هاواریان ئەکرد و پەنایان بۆ ئەبرد ئەو ناخۆشیە لابا لەسەریان بە نیازی پاکەوە ئایینیان بۆ خوا دائەناو ناوی بتەکانیان نەئەبردو ئەیانزانی سود بەوان ناگەیەنن لەوان نەئەپاڕانەوە، ئەڵێن:

﴿ لَئِنْ أَنْجَيْتَنا مِنْ لَتَكُنَنَّ لِنَكونَنَّ مِنَ الشاكِرينَ ﴾ بەڕاستی خوا ئەگەر تۆ ئێمە ڕزگار بکەی لە تەنگانە و لەم ناخۆشیە، هەمو کاتێ لەو کەسانە ئەبین سوپاسی میهرەبانی تۆ بکەین.

بۆ زانین: بت پەرستەکان لەکاتی تەنگانەدا لەخوای پەروەردگاری خۆیان ئەپاڕانەوە. بەڵام لەکاتی ئاسایشدا خوایان لەبیری خۆیان ئەبردەوەو لەبتەکانیان ئەپاڕانەوە. بەداخەوە هەندێ بەناو موسڵمانی ئەم سەردەمەی ئێمەیش بەگوێرەی بڕوای پوچی خۆیان لەکاتی تەنگانەدا لەمردووەکان و دارو بەرد ئەپاڕێتەوەو بەدەوری گۆڕی پیاو چاکانا ئەسوڕێنەوەو هاواریان لێ ئەکەن و زۆر جارانیش سوژدەیان بۆ ئەبەن، لەسوێندەکانیشیانا بەو جۆرە خراپە لەدەوری گۆڕی گەیلانی و ڕوفاعی و پێشەوایان حوسەین و عەباس و بەدەویدا ئەسوڕێنەوە.

﴿ فَلَمّا أنْجاهُمْ إذاهُمْ يَبْغونَ في الأرض بِغَيرِ الْحَقّ ﴾دووایی کـاتیٚ مـن ئـەوانم ڕزگـار کرد لـەو شتانەی ئەوان لـیٚی ئەترسان و ئەترسان بخنکیٚن کەچی کوتوپڕ ئەو کەسـانە دژی پەیمان و بەلّیٚنەکانی حۆیان ئەوەستان بـەناڕەوا لـەزەویدا دریـٚژە ئـەدەن بەسـتەماکاری و ئەچنەوە بۆ سەر کارە خراپەکانیان.

﴿ يا أيُّها النّاسُ إنَّما بغيكم عَلى أنْفُسِكُمْ متاعَ الْحَياةِ الّدنيا ﴾ ئەی ئادەمیزاد:بەڕاسـتی ستەم کردنـی ئیـٚوە هـەر لـەسـەر خۆتانــە. ئیـٚـوە ڕابویـٚـرن بـەڕابواردنی زیندەگـانی جیهان،ڕابواردن و خۆشیان ماوەی کورتەو ئەنجامەکەی پەشیمان بونەوەیە.

﴿ ثُمَّ إلَيْنا مَرْجِعَكُمْ فَنُنَبِئُكُمْ بِما كُنْتُمْ تَعْمِلُونَ ﴾ لەپاش ئەو ڕابواردنەتان گەڕانــەوەتان هەر بۆلای ئیٚمەیە، ئەو خۆشییەی جیهانتان ئەبیٚتە هـۆی داخ و خەفـەت بۆتـان لـەڕۆژی دواییدا، دوایی ئیٚمە هەوالٚ ئەدەین بە ئیٚوە بەشـتیٚ ئیـٚوە ئەیکـەن، بـەگویٚرەی کـردەوەی خۆتان پاداشت و تۆلّـە وەرئەگرن.لـەپاش ئەوەی لـەپیٚشەوە باسی هـاندانی ئـادەمیزاد کـرا بۆلای پاداشتی پاشەڕۆژ و لـە کەم کردنەوەی ژیانی خراپـی جیـهان، لـەمـەو پـاش باسـی شیٚوەی هەردوو جیهانمان بۆ ئەکریٚ لـەلایەن خوای مەزنەوە و ئەفەرمویٚ :

إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٥﴾

﴿ إنّما مثلُ الْحَياةِ الدُّنْيا كَماءٍ أنْزَلْناهُ مِنَ السّماءِ ﴾ بەڕاستی زیندەگانی جیهان کە کتوپڕی کۆتایی پێ دێ وێنەی ئەو ژیانە وەك ئاوێ وایە کە ئێمە ناردومانەتە خوارەوە لەئاسمان.

﴿ فَاختَلَطَ بِهِ نَباتُ الأرْضِ مِمّا يأكُلُ النّاسَ وَالأنْعامُ ﴾ دووایی گیاو ڕوەکی زەوی دێت بەیەکاو هەندێکیان تێکەڵاوی هەندێ تریان ئەبن لەبەر زۆریان لەهەمو جۆرە گیایەکی قەشەنگ سەوز ئەبێ ئەو شتەی ئادەمیزادو چوار پێکان ئەی خۆن بەووشکی و بەتەڕی بەهۆی ئاوەوە.

﴿ حَتى إذا أخَذَت الأرْضُ زَخْرَفَها وَازَّيَّنَتْ ﴾ هەتا کاتێ زەوی جوانی و ڕازاوەی خۆی وەرئەگرێ بەڕەنگێکی جوانی جۆرا جۆر و خۆی ئەڕازێنێتەوە بەوێنەی بوکێ بەرگ و شخڵی ڕەنگاو ڕەنگی دابێ لەخۆی لەزێڕو زیوو یاقوت و ئەڵماس، ئامادەکرابێ بۆ گواستنەوەی بۆلای زاوا.

﴿ وَظَنَ أهْلُها أنهُمْ قادِرُونَ عَلَيْها ﴾ وە دانیشتووانی زەوی گومان ئەبەن کەبەڕاستی ئەوان توانایان هەیە بەسەر درەوکردن و لابردنی بەرهەمەکانی زەوی و سود لێ وەرگرتنیان.

﴿ أتاها أمْرُنا لَيْلاً أوْ نَهاراً فَجَعَلْنا ها حَصِيْداً كأنْ لَّمْ تَغْنِ بالأمْسِ ﴾ کتو پڕ لەناکاودا فەرمانی ئێمە دەرئەچێ بۆ لابردنی سەوزایی و ڕوەکی ئەو زەویە لەشەودا یا لەڕۆژدا ئێمە بەروبومی ئەو زەویە ئەکەین بەوێنەی زەوییە درەوی کشت و کاڵ و سەوزایی و ڕووەکی کرابێ بەجۆرێ وەك ئەوەی دوێنێ نەدرەخت و نەگیاو نەسەوزایی تێدا نەبوبێ و دانەنرابێ و نەوەستابێ لەسەر ئەو زەویە هیچ ڕوەکێ .

﴿ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الأياتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكّرُونَ ﴾ هەر بەو جۆرەی ئێمە ڕونمان کردەوە وێنەی زیندەگانی جیهان و پێمان ناساند ئێمە ڕونی ئەکەینەوە تواناو نیشانەی ڕونی خۆمان بۆ تاقمێ بیر بکەنەوە هەتا بۆیان دەرکەوێ زیندەگانی جیهان بەرەو نەمانە، ئەو کەسەی دڵی بەجیهانەوە بەسترابێ وەك کەسێ وایە زۆری تینو بێ و لەدورەوە شەپۆلی ببینێ و وابزانێ

ئاوەکە چی سەری لەهیچەوە دەرئەچیٚ. کەواتە جیهان و سامانی جیهان وەك بلّقی گەرما وایە لەدورەوە وا ئەزانریٚ ئاوە، نابیٚ نرخی بۆ دابنریٚ و جەنگی بۆ بکریٚ و خویٚنی بۆ برژیٚ و زانایان بخەلّەتیٚنیٚ.

﴿ وَاللهُ يَدْعُوا إلى دار السَلامِ ﴾ وە خوا بانگی ئادەمیزاد ئەکاو داوایان لیٚ ئەکا بۆلای خانوی ئاشتی و بەختیاری و بۆ جیٚگەیە خراپەو ناکۆکی تیٚدانیە وەك بەهەشت کە جیٚگەی میهرەبانی خوایە. ئارامی و ریٚزی تیٚدایە بۆ دانیشووانی، ترسیان لەهیچ شتیٚ نیە.

ئەبیٚ بشزانریٚ ئەو شتانە بەجگەی پەرستنی خواو فەرمانبەرداری خواو پیٚغەمەر دەست ناکەویٚ.

﴿ وَيَهْدِي مِنْ يَّشاءُ إلى صِراطٍ مُّسْتَقيم ﴾ وە خوا ریٚگە نیشاندەرو رانمویی کەری کەسیٚکە ئارەزوی هەبیٚ بۆلای ریٚگەیە راست و دروستە کە بریتیە لەئایینی پاکی ئیسلام، خوای مەزن ئەقلٚ. ژیری داوە بەئادەمیزاد هەولٚ بەدن بۆ دۆزینەوەی ریٚگەیە بیان گەیەنیٚ بەریٚگەی سەربەرزی و بەختیاری و خۆشی شارەزیایان ئەکا، لەپاشا خوای گەورە ئەو کەسانەی بانگیان ئەکریٚ بۆلای ئایینی ئیسلام ئەیانکا بەدوو بەشەوە. باسی شیٚوەی هەریەکەیان بەگویٚرەی خۆیان و ئەفەرمویٚ :

لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ ۚ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٦﴾ وَالَّذِينَ كَسَبُوا السَّيِّئَاتِ جَزَاءُ سَيِّئَةٍ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ مَّا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۖ كَأَنَّمَا أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ اللَّيْلِ مُظْلِمًا ۚ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٧﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَاؤُكُمْ ۚ فَزَيَّلْنَا

بَيْنَهُمْ وَقَالَ شُرَكَاؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ ﴿٢٨﴾ فَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَافِلِينَ ﴿٢٩﴾ هُنَالِكَ تَبْلُوا كُلُّ نَفْسٍ مَّا أَسْلَفَتْ وَرُدُّوا إِلَى اللَّهِ مَوْلَاهُمُ الْحَقِّ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٣٠﴾

﴿ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيادَةٌ ﴾ وە بۆ کەسانێکی ئـەوتۆ هەیـە چاکـەیان کـردوە پاداشتیێ کە بەهەشتەو زۆرتر لـەو چاکەیە کە شایانی کردەوەی ئەوانبێ.

زانایان هەندێکیان لایان وایە ئەوپاداشتە زۆرە بریتیە لـەچاو پێ کەوتنی خوای مەزن بە جۆرێ شایستە ڕێزو خاوێنی خوا بێ و دور بێ لـەوێنـەو مـاوەی دیـاری کـراو بۆتەماشـا کردنی ئێمەی ئادەمیزاد بۆلای خوای مەزن. هەندێ تریان ئەڵێن: شتێ زۆرتربـێ لـەوەی شایستەی ئەو کەسانە بێ چاکەکانیان کردوەو باوەڕیان بەخواو پێغەمەر هێناوە.

﴿ وَلايَرْهَقُ وُجُوهُمُ قَتَرٌ وَّلا ذِلَّةٌ أُولَئِكَ أَصْحابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيها خالِدُونَ ﴾ وە داناپۆشێ ڕومـەتیان تـۆزی ڕەش و دوکـەڵی ڕەش و ڕسـوایی و بێباوەڕی، خۆشـی و ئاسـایش بەڕومەتیانەوە دیارە، ئەو کەسانە دانیشتوی بەهەشتن، ئەوان لـەنێو بەهەشتا بـەردەوامن و لـەخۆشیدان.

﴿ وَالَّذِينَ كَسَبُوا السَّيِّئاتِ جَـزاءُ سَيئَةٍ بِمِثْلِـها ﴾ وە کەسـانێکی ئـەوتۆ خراپـەکانیان کردوە پاداشتی ئەو خراپەیە بەوێنەی خۆیـەتی بـەبێ زۆرتـر لـەبـەر ئـەوەی خـودا سـتەم لـەکەس ناکا، بگرە زۆربەی خراپە کەران ئازاد ئەکا بەهۆی بەزەیی و میهرەبانی خۆیـەوە بەمەرجێ بەبێ باوەڕی نەمردبن.

﴿ وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ مالَهُمْ مِنْ اللّهِ مِنْ عاصِمٍ ﴾ وە هەمو لەشیان دائەپۆشێ ڕسوایی و بێ ئابڕویی. چ کەسێ بێ ڕسواترو بێنرخ تر بێ لەو کەسەی لەنێو ئەوکۆمەڵە زۆرەی ڕۆژی دووایدا ئابڕوی بچێ، نیە بۆ ئەو خراپە کەرانە هیچ کەسێ بیانپارێزێ لە سزای خواو لەخەشمی خوا.

﴿ کَأنّما اُغْشِیَتْ وُجُوهُهم قِطعاً مِنْ اللَّیْلِ مُظْلِما أولئكَ اَصْحابُ النارهُمْ فِیها خالِدُونَ ﴾ بەڕاستی وێنەی ئەوەیە ڕومەتیان داپۆشرابێ بەپارچەیە لەشەوی تاریك. یانێ دراوە بەسەر ڕومەتیاناپەردەیە لەڕەشی شەو، ڕومەتیان ڕەشە وێنەی تاریکی شەو. ئەوخراپە کەرانە داینشتووی ئاگری دۆزەخن، ئەوان لەنێو ئاگردا بەردەوامن ونایەنە دەرەوە.

لەکاتێکا خوای گەورە ڕوونی کردەوە سزاکانیان، ڕونیشی ئەکاتەوە کاتی ئەو سزادانەیان وئەفەرموێ :

﴿ وَیَوْمَ نَحْشَرُوهُمْ جَمْیعاً ثُمَّ نَقُولُ لِلَذِیْنَ اشرَکُوا مَکانَکُمْ أنْتُمْ وَشُرَکاؤُکُمْ ﴾ و لەڕۆژیکا ئێمە کۆئەکەینەوە بونەوەران هەموویان بەهەردووتاقمەکەوە لەپانایی ڕۆژی دوایيدا، لەپاشا ئێمە ئەڵێین بەکەسانیکی ئەوتۆ هاوبەشیان داناوە بۆ ئێمە: بوەستن ومەجوڵێن لەشوێنی خۆتانا هەتا پرسیارتان لێ ئەکرێ ئێوە وهاوبەشەکانی ئێوە کەبەگومانی خۆتان هاوبەشی خوان، ڕوبەڕوی یەکتری ببنەوە، بۆ ئەوەی هەمو تاقمێکمان بەڵگەو بیانوی خۆتان بنوینن، بەبێگومان لەدوايیدا هاوبەش دانەرەکان و تاوانباران دائەبڕێن لەهاوبەشەکان کەوایان ئەزانی لەوڕۆژەدا سودیان پێ ئەگەیەنن، بۆیان ڕون ئەبێتەوە لەسەر ڕێگەی خراپ بوون کەباوەڕیان بە خواو بە پێغەمەر نەهێناوە .

﴿ فَزَیَّلْنا بَیْنَهُمْ ﴾ دوایی ئێمە جوێ ئەکەینەوە لە نێوانی ئەوان وخواکانیان و پەیوەندیان لەیەك ئەپچڕێ. یانێ خوای مەزن لەڕۆژی دوایيدا جیاوازی ئەخاتە نێوان هەموو بونەوەران هەریەکەیان بەوشێوەیە لەسەری بوون، هەموکەسێ بەگوێرەی کردەوەی خۆی مافی خۆی بۆڕون ئەبێتەوە، لەوکاتەدا بت پەرستان بۆیان دەرئەکەوێ هیچ کەسێخاوەنی زیان و سود نیە بۆیان مەگەر ئەوکەسانە بەباوەڕەوە مردوون، هەمو شتێ بەدەستی خوای گەروەیە بەتەنها .

﴿ وَقالَ شُرَكاؤُهُمْ ماكُنْتُمْ إيانا تَعْبُدونَ ﴾ وەهاوبەشـەكانی بـت پەرسـتان كەبتـەكانن ئەڵێن: ئێوە ئێمـەتان نەپەرسـتوە وەهـەواو هەوەسـی خۆتانتـان پەرسـتوە. ئـەورِوداوەیش لـەكاتێكا ئەبێ كەلەرِۆژی دواییـدا بـت پەرسـتان و هاوبەشـەكانیان رِوبـەرِوی یـەكتری ئەوەستن. خواكانیان بەبت پەرستان ئەڵێن: ئێوە بۆ ئێمە بت پەرسـتنتان نـەكردوە. بـەڵام لـەمێشك وگومانی خۆتانا واتان دانابو خوا هاوبەشی هەیە، لەرِاسـتیدا ئێمـە هاوبەشـێكین خاوەنی بونی خۆمان نین مەگـەر لـەمێشـكی ئێـوەدا هـەبین.كەواتـە ئێـوە هیـچ شـتێكتان نەپەرستوەو ئێمەتان نە پەرستوە مەگەر ئارەزوی خۆتان .

﴿ فَكَفى بِاللهِ شَهيداً بَيْنَنا وَبَيْنَكُمْ إنْ كُنّا عَنْ عِبادَتِكُمْ لَغافِلِيْنَ ﴾ دوایـی خـوا بەتەنـها بەسە ئاگاداربێ لـە نێوان ئێوەدا، خوا ئەیزانێ ئێوە بە بـێ بەڵگـە و بـە درۆ لـە مێشـكی خۆتانا هاوبەشتان داناوە بۆ خواو ئەزانێ ئێمـە لـەئێوە بێزاربین، بەرِاستی ئێمـە ئاگامـان لەپەرستنی ئێوە نیە بۆ ئێمە، هیچ شتێ لەوباوەرِەوە نازانین، ئێمە شایانی پەرستن نـەبووین، ئێمە بەندەو دروست كراوی خواین .

﴿ هُنالِكَ تَبْلُوا كُلُّ نَفْسٍ ما أسْلَفَتْ ﴾ لەوجێگەو لــەو كاتـەدا هـەموو كەسـێ تـاقی ئەكاتەوەو ئـەزانێ بەشتێ پێشـیان خسـتوە بـۆ خۆیـان لەچاكـەو لەخراپـە لەجیـهاندا، هەموویانیان بۆ رِون ئەبێتەوە لەهەموولایەكەوە .

﴿ وَرَدُوا إلى اللهِ مَوْلاهُمُ الْحَقِّ ﴾ وە ئەگێرِێنرێنەوە بۆلای ئەو پاداشتە ئەوان بۆ خۆیان پێشیان خستوە خوا بەرِێوەبەری رِاستی كاروباری ئەوانەو ئـەو هـەڵیان ئەسورِێنێ، هیـچ كەسێ خاوەنی فەرمان نیە جگەی ئەو خوایە بەتووانایە و رِاستە .

﴿ وَضَلَّ عَنْهُمْ ماكانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ وەوونبوە لەوان و لـەكیسیان چوەشتێ ئـەوان درۆو بوختانیانی پێوە ئەكەن كەهاوبەی خوان بۆمان ئەپارِێنەوە لای خوا كەبریتین لـەبتەكانیان.

ئەوشتانەی كەبنچینەن بۆ باوەرِی رِاستی لای خوای مەزن سـێ شـتن: یـەكێتی خـوا. پێغەمەرایەتی پێغەمەران. زیندوبونەوەلەرِۆژی دواییدا. لەوئایەتانەی پێشوداو لەم ئایەتانەی دواییـدا ئەوسێشـتانە رِوون كراونەتـەوە، لەوئایەتانـەدا هاوبەشـدانان بـۆ خـوا پـوچ

کراونەتەوە، هەر گومان بردنیٚ بەوەی ئەوبتانەی لایٚ خوا بۆیان ئەپاڕێنەوە پوچ کراونەتەوە، ئەوگومانەیشیان کە زیندوبونەوە نیەو قورئانیش دانراوی موحەمەدە پوچ کراونەتەوە، بۆ پوچ کردنەوەی ئەوشتانە خوای مەزن ئەفەرمویٚ :

قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓا۟ أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣٤﴾

﴿ قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَّ السَّماءِ وَالأَرْضِ﴾ تۆ بلێٚ چ کەسێکە خواردەمەنی بدابە ئێوەو بتان ژێنیٚ لەئاسمانەوە بەهۆی ناردنی بارانەوە کەئەڕوێنیٚ دانەوێڵە وگژوگیا و درەخت و ، لەزەویشەوەبەڕوواندنی گیاو ئاو بۆخواردنەوەی خۆتان و گیانەوەران و ئاژاڵتان ، بەدروست کردنی کانەکان، لەزێڕو زیوو نەوتو ئەڵماس وشتی ترو بەرهەم ومیوەی جۆراوجۆر لەتام و لەرەنگەوە وسودی تریش .

﴿ أَمْ مَنْ يَمْلَكُ السَمْعَ وَالابْصار ﴾ ئایا چ کەسێکە خاوەنی گوێچکەو چاوەکانی ئێوەوەیەو دروستی کردون وپاراستونی لەڕوودانی نالەبار، توانایشی هەبێ دروست بکا ئەو هەموشتانە لەواندان کەئەبنەهۆی ژیانتان و سوود وەرگرتن و، بیان خەنە گەڕەوە، زۆر ڕونەو هەر بەگوێچکەو چاوەکانەوە خۆتان ئەپارێزن لەئازارو ناخۆشی، هەرشتێ گوێچکەو چاوی نەبێ زیندەگانیەکەی بێسودە بەشێوەیە شایانی زانیاری وزانین بن. هەربەوان پیت وفەڕدەر ئەهێنرێ لەقولایی زەوییەوەو بڕۆن بۆ ئاسمانەکان ودورایی زەوی و بۆشایی ئاسمانەکان بپشکێنن وقولایی دەریاکان دیاری بکەن و بڕۆن بەسەر زەریاکانا.

﴿ وَمَنْ يَخْرُجُ الحَيَّ مِنَ المَيِّتِ وَيَخْرُجُ المَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ ﴾ وەچ کەسێکە توانای هەبێ دەربهێنێ زیندوویەکی خاوەن گیان وگەشەکەرو جموجوڵ کەرو خاوەن هەست لە مردوویەکی بێگیان و بێگەشەو بێ جم وجوڵ و بێهەست، توانای هەبێ گیان بکا بەبەری زیندەوەراندا و لەئەنجامدا بیان مرێنێ، ئەوانەیش وەك دروست کردنی ئادەمیزادە لەتۆوی پیاو ژن، دروست کردنی گیا لەدانەوێڵەی ووشك، توانای هەبێ دەربهێنێ مردویە لەزیندوێ، وەك دەرهێنانی تۆو لەگیانەوەران. دانەوێڵەی ووشك لەگژوگیای خاوەن گەشەو خاوەن جم و جوڵ .

﴿ وَمَنْ يُدَبِرُ الآمْرَ ﴾ وەچ کەسێکە هەڵبسوڕێنێ کارو فرمانی بونەوەرانو بیانبا بەڕێوەو هەموو پێویستیان بەم شیوە ڕێك وبێ وێنەیە، تووانای هەبێ خواردەمەنی دروست بکا لەنێو زەویداو دەری بهێنێ بۆ زیندەوەران و کەسی لەبیر نەچێ. چ کەسێ بێ بەڕێوە ببا کارو فرمانی زەوی و ئاسمانەکان بەوشیوە نەگۆڕاوە. هەرکاتێ ئەوپرسیارانە لەبت پەرستان بکرایە .

﴿ فَسَيَقُولُونَ اللّٰهُ ﴾ دوایی ئەڵێن: خوایە ئەو هەموە کارانە ئەکا لەگوێچکەو چاوو خواردەمەنی دەرهێنانی خاوەن گیان وبێگییان لەیەکتری و هەڵسوڕێنەری پێویستی هەمو بونەوەران کەچی لەخەشمی خوا ناترسن و ئەڵێن : ئەوبتانە هاوبەشی خوان و بۆمان ئەپارێنەوە لای خواو نزیکمان ئەکەنەوە لەخوا ، هیچ شەرم ناکەن لەوکردەوانەی خۆیانا کەدژی یەکترین .

﴿ أفَلا تَتَّقُونَ ﴾ ئایـا دوایـی ئێـوە لـەخواو سـزای خـوا ناترسـن و ئەوبتانـە ئەکـەن بەهاوبەشی خواو لاتان وایە کەخوا هەر بەتەنها دروست کەری بونەوەرانـە، چـۆن لاتـان وایە سود وەرگرتنتان بەهۆی بتەکانەوەیە نەك بەدەستی خوایە .

﴿ فَذَلِكُمْ اللهُ رَبُّكُمْ الْحَقُّ ﴾ دوایـی هەرکەسـی خـاوەنی ئەوتوانایـە بـێ هـەر خـوای پەروەرگاری ئێوەیە راست و بەردەوامە پەروەردەکەریەکە ناگونجێ جگەی ئەوکەسـی تـر پەرستراوبێ .

﴿ فَماذا بَعْدَ الْحَقِّ إلا الضّلالُ ﴾ دوایی نیە ڕاستی مەگەر ڕێگە لێ ونبون. هەرکەسـێ بازبدا بە سەر ڕاستیەکان کەپەرستنی خوایە ئەکەوێتـە نێـو گومڕاییـەوە، خـوای مـەزن ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوون و دایناون لـەنێو ئـەواندا هـۆی ژیـان، گوێچکـەو چاوەکانی دروست کـردوون کەبـەهۆی ئەوانـەوە ئـادەمیزاد ڕێگـەی زانـین و زانیـاری ئەدۆزنەوە، هەرخوایشە خاوەنی مردن و زیندەگانی، بونەوەران هەمویان بەڵگـەن لەسـەر توانای گەورەی خوا .

﴿ فَأنّى تُصْرِفُونَ ﴾ دوایی ئێوە بۆ واز لەڕاسـتی دێنـن، هەتاکـەی واز نایـەرن لـەبت پەرستی و بەرەو یەکێتی خوا نارۆن و ڕێگەی ڕاست نادۆزنەوە .

﴿ كَذلِكَ حَقَقَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ عَلَـى الذِيـنَ فَسَـقُوا أنَـهُمْ لايُؤمِنُـونَ ﴾ هـەروەك ڕاسـتە بەڕێوەبەرایەتی خواو دووای ڕاستی هەر کومڕاییە و واز لەڕاستی ئـەهێنن، هەربـەوجۆرە فەرموودەی و فەرمان دانی پەروەردگاری تۆ ڕاستە لەسەر سـزادانی کەسـانێکی ئـەو تـۆ لایان داوە لەسنوری ڕاسـتی و یـاخی بـوون لـەبەرئـەوەی بەڕاسـتی ئـەوان یاوەڕنـاهێنن بەیەکێتی خواو پێغەمەرایەتی موحەمـەد. لـەبەرئـەوەی هـەموو جـۆرە بەڵگـە و نیشـانەی ڕونیان بۆ دانراوە بۆ دوزینەوەی ئـایینی ڕاسـت ئـەوان ڕویـان وەرگـێڕاوە لـەئاین و بـێ باوەڕیان هەڵبژاردووەو بەبێ باوەڕی مردوون.

﴿ قُلْ هَلْ مِنْ شُرَكائِكُمْ مَنْ يَبْدأ الْخُلْقَ ثُـمَ يُعيـدُهُ ﴾ تۆبڵـێ: ئایـا کەسـێ لەهاوبـەش دانەرەکانی ئێوە لـەو بتانە ئێوە ئـەیان پەرسـتن یەکـەم جـار لەنەبونـەوە دەسـت بکـا بـە

دروست کردنی بونەوەران لەپاشا جاریّ تر زیندوویان بکاتەوە لەدووای مردنیان. بەبیّ گومان خوای مەزن ئەو تووانایەی هەیە ئیّوە وەلاّمتان چیە ؟ لەوکاتەدائەوان وەلاّمی دەرئەبرِن و سەرشۆرِ ئەبن .

﴿ قُلْ اللَّهُ يَبْدأ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعيدُهُ ﴾ تۆ بلّیّ : بەلّیّ خوا بۆ یەکەم جار دەستی کردووە بەدروست کردنی بونەوەران لەپاشا زیندوویان ئەکاتەوە دوای مردنیان بۆ جاری دووهەم وەك جاری یەکەم .

﴿ فأنى تُؤفَكُونَ ﴾ دوایی ئیّوە چۆن لادراون لەنیازی رِیّگەی رِاست کەیەکیّتی خوایە، بەرەو رِیّگەی نارِاست و خوارو خیّچ رِوئەنیّن و ووشەی رِاست بەدرۆ ئەخەنەوە ؟

خوای مەزن رِوی فەرمودەی خوا ئەکا بۆلای پیّغەمەر و ئەفەرمویّ: بەبت پەرستان بلّیّ: ئەو کەسە سایشتەی پەرستنبیّ و رِیّگەنیشان دەربیّ بۆ لای رِاستی، داوای یارمەتی و کۆمەکی لە هیچ کەسیّ‌نەکا هەر خودایە، ئەو پەرستراوانەی ئیّوە شایانی ئەو شتانە نین و بیّ دەستەلاّتن بۆ خوایەتی ناشیّن، بۆیە خوای مەزن ئەفەرمویّ :

قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِيٓ إِلَى ٱلْحَقِّ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِي لِلْحَقِّ أَفَمَن يَهْدِيٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّيٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٥﴾ وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ

فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِمَا لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾

﴿ قُلِ هَلْ مِنْ شُرَكائِكُمْ مَنْ يَهْدى إلى الْحَقِ ﴾ تۆبلێ بەبت پەرستان: ئایا لەهاوبەشەکانی ئێوە کەسێ هەیە شارەزایی ئادەمیزاد بکا بۆ لای ڕێگەی ڕاست، بتوانێ بەڵگەو نیشانە دانێ بۆدۆزینەوەی هۆی ڕزگاری و ڕێگەی چاکە ؟ بێگومان ناتوانن ئەو وەڵامە بدەنەوە چونکە بتەکانیان بەردێکی کوێر و کەڕن. بەوبۆنەوە کەپێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ خاوەنی بەڵگەی بێگومانە لەسەر ئەوە کە هەرخوا بەڕاستی ڕێگە پیشاندەرە بۆ لای ڕاستی خوا فەرمانی خۆی ئاڕاستەی پێغەمەر ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ اللهُ يَهْدِي إلى الحَقِ ﴾ تۆ بلێ بەوان هەر خوا ڕێگە نیشان ئەدا بۆلای ڕێگەی ڕاست، یارمەتی لەهیچ کەسێکەوە وەرناگرێ. بەڵام جگەی خوا ڕێگەی ڕاست بۆخۆیان ئەدۆزنەوە نە بۆ جگەی خۆیان، ئیتر جگەی خوا هەرکەسێ تر بێ لەفریشتەکان وعیساو عوزەیرەوە .

﴿ أفَمَنْ يَهْدِي إلى الْحَقِ أحَقُّ أنْ يُتبعَ أمَنْ لايَهدى إلا أنْ يُهْدى ﴾ دوایی ئایا کەسێ کەشارەزای ئادەمیزاد بکا بۆ لای ڕێگەی ڕاست شایستەیە کە پەیڕەوی بکرێ و دوای بکەوێ و چاوی لێ بکرێ کە خوای مەزنەو پێویستی بەکەسیتر نیە یاکەسێ ڕاغویی وەرنەگرێ و نەتوانێ ڕێگە بۆ خۆی و جگەی خۆی بدۆزێتەوە مەگەر شارەزایی بکرێ و ڕێگەی پیشان بدرێ. بەتایبەتی ئەو پەرستراوانەی ئێوە نە شارەزایی وەرئەگرن و نەئەیشتوانن ڕێگە بەجگەی خۆیان نیشان بدەن چونکە بەردو درەختی بێگیان و ڕەق و تەقن .

﴿ فَما لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴾ دوایی چ شتیّ بۆ ئێوە هەیە لەپەرستنی بتەکان خاوەنی زیان وسود نین ئێوە چۆن فەرمان ئەدەن کەسیّ پێویستی بەهیچ شتیّ نەبیّ وەك خوا بیکەن بەهاوتاو بەوێنەی شتیّ لەهەمو ڕویێکەوە پێویستی بەجگەی خۆی هەبیّ، ئێوە چۆن بەرانبەری یەکیان دائەنێن، چۆن باوەڕئەهێنن بەوشتە پڕوپوچانەو لەڕێگەی ڕاست لائەدەن لەگەڵ ئەوهەموە بەڵگە ئاشکرایانە لەسەر پوچی و بیّ‌نرخی ئەوان .

﴿ وَما يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلا ظَنّاً ﴾ وەزۆرتر لەوبت پەرستانە دوای هیچ شتیّ ناکەون مەگەر هەر دوای گومانیّ ئەکەون کە هیچ سودیّ نابەخشیّ و ئەوان دووای لاسایی باوباپیرەکانیان ئەکەون، بیّ ئەوەی ئاگاداری ناوەڕۆکی پوچی ئەوپەرستراوانەی خۆیان بن، کەمێکیان لەناوەڕۆکیان گەیشتوون، بڕوایان بەڕاستی موحەمەدو پێغەمەرایەتی ئەو هەیە، زۆر چاك ئەزانن ئەوبتانە هیچ ڕێزیان نیە. بەڵام لەبەر مانەوەی پلەو پایەو سودی تایبەتی خۆیان ڕولەراستی وەرئەگێڕن بەپێچەوانەی زۆربەی زۆری بت پەرستان وائەزانن بتەکانیان خاوەنی سوود و زیانن بەگوێرەی ئەو گومانەی خۆیان. لەباسی مانای ئایەتی (١٧٠) ی سورەتی ئەلبەقەرەدا بەدرێژی باسی لاسایی کردنەوەی باوباپیران کراوە .

﴿ إِنَ الظَنَّ لايُغنى مِنَ الْحَقِ شَيْئاً ﴾ بەڕاستی گومان سوود ناگەیەنیّ هیچ شتیّ لەڕاستی و زانین و لەباوەڕپیّ‌کردن، گومان و گۆترەکاری تووانی ئەوەیان نیە لەجێگەی زانیاری و بیّ‌گومانیدا دانرێن و ڕاستیان پیّ بدۆزرێتەوە .

بۆ زانین: گومان وگۆترەکاری بۆ دیاری کردنی بنچینەی ئایین و یاساو دەستور هیچ نرخێکی بۆ دانانریّ. بەڵام دوواکەوتنی گومان بۆ کاروباری ژیانی جیهان بۆ کشت وکاڵ وبازرگانی قەدەغەنەکراوە لەلایەن ئایینەوە. ئەگەر قەدەغەبکریّ هۆی گوزەران ئەوەستیّ بۆ دانیشتووان، خراپەیشی تێدانیە بڕوای بێگومان پەیدا بکەن بۆ بەدەست هێنانی بەرهەم و پەیداکردنی خواردەمەنی، بگرە جۆرە پشت بەستنێکە بەخوا کەیارمەتیان ئەدا بۆ ئەو مەبەستە .

﴿ إنَ اللهَ عَلِيمٌ بِما تَعْمَلُونَ ﴾ بەڕاستی خوا ئەزانیٚ بەشتیٚ ئەوان ئەیکەن لەپەیڕەوی کردنی بتەکانیان بەهۆی گومانی پوچیانەوە و وازهێنانیان لەبەڵگەو نیشانەی ڕون، ئەو ڕستەیە هەڕەشەی توندە بۆ بت پەرستان کەدوای گومان ئەکەون .

﴿ وَماكانَ هَذا القُرأنُ أنْ يُفْترَى مِنْ دُونِ اللهِ ﴾ وەئەو قورئانە شایستەی ئەوەنیە کەبەبوختان دروست کرابیٚ لەلایەن جگەی خواوە بەو هەمووە بەڵگەو نیشانە پەك خەرانەوە کەدانراوی ئادەمیزاد بیٚ. بەڵکو لەلایەن خوای مەزنەوە هاتوەتە خوارەوە لەتوواناى جگەی خوادا نیە وێنەی ئەو قورئانە دابنریٚ .

﴿ وَلَكِنَ تَصْديقَ الذى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيْلَ الكِتابِ ﴾ وەبەلاّم ئەو قورئانە ڕەوانەکراوە بۆ سەر پێغەمەر ڕاست گێڕێکی ئەوتۆیە وبڕواپێکردنە بۆ ئەو نامانەی بەرلەقورئان نێراون ڕون کردنەوەو پەرەپێدانەو درێژە پێدانە بۆ نامەی خوا لەبڕواکردن بەپەیامی خواو دیاری کردنی یاساو دەستوری خوا بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری ئادەمیزاد لەبەختیاری هەردوو جیهان و پیویستیان بەجگەی قورئان نەمێنیٚ .

﴿ لارَيْبَ فِيهِ مِنْ رَّبِ العْالَمِيْنَ ﴾ گومان لەو قورئانەدا نیە لەلایەن پەروەردگاری هەمو بونەوەرانەوە هاتوەتە خوارەوە. کەواتە شایستەی مرۆڤی ژیر نیە گومانی هەبیٚ لەنامەی خوادا. بەڕاستی لەو قورئانەدا هەیە کاری پەك خەرو نیشانەی زۆر ڕون لەسەر ئەوەی کەلەلایەن خواوۆ هاتوە.

﴿ أمْ يَقُولُونَ افتَراهُ ﴾ بەڵکو بت پەرستان ئەڵێن: موحەمەد خۆی ئەو قورئانەی هەڵبەستوە، بۆ دەم کوت کردنی ئەوان خوای مەزن ئەفەرمویٚ :

﴿ قُلْ فَأْتُو بِسُورةٍ مِثْلِهِ ﴾ تۆ بڵیٚ بەو بیٚباوەڕانە: ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن ئەو قورئانە دانراوی موحەمەدە، دوایی ئێوەیش بهێنن سورەتیٚ وێنەی ئەو قورئانە بیٚلەزمان پاراویدا ولەڕێك وپێکیدا خۆتان بەعەرەبی زان ئەزانن .

﴿ وَادعُوا مَنْ اِستَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللهِ إنْ كُنتُمْ صادِقِيْنَ ﴾ وەئێوە بۆ دانانی وێنەی ئەو قورئانە هەر کەسیٚ تواناتان هەیە بانگی بکەن لەجگەی خوا بۆ یارمەتیدانتان ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن کەئەو قورئانە هەڵبەستراوی موحەمەدە بەگوێرەی گومانی خۆتان .

﴿ بَلْ كَذَّبُوا بِما لَمْ يُحِيْطُوا بِعِلْمِهِ ﴾ بەڵكو ئەوبت پەرستانە تۆ بەدرۆ ئەخەنەوە بەشتێ ئەوان نایزانن وپێی نەگەیشتون کەقورئانی پێ بزانن، قورئان ئەبیسن و بیری لێناکەنەوەو پێشەکی دژی ئەوەستن .

بێگومان زانای ژیرو خاوەن ئەقڵ هەنگاوێ نانێ هەتا ووردنەبێتەوە لەوشتەی دێت بۆلای. بەووردی لەجێگەی شیاوی خۆیا دای نێ، بۆیە مرۆڤیژیر دوژمنی شتێکە نایزانێ.

﴿ ولَما يَأتِيَهُمْ تَاوِيلُهُ ﴾ وەهێشتا نەهاتوە بۆ لای ئەوان ماناو مەبەستی قورئان و بەرلەوەی بیزانن لێی تێبگەن لەچۆنیەتی مانای قورئان بەدرۆی ئەخەنەوە بەگۆترەو گومان. ئەگەر ئامۆژگاری قورئان و وانەکانی قورئانیان بزانیبایە باوەڕیان پێ ئەهێنا .

﴿ كَذلِكَ كَذَّبَ الذِيْنَ مِنْ قَبْلِهِمْ ﴾ هەروەك ئەو بت پەرستانەی سەردەمی تۆ قورئان بەدرۆئەخەنەوە هەروایش گەلانێکی ئەوتۆ لەپێش ئەوانەوەبوون بەدرۆیان خستوەتەوە پێغەمەرونامەکانیان .

﴿ فأنْظُرْ كَيْفَ كانَ عاقِبَةُ الْظالِمِيْنَ ﴾ دوایی تۆ تەماشاکەو بنوارە بەچ جۆرێ بوە پاشەڕۆژی ستەمکاران و چۆن لەناوچون بنەبڕبون، هەروایش ئەبێ ئەنجام و کۆتایی ئەوانەیش تۆ بەدرۆ ئەخەنەوە.

لەپاشا خوای مەزن هەندێ لەوکەسانە بەدرۆیان خستوەتەوە قورئان، وایان داناوە کە هەڵبەستی موحەمەدە، ئەیانکا بەدووبەشەوە، وەك ئەفەرموێ :

وَمِنْهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِۦ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤٠﴾ وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٤١﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٢﴾

وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تَهْدِي الْعُمْيَ وَلَوْ كَانُوا لَا يُبْصِرُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ النَّاسَ شَيْئًا وَلَٰكِنَّ النَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾

﴿ وَمِنهُمْ مَنْ يُؤمِن بِهِ ﴾ وەهەندێ لەخزمانی تۆ ئێستا بەدرۆئەخەنەوە کەسێ لەمەودواباوەڕ بەقورئان ئەهێنن لەدەرونی خۆیا ئەزانێ قورئان لەلایەن خواوە هاتوەتە خوارەوە، دەست هەڵبەستی موحەمەد نیە. بەلاّم لەبەر لوت بەرزی باوەڕەکەی دەرنابڕێ، هەر لەم بەشە هەیانە بەدڵی پاکەوە باوەڕئەهێنێ و ئاشکرای ئەکا بەدڵێکی بێگەردەوە.

﴿ وَمِنهُمْ مَنْ لايُؤمِن بِهِ ﴾ وەهەندێ لەبێباوەڕان هەن کەسێ باوەڕناهێنن بەقورئان بەهۆی نەزانینەوەو بەهۆی لاسایی کردنەوەی پێشوەکانیانەوە.

﴿ وَرَبُّكَ أعْلَمُ بِالْمُفْسِدِيْنَ ﴾ وەپەروەردگاری تۆ زاناترە بەوکەسانەی خراپەکارنو بەردەوامن لەسەر بێباوەڕی وبلاّوکردنەوەی بێباوەڕی. ئەوڕستەهەمو خراپەکاران ئەگرێتەوە هەرلەوانەی سەردەمی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەوانەیش لەمەوپاش دێن هەتا کۆتایی جیهان .

﴿ وَإنْ كَذَبُوكَ فَقُلْ لِي عَمَلْي وَلكُمْ عَمَلُكُمْ ﴾ وەئەگەر ئەوکەسانە باوەڕیان بەتۆ نەهێناوەو تۆیان بەدرۆخستوەتەوە، دوایی تۆ بەوان بڵێ: بۆ منە سودی کردەوەی خۆم و بۆ ئێوەیشە تۆڵەو سزای کردەوەی خۆتان.

﴿ أنْتُمْ بَرِيْئُونَ مِما أعْمَلْ وَأنا بَريءٌ مِمّا تَعْمَلُونَ ﴾ ئێوەبێزارو هەراسانی لەشتێ من ئەیکەم لەخواپەرستی. کەواتە ئێوە تانە لەمن مەدەن و سەرزەنشتم مەکەن و، منیش بێزارم لەوکردەوانە ئێوە ئەیکەن لەبت پەرستی. کەواتە منیش تانە لەئێوەنادەم.

پرسیار/ زۆر لەدانیشتوان پرسیار ئەکەن و ئەڵێن: منداڵەکانمان شەپۆلی شارستانیەتی تازە وای لێکردوون تەمەڵ و سستن لە بەجێ هێنانی کارو پێویستی ئایین، بگرە پەنا بەخوا باوەڕیان بەئایین نیە لەوباوەڕەوە چارەی باوك چ شتێکە ؟.

وەڵام/ پێویستە لەسەر باوك مناڵەکانیان لەتەمەنی بچووکیدا بەگوێرەی یاسای ئایین ڕامیان بکاو پەروەردەیان بکا لەسەر پێویستیەکانی ئایین، وێنەی نوێژ و ڕۆژ و قەدەغەکراوەکانینا پێبناسێنن، دزی و دوزمانی وخواردنەوەی مەی و هەموجۆرەکانی و قومارکردنیان لێ قەدەغەبکەن، لەپاش گەورەبونیان باوك بەرپرسیار نیە جگە لەترساندن و موژدەدان بەئەنجامی پاشەڕۆژ و چارەیەتریان بۆ نیە .

﴿ ومِنهُمْ مَنْ يَسْتَمِعْ إِلَيْكَ ﴾ وەهەندێك لەبێباوەڕان کەسێ گوێ ئەگرێ بۆ ئامۆژگاری تۆ لەوکاتانەدا قورئان ئەخوێنیو فێری فەرمانەکانی قورئان ئەبن. بەلاّم جێگەی خۆیان ناگرن لەدڵیاناو فەرامۆشی ئەکەن هەروەك نەیان بیستبێ وخۆیانی لێ کەڕئەکەن و سودی لێ وەرناگرن .

﴿ أفأَنْتَ تُسْمِعُ الصُّمّ وَلَوْكانُوا لايَعْقِلُونَ ﴾ دوایی ئایا تۆ توانای ئەوەت هەیە قورئان بەو ببیسێنیێ بەجۆرێسودی لێ وەربگرن، تۆ لەتواناتا نیە گێل و بێهۆشان ئاگادر بکەیتەوەو فێری چاکەیان بکەی، ئایا تۆ ئەتوانی و، ئەگەر چی ئەوان خاوەنی ئەقڵو زانین بن و وەرنەگرن فەرمودەی خواو قورئان، بۆ کەسێ سودی هەیە ژیربێ، ئەوانە بێ ئەقڵ و نەفامن .

﴿ وَمِنْهُمْ مَنْ يَّنْظُرُ إِلَيْكَ ﴾ وەهەندێك لەبێباوەڕان کەسێ ئەڕوانێ بۆلای تۆوبەڵگەو نیشانەی پێغەمەرایەتی و ڕاستی تۆ ئەبینێ. بەلاّم ڕێز و پلەی تۆ نابینێ و نایەوێ بیان بینێ بەجۆرێ سودی لێ و ەرگرێ. ئەوانە وەك کوێر وانە .

﴿أفأنْتَ تَهْدي الْعُمَيْ ﴾ ئایا دوایی تۆ توانات هەیە ڕێگەنیشان بدەی بەکەسێ کوێربێ و شارەزای بکەی بەجۆرێ قازانجی لێ بکا، ئەو قورئانە ببینن و ئامۆژگاری تۆ لەبەرچاو بکەن و کاریان تێ بکاو سودی لێ وەربگرن .

﴿ وَلَوْكانُوا لايُبْصِرُونَ ﴾ وەئەگەرچی ئەوان نەبینن ڕێزی تۆ، نەیانەوێ بەدڵی پاك تەماشای تۆبکەن و سودی لێ وەربگرن. زۆر ڕونە مەبەست لەتەماشاكردن تەمێ وەرگرتنە، ئەوكەسان تەمێ خوارنابن بەوتەماشاكردنەی تۆ.

﴿ إنَ اللهَ لايَظْلِمُ الناسَ شَيْئاً وَلَكِنَ النّاسَ أنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ بەڕاستی خوا ستەم ناكا لەئادەمیزاد هیچ شتێ، بەوجۆرەی گوێچكەو چاویان لێبسێنێتەوە هەتا خاوەن بیانوبن و، بەلآم ئادەمیزاد خۆیان ستەم لەخۆیان ئەكەن، چونكە ئەوان گوێچكەو چاویان نەخستەوەتەكار. بەو جۆرەی قازانج و سودی لێوەربگرن. گومانی تێدانیە خوای مەزن تواناو هۆش و گۆش وگوێچكەو چاوی پێ بەخشیون، ڕێگەی چاكەو خراپەی بۆ ڕوون كردونەتەوە، فەرمانیشی داوە بەچاكەو قەدەغەی خراپەی كردوە، خۆیانی سەربەست كردوە كامیان هەڵبژێرن .

لەپاشا خوای گەورە ڕونی ئەكاتەوە بەسەرهاتیان لەڕۆژی كۆكردنەوەیانا لەپاشەڕۆژداو ئەفەرموێ :

وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ۚ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ ﴿٤٥﴾ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴿٤٦﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ ۖ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمْ قُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٤٧﴾

﴿ وَيَوْمَ نَحْشَرُهُمْ كَأَنْ لَمْ يَلْبِثُوا إلاساعَةً مِنَ النَهار ﴾ وەتۆ بـیری ئـەو ڕۆژە بکـەرەوە ئێمە ئەوان کۆئەکەینەوە لـەو جێگە سامناکەی ڕۆژی دوایـی دا لـەکاتێکا لـەگۆڕەکانیان دێنـە دەرەوەو زیندویـان ئەکەینـەوە، لێیـان ئـەخورین بـۆ شـوێنی پرسـیارو پاداشـتی کردەوەکانیان. وەك ئەوە وان دانەنیشتوون لـەجیهاندا مەگەر کاتێکی کەم لـەڕۆژێ، واتە بەجۆرێکە وائەزانن لـەجیهاندا نەژیاون جگەی ماوەیەکی کەم لـەڕۆژی جیهان .

﴿ يَتَعارَفُونَ بَيْنَهُمْ ﴾ ئەو بێ باوەڕانە لـەنێوان خۆیانا یەکتری ئەناسنەوە، بەوێنـەی ئـەو ناسینە لـە جیهاندا یەکیان ناسـیوە، بـەلاَم پـاش ئـەوەی ئـازارو سـامی ئـەو ڕۆژە ئـەبینین یەکتریان لـەبیر ئەچێتەوە .

﴿ قَدْ خَسِرَ الَّذِيْنَ كَذَّبُوا بِلِقـاءِ اللهِ وَماكـانُوا مُـهْتَدِيْنَ ﴾ بەڕاسـتی زیانیـان لێکـەوتوە کەسانێکی ئەوتۆ بڕوایان بەخزمەت گەیشتنی خوا نەبوەو بەزیندوبونـەوەی ڕۆژی دوایـی نەبوەو، ئەوبێباوەڕانە ڕاغوییان وەرنەگرتوە بەجۆرێ ڕزگاریان بکا لـەوزیانە لـەپاشەڕۆژدا توشیان ئەبێ .

﴿ وَإما نَرِيَنَّكَ بَعْضَ الذي نَعُدَهُمْ أَوْ نَتَوَفِّيْنَكَ ثُمَّ إِلَيْنا مَرْجَعُهُمْ ﴾ وەئەگەر ئێمە نیشانی بدەین بەتۆ هەندێ لـەوسـزایانەی ئـەوتۆ بـەڵێنمان داوە بەوبێباوەڕانـە کەتوشـیان ئـەبێ لـەجیهاندا بەکوشتن و بەدیل کردنیان، یائێمە تۆ بمرێنین بەرلـەوەی ئەوسزایانە توشیان ببـێ کەئەوسزایانە ڕاست و بێگومانە توشیان ئەبێ، ئێمـە تۆڵـەیان لێ ئەسـێنین بـاتۆیش نـەی بینی. وەك خوا ئەفەرموێ سـزای تریـان ئـەدرێ لەپاشـەڕۆژدا، لەپاشـا بـۆ لای ئێمەیـە گەڕانـەوەی ئـەو بێباوەڕانـە لـەڕۆژی دواییـدا، سـزایان ئـەدەین بەسـزای گـــەورەتر، لـەوسزایەتوشیان ئەبو بەبێگومان لـەجیهاندا .

﴿ ثُمَ اللهُ شَهِيْدٌ عَلى مايَفْعَلُونَ ﴾ لـەپاشا خوا شایەتی ئەدا لـەسەر شـتێ ئەوبێباوەڕانـە ئەیکەن، هیچ شتێ لـەخوا وون نابێ و ئاگـای لـەهـەمو شـتێهەیە، لـەمـەوپاش پاداشـتیان ئەداتەوەە بەشتێ شایستەی کردەوەی ئەوانبێ .

کاتێ خوای مەزن ڕونی کـردەوە بەسـەرهاتی پێغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ لەگـەڵ گەلەکـەی ، ڕونیشی ئەکاتەوە بەسەرهاتی پێغەمەرانی تر لـەگەڵ گەلـەکانیاناکەڕەوانە کرابون بۆ لایـان و داوایان لێ ئەکردن باوەڕبەخوا بکەن و بیپەرستن و یەتاك وتەنهای بزاننو ئەفەرموێ :

﴿ لِكُلِ اُمَةٍ رَّسُولٌ ﴾ بۆ هەموو کۆمەڵ و نەتەوەیە نێرراو پێغەمەرێك هەیـە، موژدەیـان ئەداتێ وئەیان ترسێنێ بۆ جێبەجێکردنی فەرمانـەکانی خـوا، پـاش ترسـاندن و مۆڵـەت دانیان توشی ڕۆژی پرسیارو پاداشت و سزای خۆیان بوون .

﴿ فَإذا جاءَ رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ ﴾ دوایی کاتێك نێرراو پێغەمەرەکان چون بۆ لایان و باوەڕیان پێ نەهێنان و بەدرۆیان خستنەوە لەلایـەن خـواۆ فـەرمان درا لـەنێونیانا بەشێوەیەکی دادپەروەرانە، وەلآمی ئەوانە ئەدرێتەوە وەلآمی خوایان داوەتەوە بـۆ پەرسـتن بەسەرکەوتن و پاداشتی چاك، ئەوانەیش ڕوویان وەرگێڕاوە لەفـەرمودەکانی خـوا توشـی سەرشۆڕیو سزای خـراپ ئـەبن، ئەوشـتانە هـەموویان بـەهۆی دادپـەروەری خواوەیـە، ئەوانەیان کردەوەی چاکیان کردوە سـەربەرزن، ئەوانـەیان خراپـەکار بـوون سەرشـۆڕو خەفەتبارن .

﴿ وَهُمْ لايُظْلَمُونَ ﴾ وەئەو گەلانە سـتەمیان لێ نـاکرێ و لـەپاداشـتی چاکـەیان کـەم ناکرێتەوە، بگرە خوا بەمیهرەبانی خۆی لەتاوانی هەندێکیان ئەبورێ .

لەئایەتەکانی پێشودا خوای مەزن هەڕەشەی کرد لەوبێباوەڕانە کـەباوەڕیان بـەڕۆژی دوایی نەبوەو بەدرۆیان ئەزانی، فەرموی زیندو ئەکرێنەوە دوای مردنیان و سـزایان ئـەدا، لەم ئایەتانەی دواییدا باسی بەسەرهاتی ئەوبێباوەڕانە ئەکا گاڵتەیان ئەکرد بەفەرمودەکانی خواو ئەڵێن: ئەوسزایە چ کاتێدێت ؟ ئەفەرموێ :

وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ لِكُلِّ أُمَّةٍ

أَجَلٌ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُهُۥ بَيَٰتًا أَوْ نَهَارًا مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٥٠﴾ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓ ۚ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَيَسْتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ۖ قُلْ إِى وَرَبِّىٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ ۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥٣﴾ وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِى ٱلْأَرْضِ لَٱفْتَدَتْ بِهِۦ ۗ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٥٤﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٥٦﴾

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَى هذا الْوَعْدُ إِنْ كُنْتُمْ صادِقِينَ﴾ وەبێباوەڕان ئەڵێن: چ کاتێ پەیدا ئەبێ ئەوکاتەی ئەوتۆ موحەمەد تۆ بەڵێنت داوە بەئێمە لەسزایە توشی ئێمە ببێ، یاچ کاتێ پەیدا ئەبێ ڕۆژی دوایی ئەگەر ئێوەی باوەڕدار ڕاست ئەکەن لەهاتنیانا ؟ ئەورستەیە لەوەڵامی ئەوەدا هاتوە لەئایەتی پێشودا خوا فەرموی دووای مردن زیندوتان ئەکەمەوەو سزاتان ئەدەم .

﴿ قُلْ لاأمْلُكْ لِنَفْسِي ضَرّاً وَلانَفْعَاً﴾ تۆ بلّێ لەوەلاّمیان: من خاوەنی هیچ سودو هیچ زیانێ نیم بۆ خۆم. یانێ من توانای ئەوەم نیە سودو قازانج بەخۆم بگەیەنم و زیان وئازار لەخۆم دوربخەمەوە، کەمن نەتوانم هیچ شتی بۆ خۆم بکەم چاکتر ناتوانم بۆ جگەی خۆمی بکەم، هەتا بتوانم بەپەلە ئەو سزایە بەلّێنی پێ دراوە توشی ئێوەی بکەم و نازانم چ کاتێ دێت وچ کاتێ ڕۆژی دوایی دێت .

﴿ إلا ماشاءَ اللّهُ ﴾ مەگەر شتێ خوا ئارەزووی بکا ببێ ، هەمو کارێ بۆ خوایەو لەوەوە پەیدائەبێ. کاتێ هەموشتی خوا دیاری ئەکا نزیکبێ یادوور. کاتی تەمەنی هەمووشتێ خوا ئەیزانێ. وێنەی ناوەڕۆکی ئەم ئایەتە لەئایەتی (١٨٧) ی سورەتی ئەلئەعرافدا باسی کراوە.

﴿ لِكُلِ اُمَةٍ أجَلٌ إذا جاءَ أجَلُهُمْ لايَسْتَأخِرُونَ ساعَةً وَلا يَسْتَقدِمُونَ ﴾ بۆ هەمووتاقمێ لەئادەمیزاد کاتێکی دیاری کراو دانراوە بۆ کۆتایی هاتنی تەمەنیان و بنەبڕکردنیان، هەر کاتێ ئەوماوەیە تەواوبوو ئەوشتەی خوا بیەوێ لەسزاو شتی تر توشیان ئەبێ، وەك خوا ئەفەرموێ: هەرکاتێ ماوەی دیاری کراو هات بۆ بەسەرهاتی پاشەڕۆژیان بەسزادان و بۆ لەناوبردنیان ئەوتاقمە دواناکەون لەو ماوەیە کەمترین کاتێ و پێشیش ناکەون کەمترین کات . بەلّکو ئەوەی خوا ویستویەتی توشیان ئەبێ لەسزادان و کۆتایی پێهاتنیان لەوکاتەدا. لەئایەتی (٣٣) ی سورەتی ئەلئەعرافدا مانای ئەوڕستانە تێپەڕیوە،لەئایەتی (١٤٥) ی ئالی عیمراندا بەدرێژی مانای ووشەی (أجَل ) بەڕونی باسکراوە .

﴿ قُلْ أرَأيْتُمْ إنْ أتاكُمْ عَذابُهُ بياتاً اَوْ نَهاراً﴾ تۆ بلّێ بەوکەسانە نامەی خوابەدرۆ ئەخەنەوەو داوا ئەکەن بەگورجی سزای بەلّێن پێدراو بێت بۆ لایان: ئایا ئێوە هەواڵئەدەن بەمن ئەگەر هات بۆ لای ئێوە سزای خوا کەئێوە داوای ئەکەن لەکاتی شەودا کەخەوتوون یا لەکاتی ڕۆژدا کەئێوە خەریکی ئیش و کاری خۆتانن، ئەوکاتانە چ شتێکتان لە دەست دێ.

﴿ ماذا تَستَعْجِلُ مِنهُ المُجرِمُونَ ﴾ چ شتێکی ئەوتۆیە تاوانبارن داوای پەلەکردن لەهاتنە خوارەوەی ئەوسزایەو بەڕاستی تێی کەوتوون، داوای سزای جیهان ئەکەن یا سزای پاشەڕۆژ، هەرکامیان بێ ئایا توانایان هەیە بەرگری لێبکەن و خۆیان ڕزگار بکەن؟ ئایا ئەتوانن ڕابکەن لەتوانای خوا کەتووشی سزا ئەبن؟ بۆ هەرجێگەیە بڕۆن هەر بۆلای خوا ئەڕۆن ؟.

﴿ أثُمَّ إذا ماوَقَعَ آمَنْتُمْ بِهِ ﴾ ئایا لەپاش ئەو داواکردنەی ئەوان بۆ هاتنی سزا بەگورجی هەرکاتێ ئەوسزایە پەیدابو، بەچاوی خۆیان بینیان باوەڕئەهێنن بەبێگومان بەهاتنی ئەوسزایە کەئێوە بەدرۆتان ئەخستەوە، ئەگەر باوەڕیش بهێنن سود لەوباوەڕە وەرناگرن، چونکە کاتی پەشیمان بونەوەتان لەکیس چووە. وێنەی ئێوە وەك فیرعەون وایە کەسودی لەباوەڕهێنان وەرنەگرت لەکاتی خنکانی لەنێو ئاودا، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ آلآنَ ﴾ هەرچەندە ئەوان باوەڕئەهێنن لەوکاتەدا، بەلاَم تۆ بەوان بڵێ: پێتان ئەبێژرێ لەکاتی باوەڕهێنانتانا: ئائێستا ئێوە باوەڕئەهێنن کەکاتی باوەڕهێنانا نەماوە؟ کات کاتی پرسیارو وەلاَمە و کاتی سزادانتانە، ڕۆژێکی ئەوتۆیە باوەڕو کردار کاتی نەماوە.

﴿ وَقَدْ كُنتُمْ بِهِ تَستَعْجِلُونَ ﴾ وەبەڕاستی ئێوە بەگاڵتەوە ئەو سزایەتان بەدرۆئەخستەوە داوای پەیدابونیتان ئەکرد بەگورجی بێت بۆ لاتان، هەموو چاکەو کردارتان لەجیهاندا لەکیس چوە، ئەم کاتەیش کاتی وەرگرتنی پاداشتی کارو کردەوەتانە .

﴿ ثُمَ قِيْلَ لِلَّذِيْنَ ظَلَمُوا ذُوقُوا عَذابَ الْخُلْدِ﴾ لەپاشەڕۆژدا ئەبێژرێ بەوکەسانە ستەمیان لەخۆیان کردوە بەهاوبەشدانان بۆ خواو بەدرۆخستنەوەی هاتنی سزا بۆ لایان لەڕۆژی دیاری کراودا: ئێوە بچێژن سزای بەردەوام لەدۆزەخدا ئێوە ئەمرن وئەو سزایەتان سوك نابێ و لەسەرتان هەڵناگیرێ.

﴿ هَلْ تَجْزَوْنَ إلا بِما كُنتُمْ تَكسِبُونَ ﴾ ئێوە پاداشتتان نادرێتەوە مەگەر بەشتێ ئێوە ئەیکەن لەجیهاندا ئەگەر بەجگەی ئەوشتە پاداشتیان بدرێتەوە لەپاشەڕۆژدا ئەبێ خوا ستەمکاربێ ئەوەیش نەبوەو نایشبێ.

﴿ وَيَسْتَنْبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ قُلْ إِي وَرَبِّيٓ إِنَّهُ لَحَقٌّ وَّمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِيْنَ ﴾ وەبێ باوەڕان داوای هەواڵ لەتۆئەکەن لەبارەی هاتنە خوارەوەی سزاو پێغەمەرایەتی تۆوەو هەموو فەرمودەکانی خوا: ئایا هەمو یەکێ لەوانە ڕاستن و بەگاڵتەوە ئەیان لێن: تۆ بلێ بەبت پەرستان وبێباوەڕان: بەلێ ئەوشتانە ڕاستن بەپەروەردگاری خۆمم سوێندبێ و گومانیان تێدانیە و، ئێوە ئەو کەسانە نین بتوانن ڕێگە لەدەسەلاتی خوا بگرن و نەیەلن سزاتوشتان بێ. بەبێگومان توشتان ئەبێ.

﴿ وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ مَافِي ٱلْأَرْضِ لَأَفْتَدَتْ بِهِ ﴾ وەبەڕاستی ئەگەر هەبێ بۆ هەموکەسێ ستەمی لەخۆی کردووە لەجیهاندا بەبێ فەرمانی خوا هەلسابێ هەمو شتێ لەزەویدایە لەگەنج و سامان ئەیکا بەقوربانی و بەدەردو گێڕی خۆی کەبەرگری پێبکا لەناهەمواری و سزای گرانی پاشەڕۆژ. بەلام بەرتیل و دیاری و پەشیمان بونەوە سودیان پێ نابەخشێ لەوڕۆژەدا، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَأَسَرُّوا النَّدامَةَ لَمّا رَأَوُا العَذابَ ﴾ وە ئەوان ئەشارنەوەو دای ئەپۆشن لەدەروونیخۆیانا بێئومێدی و پەشیمان بونەوەی خۆیان لەهاوڕێکانیان لەکاتێکا ئەبینن ئەوسزایە لەوڕۆژەدا. بەلام لەپاش چ شتێ لەکاتێکا قازانجیان پێناگەیەنێ شاردنەوەی ئەو پەشیمان بونەوەیەی ئەوان.

﴿ وَقُضِيَ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ وَهُمْ لايظْلَمُونَ ﴾ وەفەرمان ئەدرێ لەنێوان بونەوەراندا، لەنێوان ستەماکارو ستەم لێکراودا بەدادپەروەری هیچ کەسیستەمی لێناکرێ وەك خوا ئەفەرموێ: وەئەوان ستەمیان لێناکرێ بەکەم کردنەوەی پاداشتیان و بەزۆرکردنی تۆلەیان لەو فەرمان دانەدا. ئەو ڕستانە جارێ تر لەئایەتی ( ٤٧ ) ی ئەم سورەتەدا باسی کراوە، لەهەردوو شوێندا پێویستە بیژرێن. ئایەتی پێشوتر بۆ ترساندنی ئەوکەسانەیە بەهۆی پێغەمەرەوە توشی سزابوون کەبەدرۆیان ئەخستەوە، ئەمەی تریان بۆ ئەوەیە قوربانی و دەردو گیری بێ سوود بەهەمو شتێ لەسەر زەویدا .

﴿ ألا إنَ للهِ مـافي الِسَماواتِ وَالآرْضِ ﴾ ئێوه ئاگـادارین وبزانـن بـۆ خوایــه شــتێ لـەئاسمانەکان و لـەزەویدایە، هەرخوا خاوەنی هەموویانەو فەرمان ئـەدا و بـەکاری ئـەهێنێ لـەنێو ئاسمانەکان و زەویـدا، کـەس نیـە ڕێگـەی پێبگـرێ و پێویسـتی بـەهیچ شـتێ نیـە بەقوربانی و لـەبەرتیل، پاداشت و تۆڵـە بەجێگەی خۆیان ئەگەیەنێ .

﴿ الا إنَ وَعْداً اللهِ حَقٌّ وَلَكِنَ أَكْـثَرُهُمْ لايَعْلَمُـونَ ﴾ ئێـوه ئاگـادارین وبزانـن بـەڵێن و وادەی خوا بەبێ گومان ڕاستە، هـاتنی ڕۆژی دواییـی و پاداشـت و تۆڵــە، هـەروەها بـۆ هەموو شتێ تر بەلاّم زۆرتر لـەستەم کاران و بێ باوەڕان نازانن کە ڕۆژی دووایی دێــت. بەبێ‌گومان هەمو بونەوەران زینـــدوو ئەکاتــەوە ، بـەگوێرەی کـردەوەی شـیاوی خۆیـان پاداشت و تۆڵەیان بۆ رون ئەکاتەوە.

﴿ هُوَ يُحيَ وَيُمِيْتُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ هەر خوا زیندوو ئەکاتەوە مردووان پاش مردنیـان لـەڕۆژی دواییدا، وەهــەر خــوا ئـەیان مرێنــێ لـەجیـهاندا، بـۆ لای خـوا ئەگەڕێنـەوە بـۆ وەرگرتنی پاداشت و تۆڵە .

بۆ زانین: ئادەمیزاد بۆ باوەڕکرن بەپێغەمەر سێ‌تاقمن: تاقمێکیــان بـەبێ بەڵگـەو بـەبێ داوای سوێند خواردن هەرکاتێ پێغەمەر بیفەرموایە: من پێغەمەرم باوەڕیان ئەهێنا، چونکە ﴿ﷺ﴾ لەماوەی چل ساڵ پێش پێغەمەرایـەتی ناوبـانگی دەرکردبـو بەڕاسـت گـۆو دەم و دەست پاك .

تاقمێ تر داوای بەڵگەو کاریپەك خەریان لـەپێغەمەر ئەکرد ئەوجا باوەڕیانپێ ئـەهێنا . تاقمێ تریـان کـاتێ باوەڕیـان پێ‌ئـەهێنا داوای سـوێن خواردنیـان ئەکردکەلــەداواکردنی پێغەمەرایەتیدا ڕاست ئەکا، دوای سوێند خواردن باوەڕیان پێ‌ئەهێنا. ئەوەیش ئاماژەیە بـۆ لای ئەوەی کەداوای سوێندیان لـەپێغەمەر کرد لـەئایەتی ( ٥٣) ی ئەم سورەتەدا .

لـەکاتێکا خوای مەزن باسی قورئان و موژدەدان و هەڕەشە کردنی کـرد ، لـەمـەوپاش باسی گەورەیی قورئان و ڕێزو پلـەی قورئان ئەکاو ئەفەرموێ :

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ ۖ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦٠﴾

﴿ ياأيها النَّاسُ قَدْ جاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِكُمْ ﴾ ئەی ئادەمیزاد: بەڕاستی هاتوە بۆ لای ئێوە نامەیە لەونامەدا هەیە پەندو ئامۆژگاری لەلایەن پەروەردگاری خۆتانەوە، بۆ ئەوەی فێری ئێوەی بکا چاکەی هەردووجیهان بەنهێنیو بەئاشکراییانەوە .

﴿ وَشِفاءٌ لِّما في الصُدُور ﴾ وەهاتوە بۆلاتان نامەیە ڕزگارکەرتانە لەوبیرو باوەڕە خراپانەی لەدەرون ودڵتانایە، لەنەزانین و ئارەزووی خراپ و لەدووڕوی و گومان و شتی تری ناجۆر .

﴿ وَهُدىً وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤمِنِيْنَ ﴾ وەهاتوە بۆ لاتان قورئانێ شارەزایی کەرە بۆ لای ڕێگەی ڕاست و، میهرەبانی و بەزەیی خودایە بۆ باوەڕداران و ئەوکەسانەیە بەفەرمانی خوا خۆتان ئەپارێزن لەخراپە و بێ فەرمانی خوا، میهرەبانی خوا خۆشەویستی بۆ باوەڕداران و ئەوکەسانەن ڕزگاریان ئەبێ لەسزای خوا بەهۆی باوەڕیانەوە .

﴿ قُلْ بِفَضْلِ اللهِ وَبِرَحْمَتِهِ ﴾ تۆ بلێ: هاتوه بۆ لای ئێوه ئامۆژگـاری کردنتـان بـەهۆی گەورەیی و ڕێزی خوا کەبەئێوەی بەخشیوه نـاردنی پێغەمـەر بـۆ لای ئـادەمیزاد بـەهۆی بەزەیی و میهرەبانی خوا لـەگەڵتان بەنادرنی قورئان کەیاریدەدەرتانه بـۆ باوەرهێنـان و بـۆ فێر کردنتان بەیاسای بەرزی ئیسلام .

﴿ فَبِذلِكَ فَلْيَفْرَحُوا ﴾ دوای بەهۆی ئەوانەی قورئان پێویسته ئەوان شادمان و خـۆش حاڵبن، پێویسته هەربه هۆی ئەوانەوه هەست بەخۆشی بکەن و دڵیان ئارام بگرێ و نـابێ بەکۆکراوەکانی جیهان شادمان و دڵخۆشبن، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ ﴾ ئەوەی لـەقورئاندایه چاکترە لـەشتێ ئەوان کـۆی ئەکەنـەوه لـەدارایی. خوای مەزن ڕوئەکاته بێ باوەڕان، فـەرمان ئـەدا بەڕەوانـەکراوی خـۆی بلـێ بەوان :

﴿ قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَاأَنْزَلَ اللهُ لَكُمْ مِنْ رِزْقٍ ﴾ تۆ بلێ بەبت پەرستان: ئێوه هەواڵ بدەن بەمن بەشتێ خوا ناردویەتیـه خـوارەوه بـۆ سـوودی ئێـوه لـه خواردەمـەنی کـەهۆی ژیـان و زیندەگانیتانه وەك کشت و کاڵ وچوارپێ و شتی تر .

﴿ فَجَعَلْتُمْ مِنْهُ حَرَاماً وَحَلالاً ﴾ دوایـی گێڕاوتانـه لـەوخواردەمەنیانـه لـەخۆتانـەوه بەقەدەغەکردنی هەندێکیان و بەڕەواکردنی هەندێ تریان، یانێ هەندێ لـەو خواردەمەنیانه خوا دروستی کردوون بۆ ئێوەو بۆتانی ڕەواکردووه لـەخۆتانی قەدەغه ئەکـەن خواردنیـان وئەڵێن: خوا فەرمانی پێداوه، بۆ وێنه ئەیان ووت: ئەوەی لـەوورگی ئـەو چوارپێیانەدایـه بەتایبەتی بۆ نێرەکانمانەو بۆ ژنەکانمان قەدەغەیه .

﴿ قُلْ آللهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللهِ تَفْتَرُونَ ﴾ تۆ بلێ بەوبت پەرستانه: ئایا خوا دەسـتوری داوه بەئێوه بەقەدەغه کردن و ڕەواکردنی ئەو خواردەمەنیانه، یا بەبوختانی خۆتان هەڵتان بەستوەو ئەیدەن بەسەر خوادا، بێگومان خۆتـان بـەدۆرو بوختـان کردووتانـه بەیاسا بـۆ خۆتان .

﴿ وَما ظَنُّ الَّذِيْنَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللهِ الْكَذِبَ يَوْمَ الْقِيامَةِ ﴾ وەئایا چۆنی لێك ئەدەنەوە کەسانێکی ئەوتۆ ڕەوا ئەکەن وقەدەغە ئەکەن لەخۆیانەوە کەبەڕاستی خوا لە ڕۆژی دواییدا وازیان لێ ئەهێنێ بەبێ سزادانیان لەسەر درۆو بوختان ئەیدەن بەسەر خوادا، بێگومان سزایان ئەدا .

﴿ إِنَّ اللهَ لَذُو فَضْلٍ على الْناسِ وَلَكِنْ أَكْثَرُهُمْ لايَشْكُرُونَ ﴾ بەڕاستی خوا خاوەنی گەورەیی و ڕێزە بەسەر ئادەمیزادەوە بەهۆی ناردنی پێغەمەرانەوە، ئەقڵ دەستوری پێ بەخشیون کەفەرمانی خوای پێ بدۆزنەوەو چاکە بکەن ولەخراپە خۆیان بپارێزن، بەلام زووتر لەئادەمیزاد سوپاسی خوا ناکەن لەسەر ئەو شتانە خوا بەوانی بەخشیوە، بەو گەورەییەی خوا نازانن.

ئەقڵی خۆیان ناخەنەکار بۆ دۆزینەوەی کاری چاك وخراپ ، سەرشۆڕی یاسا نابن، لەکاتێکا بەخشندەیی و چاکەی ئاشکراو نهێنی خوا نایەنە ژمارەو کەسیان نایان زانێ مەگەر خوا بیانزانێ وئاگاداریان بێ، بزانێ بەکردەوەی بەندەکانی خۆی چۆنە لە هەمو رویەکەوە .

وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُواْ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦١﴾ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾

﴿ وَما تَكُونُ فِي شَأنٍ وَماتَتْلُوا مِنْهُ مِنْ قُرآنٍ ﴾ وەتۆ لەهیچ کارێکی چاك نابێ بتەوێ بکەوێ و، ناخوێنیتەوە قورئان بەسەر ئادەمیزادا، کارەکانت گەورە بن یا بچووك، نهێنی بن یائاشکرا، دەربارەی خۆتبێ یا لەگەڵ جگەی خۆت، ناخوێنیتەوە لەو کارەی خۆت لەقورئانا، بەتایبەتی لەنێو هەمو ئیشە تردا کە فەرمانە شایستەکانی قورئان بزانێ، یا ڕای بگەیەنێ بەئادەمیزاد تا پەرستنی خوای پێ بکەن .

﴿ وَما تَعْلَمُونَ مِنْ عَمَلٍ إلا كُنّا عَلَيْهِمْ شُهُوداً ﴾ وەئێوەی ئادەمیزاد هیچ کارێك ناکەن چاکبن یا خراپ، گەورەبن یا بچووك نهێنی بن یا ئاشکرا، مەگەر ئێمە ئاگاداربن لەسەر کارە کانتان، هەموو کردەوەکانتان ئەژمێرین و لای ئێمە تۆمار ئەکرێن .

﴿ إذْ تَفِيْضُونَ فِيْهِ ﴾ لەکاتێکا ئێوە ئەچنە نێو ئەو کارەوە بیکەن و بەردەوامبن لەسەری و دەستی پێ ئەکەن و ئەیکەن .

﴿ وَما يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقالِ ذَرَةٍ فِي الأَرْضِ وَلا فِي السَماءِ وَلا أصْغَرْ مِنْ ذلِكَ وَلا أكْبَرْ فِي الْكِتابِ الْمُبِيْنِ ﴾ وە وون نابێ لەزانستی پەروەردگاری تۆ لەکێشانەی مێرولەیە، نەلەزەویدا و نەلەنێو ئاسماندا، نەبچوکتر لەمێرولەیە ونەگەورەتر لەکێشانەی ئەو مێرولەیە مەگەر تۆمارکراوە لەنێو نامەیەکدا کە ئاشکراو ڕون ئەکاتەوە هەمو شتێ، هەموویان نوسراوە لەونامەیەدا بەبێ کەم و کوڕی لەکاری چاك وخراپ .

﴿ ألآ أنَّ اَوْلِياءَ اللهِ لاخَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاهُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ ئێوە ئاگاداربن و بزانن بەڕاستی دۆستانی خوا هیچ ترسێکیان لەسەر نیەو ئەوان خەفەت بۆ هیچ شتێ ناخۆن کەئاوت و نیازیان لە کیس چووبێ، خوا چاودێریان ئەکا و ئەیانپارێزێ .

﴿ الَّذِيْنَ آمَنُوا وَكانُوا يَتَقُونَ لَهُمْ الْبُشْرى فِي الْحَياةْ الْدُنيا وَفِي الآخِرَةِ ﴾ دۆستانی خوا ئەوکەسانەی ئەوتۆن باوەڕیان هێناوە بەو شتانەی هاتونەتە خـوارەوە بـۆ سـەر پێغەمـەر و ئەوان خۆیان ئەپارێزن لـەوشتانە خوا قەدەغەی کردوون، بـۆ ئـەو دۆسـتانەی خـوا هەیـە چاکەیەکی خۆش و موژدە پێدانیان بە لێبـوردن لـەزیندەگانی جیـهان و بـەرزگاربوونیان لـەپاشەڕۆژدا، شـادمان و خۆشـحاڵن بـەژیانی جیـهان و پاداشـتی پاشـەڕۆژ لـەو ڕۆژەدا فریشتەکان پێشوازی گەرمیان لێ‌ئەکەنو موژدەیان ئەدەنێ بەسەر بـەرزی ورزگاربونیـان وچونیان بۆ بەهەشت وبەخۆشیو بەبەردەوامی .

﴿ لاتَبْدِيْلَ لِكَلِماتْ اللهِ ذلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيْمُ ﴾ هیچ گۆڕانێ بۆ فـەرموودەکانی خـوا بۆ بەڵێنی خوا نیە، خوا هەست و ئارەزووی لـەهەرشتێ بێ کەس ناتوانێ ڕێگەی لێبگرێ، ئەو موژدەی خوایە بێگومان دێتەدی، ئەو کەسانەی ئەو موژدەیەیان پێدراوە ڕزگاربونێکی زۆر گەورەیە لـەجیهانا بەوان دراوە کە بەو جۆرە بێ کەس ڕێگەی پی‌تـەبا بائـەو کەسـە داناو زیرەکبێ .

ئەو کەسانە خاوەنی پلەو پایـە وسـامان بـون لـەبێباوەڕان وترسـیان پـەیدا کردبـوو لـەنەمانی ئەوشتانە، هەڵـەشەیی و شێتیان دەست پێکرد لـەوکاتەدا پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ جـاڕی دا بەیەکسانی ئـادەمیزاد و بلاوکردنـەوەی دادپـەروەری وفـەرموی: سـتەم و ڕوتانـەوە قەدەغەن و باوی نـەماوە، ئـەو کاربەدەسـتە بـێ باوەڕانـە ئـەیان ووت: ئێمـە چـۆن واز لـەدارایی و پلـەوپایەی خۆمان دێنین ؟ ئەوەبو دەستیان کرد بەبەرەنگاری کردنـی پێغەمـەر وبوختان و درۆیان هەڵئەبەسـت و ئەیاندایـە پـاڵ پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾، جـارێ ئـەیان ووت: موحەمەد شێتە، جاری‌تر ئەیان ووت جادوگەرە، بڕیاندا کەلـەناوی ببەن، بـۆ دڵدانـەوەی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ خوا فەرمووی :

وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ
ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦٥﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ

مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٦٦﴾ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱلْغَنِيُّ ۖ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۚ إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ بِهَٰذَآ ۚ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾ قُلْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٌ فِي ٱلدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلْعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾

﴿ وَلَايَحْزُنْكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ الْعِزَةَ لِلهِ جِمِيْعاً هُوَ الْسَمِيْعُ الْعَلِيْمُ ﴾ وەتۆ خەفەتبار نەکا گفتوگۆی بێباوەڕان کەتۆ بەدۆر ئەخەنەوە، هەڕەشە و ڕاوێژ ئەکەن بۆ لەناوبردنت . بەڕاستی گەورەیی وهێز و سەرکەوتن هەموی هەر بۆ خوایە، خوا ئایینی خۆی سەرئەخاو تۆیش ڕزگار ئەکا و یاریدەت ئەدا، خوا بەتەواوی ئەبیسێ ئەو بوختانەی ئەیدەن بەسەر تۆدا و گاڵتەت پێ ئەکەن، ئەزانێ بەڕاوێژ وفێڵ و تەڵەکەبازی ئەوان بۆ لەناوبردنی تۆ، خوا لەسەر هەڵە بۆ لەناوبردنیان :

﴿ ألا إنَّ للهِ مَنْ فِي الْسَماواتِ وَمِنَ فِي الأَرْضِ ﴾ ئێـوە ئاگـاداربن وبزانـن هـەر بۆ خوایە هەرکەسیَ لـەنێو ئاسمانەکان وکەسیَ لـەنێو زەویدان، هەر خـوا خاوەنیانـە کـەخوا خاوەنی ئەوان بیَ توانا بێ هاوتـای هەیـە بـۆ یارمـەتی دانـی تـۆ، ئیـتر ئەوکەسـانە خـوا خاوەنیانەو فریشتە وئادەمیزاد وجگەی ئەوانیشە .

﴿ وَما يَتَبِّعُ الْذِيـنَ يَدْعُـونَ مِـنْ دُونِ اللهِ شَـرَكاءٍ ﴾ وەکەسـانێکی ئـەوتۆ ئەپەرسـتن لـەجگەی خوا دوای هاوبەشەکانی خوا نەکەوتوون، چونکە خوا هاوبەشی نیە هەرچـەندە ئەوان ناویان ئەبەن بەهاوبەشی خوا .

﴿ أنْ يَتْبَعُونَ إلا الْظَنّ ﴾ پەیڕەوی هیچ شتێك ناکەن مەگـەر دووای گومـانی پوچـی خۆیان کەوتوون لـەخزمەت خوادا بۆیان بپارێنەوەو نزیکیان لـەخوا بکەنەوە ئـەوەیش بـیَ بنچینەیە .

﴿ إنَّ هُمْ ألا يَخْرُصُونَ ﴾ ئەوبیَ باوەڕانەنین کـەبوختان و درۆ هەڵئەبەسـتن و ئـەڵێن: ئەوبتانـە هاوبەشـی خـوان مەگـەر ئـەوەی ئـەوان ئـــەیڵێن گفتوگۆیـــەکی بیَزانســـت وگۆترەکاریەو درۆ ئەکەن و بیَباوەڕن .

هەندیَ لـەزانایان ئەڵێن: ووشەی ( ما ) لـە ( ومايتبع ) بۆ ئیسـتیفهامە یـانیَ چ شـتێکە ئەو بت پەرستانە دوای کەوتوون وئەیپەرستن لـەجگـەی خـوای مـەزن، ئـەوەی ئـەوان ئەیلێن نەگونجاوە، ئەوبتانە خراپە لـەخۆیان دوور ناخەنەوەو لـەخۆیان بـەچاکتر، بەتایبـەتی ئەوانەیان دارو بەردن .

﴿ هُوَ الَّذِيْ جَعَلَ لَكُمْ الْلَيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيْهِ ﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیە دروستی کردوە بـۆ ئێوە شەو لـەبەرئەوەی ئێوە دانیشن لـەنێو و ئارام بگرن و پشـووبدەن وبحەوێن و ئـازار و ماندویەتی ڕۆژتان نەمێنیَ .

﴿ وَ النَّهارُ مُبْصِراً ﴾ وەڕۆژیشی بۆ دروست کردوون هەتا ڕووناکی پـەخش بکاتـەوە بەسەر زەویـدا وئێوە بتوانـن ئیشـی تێـدا بکـەن، خواردەمـەنی و هـۆی ژیـانی خۆتـان ئامادەبکەن، ئەو خوایە ئەوانەی دروست کردبێ شایانی ئەوەنیە هاوبەشی بۆ دابنرێ .

﴿إِنَّ فِي ذٰلِكَ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴾ بەڕاستی هەیە لـەوشتانەدا باسکران نیشـانەو بەڵگـەی ئاشکرا لـەسەر یەکێتی خواو هاوبەش دانەنان بۆ خوا، بـۆ تـاقمێ گـوێ بگـرن لـەقورئان وراغویی وەربگرن بەهۆشەوە .

بۆ زانین: ئەگەر بەڕاستی ئێمەی ئادەمیزاد بەڕاستی خاوەن هەست و هۆش بوینایە ورد بوینایەتەوە لـەچۆنیەتی دروستکردنی شەو ورۆژ و هەڵسوڕاندنیان بـەو شـێوەیە ئـەبینرێن بۆمان ئەچەسپا کە هەر خوایـە بەتەنـهاو بـێ وێنەیـە بـۆ بـەڕێوەبردن و پـەروەردەکردنی بونەوەران و دانانی هەمووشتێ لـەجێگـەی شـیاوی خۆیـا ئەوەتـە خـوا شـەوی دروست نەکردوە هەموکاتێ هەر لـەجێگەیەکدا بێ، ڕۆژیشی دروست نەکردوە کاتەکەی هەر بـۆ شوێنێکی تایبەتی بێ بەڵکو هەندێ کات شەوە لەهەندێ جێگەدا، ڕۆژە لـەجێگەیە تـردا، چونکە بەکوێری ویستی خۆر بۆ زەوی هەیە دووسوڕ: سـوڕێکیان بـە مـلاولای خـۆرا و کۆتایی پیێدێ لە ( ٢٤) کاتژمێر دا شەو ورۆژ پەیدا ئەبێ دێن بـەدوای یـەکدا. سـوڕێ تری هەیە لـەماوەی ( ٣٦ ) ڕۆژدا بە ملاولای خۆیا چوار وەرز پـەیدا ئـەبێ هەریەکـەیان بەجۆرە سروشتێ، بۆمان ڕون کراوەتەوە ئەو دوو سوڕە لـەیەك کاتا نـین بـۆ زەوی، بـەو بۆنـەوە ڕوی زەوی دەسـت ئـەدا بـۆ مانـەوەو بـەردەوامبونی ژیـانی بونـەوەران، بـەلاّم ئەستێرەکانی جگەی زەوی ئەسوڕێن بە ملاولای خۆیانا و بە ملاولای خۆردا لـەیەك کاتـا هەردوو سوڕەکەیشی لـەیەك کاتا کۆتاییان پـێدێ. کەواتـە لایـەکیان لـەهـەموو کاتێکـا شەوە، ئەو لاکەی تری تریان لـەهەمووکاتێکا ڕۆژە، بـەو بۆنـەوە لایـەکیان زۆر ساردەو ئەولاکەی تریان زۆر گەرمە، ئەوسوڕانەی زەوی بەوجۆرەی باسـکران بـەردەوامن هـەتا

کۆتایی جیهان لەبەر سوودی بونەوەران بەهۆی میهرەبانی خواو و بۆ دروستکراوانی خۆی. بت پەرستان گومانیان ئەبرد فریشتەکان کچی خوان، جوەکان لایان وابو عوزەیر کوڕی خوایە وگاورەکان ئەیان ووت: عیسا کوڕی خوایە، خوای مەزن بەدرۆیان ئەخاتەوەو ئەفەرموێ :

﴿ قالُوا اتَّخَذَ اللهُ وَلَداً سُبْحانَهُ هُوَ الغَنِيُّ ﴾ بیٚباوەڕان ئەیان ووت: خوا وەری گرتووە بۆ خۆی منالْ لەکوڕو لەکچ، پاك و خاوێنی بۆ خوایە لەوەرگرتنی منالْدا، خوا بیٚ نیازەو پێویستی بەوەرگرتنی منالْ نییە .

ئەوەی بیٚ باوەڕان ئەیلێن بوختان و دەست هەلْبەستە، داواکردنی منالْ لەبەرئەمانەیە: ئەو کەسەی داوای منالْ بکا لەبەرئەوەیە خۆی لاوازەو ئەیەویٚ بەهۆی منالْەوە هێز پەیدا بکا، یاهەژارەو ئەیەویٚ سامان پەیدا بکا و منالْ یاریدەی بدا بۆ بەدەست هێنانی دارایی، یاژێر دەستەیەو ئەیەویٚ بەهۆی منالْەوە ڕێزو سەربەرزی بەدەست بهێنیٚ و خۆی ڕزگاربکا لە ستەمی ژێردەستەیی، یابیٚ ناوەو کەس باسی ناکا ئەیەویٚ بەهۆی منالْەوە ناوی ببریٚ و ناونیشان پەیدابکا و لەدوای مردنی منالْی هەبیٚ و میراتەکەی بن، ئەوانە هەموی هۆی داماوی و پێویست بونە بەجگەی خۆی، ئەوەیش بۆ خوا دورەو ناگونجیٚ .

لەئایەتی (٧١) ی سورەتی ئەلبەقەرەدا وێنەی ئەو ئایەتە باس کراوە، لەوباسکردنەدا بەلْگە لەسەر نەبوونی منالْ بۆ خوا درێژەی پێدراوە، هەر لەویش باسی (الآقانیم الثلاثـة ) یانی سیٚ بنچینە گاورەکان باوك و کوڕو گیانی ڕێزدارت (الآب والآبن وروح القدس) کراوە.

﴿ لَهُ مافِي السَّماواتِ وَمافِي الآرْضِ ﴾ بۆ خوایە خاوەن یەتی شتیٚ لەئاسمانەکان و لەزەویدان بەهەمو بونەوەرانی ترەوە، خوا هەموویانی دروست کردووەو هێناونیەتە بونەوەو پێویستی بەکەس نیە لەمنالْ کاتیٚ خوای گەورە خۆی پاك کردەوە لەوەرگرتنی منالْ ڕووی ڕێزی خۆی ئەکاتەوە بۆ لای بیٚباوەڕان و ئەفەرمویٚ :

﴿ إنْ عِنْدَكُمْ بِسُلْطانٍ بِهذا ﴾ هیچ بەڵگەیە لای ئێوەی بێباوەڕ نیەلەسەر ئەو گفتوگۆیە ئێوە یەیڵێن کەخوا منالّی هەیە. لەپاشا خوا زۆرتر هەڕەشە لەبێباوەڕان ئەکاو ئەفەرموێ :

﴿ أتَقُولُونَ عَلىَ اللهِ مالاتَعْلَمُونَ ﴾ ئایا ئێوە چۆن ئەو گفتوگۆیە ئەڵێن و ئەیدەن بەسەر خوادا و ئێوە نایزانن لەدانانی منالّ بۆ خوا بەبێئەوەی بەلگەیەکتان بەدەستەوەبێ .

﴿ قُلْ إنَ الذِيْنَ يَفْتَرُونَ عَلىَ اللهِ الكَذِبَ لايُفْلِحُونَ ﴾ تۆ بڵێ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ درۆ دروست ئەکەن ئەیدەن بەسەر خوادا وئەڵێن: خوا منالّی هەیە ئەوانە ڕزگاریان نابێو سەرناکەون ،ئەچنە نێو دۆزەخەوەو ناچنە نێو بەهەشت .

﴿ مَتاعٌ فِي الْدُنْيا ﴾ ئەو بوختانە بۆ خوا لەبەرخواردەمەنی وڕابواردنێکی کەمە لەجیهاندا، بۆ ماوەیەکی کەم ڕائەبوێرێ لەتەمەنیانا لەدواییدا کۆتایی پێ دێ، ئەوماوەیە زۆر کەمە بەرانبەر بەڕۆژی دوایی

﴿ ثُمَّ إلَيْنا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيْقُهُمْ العَذابَ الشَّدِيْدَ ﴾ لەپاشان گەڕانەوەیان بۆ لای ئێمەیە لەپاشا ئێمە ئەچێژین بەو بێ باوەڕانە سزای زۆر سەختی بەردەوام .

﴿ بِما كانُوا يَكْفِرُونَ ﴾ بەهۆی شتێ باوەڕیان پێی نەهێناوە لەقورئان و لەپێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەئەوشتە ناشایستەیە ئەیدەنە پاڵ خوا وێنەی منالّ و هاوبەش.

لەپاشا خوای مەزن فەرمان ئەدا بەپێغەمەر بخوێنێتەوە بەسەریاندا دەنگ وباسی نوح و ئەفەرموێ :

وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ نُوحٍ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكُم مَّقَامِى وَتَذْكِيرِى بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْتُ فَأَجْمِعُوٓاْ أَمْرَكُمْ وَشُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً ثُمَّ ٱقْضُوٓاْ

إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ﴿٧١﴾ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٧٢﴾ فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلْفُلْكِ وَجَعَلْنَٰهُمْ خَلَٰٓئِفَ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾

﴿ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبأَ نُوحٍ إِذْقالَ لِقَوْمِهِ ﴾ وەتۆ بخوێنەرەوە بەسەر بت پەرستانی مەکەدا هەواڵی بەسەرهاتی نوح پێغەمەر لەکاتێکا نوح فەرموی بەتاقمەکەی خۆی:

﴿ إِنْ كانَ كَبُرَ عَلَيْكُمْ مَّقامي وَتَذكيري بِآياتِ اللهِ ﴾ ئەگەر گەورەو گرانە لەسەر ئێوەی بت پەرست دانیشتن و ڕاوەستانی من کە هەڵئەسم بەڕاگەیاندنی دەقی فەرموودەی خواو گرانیشە ئامۆژگاری کردنی من بۆ ئێوە بەهۆی ئەو نیشانەو بەڵگە ڕونانەی خوا .

﴿ فَعَلَى اللهِ تَوَكَّلْتُ فَاجْمِعُوا أَمْرَكُمْ وَشُرَكاءَكُمْ ﴾ دوایی من هەر لەسەر خوا پشت ئەبەستم بەتەنهاو بۆ لادانی دەست درێژی‌کردنی ئێوە بۆ من و بۆسەرسەختنی من بەسەر دوژمنانی خوا، کەواتە ئێوە کارو پیلانی خۆتان و هەمو هاوبەشەکانتان کۆبکەنەوە، هەمووو توانای خۆتان بخەنەکار بۆ کوشتن و دەرکردن و ڕاونانی من و مەشڵەژێن بۆ ئەوشتانەی ئەتانەوێ بیکەن لەگەڵ من .

﴿ ثُمَّ لايَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيَكُمْ غُمَّةً ثُمَّ اقْضُوا إِلَيَّ وَلاتُنْظِرُونَ ﴾ لەپاشا باپەنهان نەبێ کارەکانتان لەسەر خۆتان بۆ نیازی لەناوبردنی من و ئاشکرای بکەن، لەپاشا جێبەجێی بکەن ئەوەی لەدەرونتانایە لەخراپەکردن بۆلای من و دوای مەخەن و مۆڵەتی من مەدەن، دوای ئەوەی ڕام گەیاندوە بەئێوە ئەوەی من لەسەری ئەڕۆم .

﴿ فَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَما سَأَلْتُكُمْ مِنْ أَجْرٍ ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە پشت ئەکەنە بانگەوازی من و واز لەئامۆژگاری من ئەهێنن، دوایی من هیچ کرێیە لەئێوەم داوانەکردوە، لەلای من هەمووشتێکی ئێوە بێ‌نرخ و بێ‌بەهایە ڕوو وەرچەرخانی ئێوە لەئامۆژگاری کردنی من بۆ ئێوە نەسوود نەزیان بەمن ناگەیەنێ .

﴿ إِنْ أَجْرِيَ إِلا عَلَى اللهِ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِيْنَ ﴾ کرێی من لەسەر هیچ کەسێ‌نیە مەگەر لەسەر خوایە بەتەنها و لەسەر ئێوە نیە و بەڕاگەیاندنی فەرمانی خوا هەڵئەسم و فەرمانم پێدراوە لەلایەن خواوە کەمن موسڵمان بم وبەردەوامبم بۆ پەرستنی ئەو، لەبەرئەوەی من بڕوام وایە ئەبێ فەرکانی خوا جێ بەجێ بکەم، هەرئەوەیشە چاکترین شتێ بیکەم بۆ خوا، کەواتە من دژی فەرمانی خوا نیم و مزەو پاداشت لەجگەی خوا داواناکەم .

﴿ فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيْناهُ وَمَنْ مَعَهُ فِي الْفَلَكِ ﴾ دوایی گەلی نوح باوەڕیان بەنوح نەهێنا و بەدرۆیان خستەوەو بەردەوامیش بوون لەسەری لەدوای دانانی بەڵگەلەسەر ڕاستی داواکاری خۆی دوایش ئێمە نوحمان ڕزگارکرد لەخنکان بەئاو کەسانێکیش لەگەڵ نوح بوون لەنێو کەشتیەکەدا ڕزگارمان کردن .

﴿ وَجَعَلْناهُمْ خَلائِفَ وَاَغْرَقْنا الَّذِيْنَ كَفَرُوا بِآياتِنا ﴾ وەئێمە نوح و ئەوکەسانەلەگەڵی بون لەنێو کەشتیەکەدا کردمان بەجێگە نیشینی خنکاوەکان لەسەر زەوی دوای خنکانی ئەوبت پەرستانەو، ئێمە خنکاندمان کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابوو بەبەڵگەڕونەکانی ئێمەو بەدرۆیان دانا.

﴿ فَانْظُرْ كَيْفَ كانَ عاقِبَةُ الْمُنْذِرِيْنَ ﴾ دوایی تۆ تەماشابکە پاشەڕۆژی ئەوکەسانەی لەلایەن پێغەمەرانەوە ترسێنراون چۆن بوە، دوایی باوەڕیان نەهێناوە.

لەپاشا خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە بەسەرهات و چیرۆکی ئەوپێغەمەرانەی خوا ڕەوانەی کردبوون دوای نوح و ئەفەرموێ :

ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ ۚ كَذَٰلِكَ نَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٧٤﴾ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰذَا لَسِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٦﴾ قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمْ ۖ أَسِحْرٌ هَٰذَا وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ ﴿٧٨﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِى بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨٢﴾

﴿ ثُمَّ بَعَثْنا مِنْ بَعْدِهِ رُسُلاً إلى قَوْمِهِمْ ﴾ لەپاشا ئێمە ڕەوانەمان کرد لەپاش نوح چەندین فروستادەو نێراوی خۆمان بۆ لای تاقمەکانیان، ئەو فروستاوانە نێرراون لەنێوان نوح و موسادا بریتی بون لەهود بۆ لای گەلی عاد، سالیح بۆ لای گەلی سەمود، ئیبراهیم بۆ لای گەلی یابل. شوعەیب بۆ دانیشتوانی ئەیکەی دانیشتوانی مەدیەن، دروودی خوا لەسەر هەموویان بێ .

﴿ جاؤُوهُمْ بِالْبَيِّناتِ فَما كانُوا لِيُؤمِنُوا بِما كَذَّبُوا بِهِ مِنْ قَبْلُ ﴾ ئەو پێغەمەرانە چوون بۆ لای گەلەکانی خۆیان بەچەندین بەڵگەی ڕوون و کاری پەك خەرەوە کەنیشانە بوون لەسەر ڕاستی ئەو پێغەمەرانە ،دوایی ئەو گەلانە بەوجۆرە نە بون کە باوەڕبهێنن بەو پێغەمەرانە بەهۆی شتێکە بەدرۆیان خستبووەوە بەوشتە لەپێشەوە لەسەری بوبون لەبت پەرستی وپرۆگرامی گەلی نوح بو، نەگەڕانەوە لەبێ باوەڕی و بەدرۆخستنەوەی پێغەمەرەکان، سودیان وەرنەگرت لەڕاغوییان دەقاو دەق خوی گەلی نوحیان بۆ خۆیان هەڵبژاردبو لەباوەڕنەهێنان بەپێغەمەرەکان .

﴿ كَذَلِكَ نَطْبَعُ عَلى قُلُوبِ الْمُعْتَدِيْنَ ﴾ هەر بەوجۆرەی ئێمە گەلی نوحمان خنکان بەهۆی بەدرۆخستنەوەیان هەروایش ئێمە مۆر ئەدەین بەسەر دڵی ئەوکەسانە لەسنوور دەرچوون بەهۆی بەدرۆخستنەوەی پێغەمەرەکانیان. پاشەڕۆژی قورەیشیەکانیش هەروەك ئەوانبێ .

پرسیار/ ئەگەر خوای گەورە مۆری دابێ بەسەر دڵیان بۆچی خوا سزایان ئەدا ؟

وەڵام/ بەڕاستی خوای مەزن ڕاغویی خۆی دیاری کردووەو فەرمویەتی هەرکەسێ پەیڕەوی پێغەمەران بیکا بەختیارە، هەروایش بۆ لەڕێگە لادان یاسای داناوە کەهەرکەسێ پەیڕەوی هەوەسی خۆی بکا سەر لێ شێواوە. بۆ نموونە هەرکەسێ خۆی لەسەر کێوێ بخاتە خوارەوە یامەلەوانی نەزانێ و خۆی بخاتە نیو ڕوبارەوەو ملی بشکێو بخنکێ خۆی بەرپرسیارە، ئادەمیزادیش خاوەنی ئەقڵەو چاك و خراپ ئەزانێ ئەگەر پەیڕەوی پێغەمەران نەکاو پەیڕەوی هەوەسی خۆیان بکەن خۆیان سەربەست وبەرپرسیارن .

﴿ ثُمَّ بَعَثْنا مِنْ بَعْدِهِمْ مُوسى وَهارُونَ إلى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ ﴾ لەپاشا ئێمە ڕەوانەمان كردبو دوای ئەو پێغەمەرانە موساو هارون بۆلای فیرعەون و بۆلای مرۆڤە خاوەن پلەبەرزەكانی فیرعەون بەچەندین كاریپەك خەرو بەڵگەی ڕونەوە، وەك داردەستی موساو دەستە زۆرسپی و گەشەدارەكەیەوە كەدەری ئەخست بۆ دانیشتوان.

﴿ فَأَسْتَكْبَرُوا وَكانُوا قَوْماً مُجْرِمِيْنَ ﴾ دوایی فیرعەون وتاقمەكەی خۆیان بەگەورە گرت و یاخی بوون لەخواو، ئەوانە تاقمێكی تاوانباربوونو لەسنور دەرچوبون بەبۆنەی پەیڕەوی نەكردنی موساو گاڵتەكردن بەموسا و هارون .

﴿ فَلَّما جاءَ الْحَقُّ مِنْ عِنْدِنا قالُوا إنَّ هذا لَسِحْرٌ مُبِيْنٌ ﴾ دوایی كاتێ چوو بۆ لای ئەوتاقمانە ڕاستی و فەرموودەی دروست لەلایەن ئێمەوە، كاری پەك خەرمان لەسەر دەستی موسا نیشاندان. ووتیان: بەڕاستی ئەوكارەی موسا نیشانی دا جادویەكی ئاشكرایە وێنەی ئەوجادویە جادوكەرانی ئێمە ئەیكەن. هەروەها بت پەرستانی مەكە ئەیان ووت لەوكاتانەدا قورئانی بەسەردا ئەخوێندنەوەو نەیان ئەتوانی بەرانبەری پێغەمەر بكەن: موحەمەد شایەروجادوگەرە. بێگومان لەم سەردەمەی ئێمەدا هەمو چاكەخوازان تاوانبار ئەكەن بۆ ئەوەی ئازاریان بدەن بەوەی لەیاسا دەرچوون .

﴿ قالَ مُوسى أتَقُولُونَ لِلْحَقِ لَّما جاءَكُمْ ﴾ موسا ووتی : ئایا ئێوە چۆن ئەڵێن ئەوانە جادوون كاتێ هاتوە بۆلای ئێوە ڕاستی و كاری پەكخەری وا ڕێگەی ڕاستتان پێ‌نیشان ئەدەن.

﴿ أسِحْرٌ هَذا وَلايُفْلِحُ السّاحِرُونَ ﴾ دوایی موسا ووتی: ئایا ئەمەی ئێمە لای ئێوە بەجادوی ئەزانن. بێگومان جادو نیە، چونكە جادو سەرلێ تێك دەرتانەو ناوەڕۆكی پوچەو ڕاستی لەئێوە وون ئەكا. بەڕاستی جادوگەران سەرناكەون و پیرۆزی بەدەست نایەرن و بەئاواتی خۆیان ناگەن. چونكە درۆزن و پروپوچ خوازن .

﴿ قالُوا أجِئْتَنا لِتَلْغِتْنا عَما وَجَدْنا عَلَيْهِ آباءَنا ﴾ فیرعەون وتاقمەكەی بەموساو هارونیان ووت: ئایا تۆ هاتووی بۆ لای ئێمە بۆ ئەوە تۆ ئێمە لابدەی لەشتێ دەستمان كەوتوە كەباوكانی ئێمە لەسەری بوون، ئەتانەوێ لەپەرستراوی ئەوان لامان بدەن و دوایی.

﴿ وَلَكُمَا الْكِبْرِياءُ فِي الآرْضِ ﴾ وەبۆ ئێوە پەیدا ببێ گەورەیی وپاشایەتی لـەنێو زەوی میسردا، بێگومان ئەوجۆرە گفتوگۆیانە پیشەی هەموکەسێکە ترسـیان هـەبێ پلـەو پایـەو سامانیان لـە دەست دەربچێو نەمێنن .

﴿ وَ ما نَحْنُ لَكُما بِمُؤمِنِينَ ﴾ وەئێمە باوەڕ بەئێوە نایەرین .بەڵکو لـەدژتان ئەوەستین و جەنگتان لـەگەڵ ئەکەین لـەبەر پاراستنی سودی تایبەتی خۆمان و بەردەوامی پلەو پایەمان.

فیرعەون بیری لـەوە ئەکردەوە بەهەر شێوە بێ بەرانبەری موسا بکا، بەلای کەمەوە لـە شـوێنی خۆیـا ڕای وەسـتێنێ. نـەوەك پلەوپایـەی لـەکیس بچـێ و گەلـەکـەی ئـاژاوەی تێنەکەوێ، خوایەتیخۆی لـەدەست دەرنەچێ بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿ وَقالَ فِرْعَوْنُ ائتُوني بِكُلِ ساحِرٍ عَلِيمٍ ﴾ وە فیرعەون ووتـی بـەپیاوانی خـۆی: ئێـوە بۆمنی بهێنن هەموو جادوگەرێکی زۆر زانا لـە هونەری جادودا، بـۆ ئـەوەی پـەکی موسـا بخەن و بۆڕی بدەین، قوڕی بەسەر فیرعەون نەی ئەزانی لـەئەنجامدا چ شتێکی بەسەردێ.

﴿ فَلَّما جاءَ الْسَحَرَةُ قالَ مُوسىأَلْقُوا ماأَنْتُمْ مُلقُونَ ﴾ دوایی کاتێ جادوگەرەکان هـاتن بۆلای موسا ووتی بەوان: ئێوە فـڕە بـدەن لـەگوریس و داردەسـتەکانتان. موسـا ئـەوەی فـەرموێ ئـەوەی لـەفیرعـەون و جادوگـەران بترسـێ، چونکـە خـوا بـەڵێنی پێدابـو بەسەرکەوتن و برِوای بەخۆی هەبوو.

﴿ فَلَّما أَلْقَوا ﴾ دوایی کاتێك جادوگـەرانی فیرعـەون گوریسـەکان و داردەسـتەکانی خۆیانیان فڕەدا گەرمایی خـۆر کـاری کـردە سـەر جیـوەی دەرەوەو نـاوەوەی گوریسـو داردەستەکانیان، بەوبۆنەوە گەوتنە جموجوڵ و دانیشتوان وایان زانـی ئەوانـەبوون بـەمار. بەلاَم لـەبەرچاوا وابون وبێ ناوەڕۆك بوون .

﴿ قالَ مُوسى ماجِئْتُمْ بِهِ السِحْرُ إنَ اللهَ سَيُبْطِلُهُ ﴾ موسافەرموی: شتیکی ئەوتۆ هێناوتانە جادوە، ئەوبەڵگانە فیرعەون و تاقمەکەی ناوی ئەبەن بەجادو جادو نیەو کاری پەك خەرە بۆ ئێوە. بەڕاستیخوا بەم نزیکە پوچ ئەکاتەوە جادوی ئێوە، چونکـە ناوەکـەیان پوچـە و بەرچاویە، ئەوەی خوا بەمی داوە پوچی ڕوی تێ ناکا .

﴿ إنَ اللهَ لايُصْلِحُ عَمَلَ المُفْسِدِيْنَ ﴾ بەڕاستی خوا بەهێزو بەردەوام ناکا کاری خراپەکاران، نای گێڕێ بەوەی سودی لێ وەربگرێ و لەناوی ئەبا و بنەبڕی ئەکا .

﴿ وَيُحِقُّ اللهُ الحَقَّ بِكَلِماتِهِ وَلَوْ كَرِهَ المُجْرِمُونَ﴾ وەخوا ڕائەوەستێنێ و بەردەوامی ئەکا بەهۆی فەرموودەو فەرمانەکانی خۆیەوەو ئاینی ئیسلام دەرئەخا و سەری ئەخاو، باتاوانباران لایان ناخۆش و گرانبێ، نارەزایەتی ئەوان کاری خوا پەك ناخاو ماتەڵی ناکا .

بەرلەوەی موسا داردەستەکەی خۆی فڕەبدا لەکۆڕو کۆبونەویەکی زۆردا و جادوگران بهێنرێ، لەلاوان و تازە پێ گەیشتوانی نەوەی ئیسرائیل باوەڕیان بەموسا هێنابوو، بەم جۆرە خوای مەزن ئەفەرموێ:

فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِۦ عَلَىٰ خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ ۚ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَـٰقَوْمِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴿٨٤﴾ فَقَالُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا وَٱجْعَلُوا۟ بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ

ٱلدُّنۡيَاۖ رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَۖ رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ قَالَ قَدۡ أُجِيبَت دَّعۡوَتُكُمَا فَٱسۡتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٨٩﴾

﴿ فَما آمَنَ مُوسى إلا ذُرِّيَّةٍ مِنْ قَوْمِهِ ﴾ لەیەکەمین کاتێ موسا کرا بەپێغەمەر دوایی باوەڕیان بەموسا نەهێنابو پێش ئەوەی کۆڕی بۆ بگێڕێ مەگەر کۆمەڵێ لەمناڵەکانی خزمەکانی و کەمێ لەگەڵێ فیرعەون و ژنەکەی فیرعەونو تەنها پیاوێك لەنهێنیدا .

﴿ عَلى خَوْفٍ مِنْ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِمْ أنْ يَفْتِنَهُمْ ﴾ لەگەڵ ترسانیان لەفیرعەون وسەرۆکەکانی گەل و پیاو ماقولاڵنی فیرعەون کەوەریان بگێڕن لەئایین و فیرعەون سزایان بدا .

بۆزانین: دوای ئەوەی موسا داردەستەکەی خۆی فڕەداو خوا ڕاستی ئاشکرا کرد لەسەر دەستی موسا لە کۆبونەوەیەکی گشتیدا جادوگەران وژمارەیەکی زۆر باوەڕیان هێنا. بەڵام بەرلە فڕەدانی داردەستەکەی لاوانی بەنوئیسرائیلی هەندێکیان باوەڕیان هێنابو، چونکە تازە پێگەیشتوان لەهەموو گەلێکا بوون بە سۆز بۆ شتی تازە پەیدابو، بەڵام باوەڕیان هێناو ئەترسان لەفیرعەون لەلایەکەوە لەلایەتریشەوە لەسەرۆکەکانی بەنو ئیسرائیلی کەئازاریان بدەن و لەئایین لایان بدەن لەبەر سوودی تایبەتی خۆیان .

﴿ وَإنَ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِي الآرْضِ وَإنَهُ لَمِنَ المُسْرِفِيْنَ ﴾ وەبەڕاستی فیرعەون یاخیەکی زۆرداربوو لەسەر زەوی میسردا، دانیشتوانی میسری ئەچەوساندەوە بەتایبەتی بەنوئیسرائیلیەکان و، بەڕاستی فیرعەون لەوکەسانە بو لایدابو لەسنور، چونکە داوای خوایەتی ئەکرد و ئەوپەڕی گرتبو لەکوشتنی دانیشتوان و ستەم کردندا .

﴿ وَقالَ مُوسى ياقَوْمِ إنْ كُنْتُمْ آمَنْتُمْ بِاللهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إنْ كُنْتُمْ مُسْلِمِيْنَ ﴾ وەموسا ووتی بەو خزمانەی باوەڕیان هێنابوو لەوکاتەدا ترس بەرۆکیانەوە دەرئەکەوت: ئەی خزمانی خۆم ئەگەر ئێوە باوەڕتان هێناوە بەخوا دەری برن بەئاشکرایی و لاتان وابێ قازنج و زیان هەربەدەستی خوایە، دوایی پێویستە ئێوە هەر پشت بەخوا ببەستن کاری خۆتان بەوبسپێرن ئەکەر موسڵمانن و سەرشۆڕی فەرمانی خوان و خۆتانتان داوە بەدەست تووانی خواوە .

﴿ فَقالُوا عَلَى اللهِ تَوَكَّلْنا ﴾ دوایی خزمانی مووسا ووتیان: ئێمە هەر پشت بەیارمەتی خوا ئەبەستین، هەرخوایشە بەئازارو خۆشی هەموکەسێ بزانێ و توانای هەیە بەسەر هەموشتێکا بەتەنها.

﴿ رَبَّنا لاتَجْعَلْنا فِتْنَةً لِّلْقَومِ الظَـالِمِيْنَ ﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە: تۆ ئێمە مەگێڕە بەجێگەی تاقی کردنەوە بۆ تاقمێ ستەمکاران و زاڵیان مەکە بەسەر ئێمەدا و لامان بدەن لەئایین .

﴿ وَنَجِّـنا بِرَحْمَتِكَ مِنَ الْقَـومِ الْكـافِرِيْنَ ﴾ وەتۆ ئێمە ڕزگاربکە بەهۆی بەزەیی ومیهرەبانی خۆتەوە لەتاقمی بێباوەڕان و ستەمکارانی تاقمی فیرعەون و لەستەمی خۆی.

﴿ وَأَوْحَيْنا إِلى مُوسى وَأَخِيْهِ أنْ تَبَوَّءا لِقَوْمِكُما بِمِصْرَ بُيُوتاً ﴾ وەئێمە سروشمان نارد بۆ لای موساو براکەی موسا کەهارونە وفەرمانمان پێ دان دروست بکەن بۆ خزمەکانیان لەشارو گوندەکانی میسردا چەندین خانوێ لەواندا دانیشنو بحەسێنەوە لەنێویانا و پەرستنی خوای تێدابکەن و لەمیسر دەرنەچن .

﴿ وَاجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً ﴾ وەئێوە ئەوخانوانەی خۆتان بگێڕن و بیانکەنبەڕووانگەو بە مزگەوت. هەموتان ڕوبکەن بۆیەك لاو شپرزەو پارچەپارچە مەبن و هەریەکەتان ڕوبۆ لایە بکەن .

﴿ وَأَقِيْمُوا الْصَلاةَ وَبَشِّـرُ الْمُؤْمِنِيْـنَ ﴾ وەئێوە نوێژەکانتان بکەن و بەرپایان بکەن لەومزگەوتانەدا و دڵتان کۆبکەنەوە لەگەڵ یەکتری و لەگەڵ یەکتریدا خوارو خێچ مەبن

و، موسا تویش مـوژدە بـدە بـەباوەڕداران بـەرزگاربوونیان لـەجیـهاندا و بەپلـەی بـەرز لەبەهەشتا .

﴿ وَقَالَ لَهُ مُوسى رَبَّنَا إنَكَّ آتَيْتَ فِرْعَونَ وَمَلآهُ زِيْنَةً وَامْوالاً في الْحَياةِ الدُّنيا ﴾ وەموسا ووتی لـەپاڕانەوەی خۆیا: ئەی پەروەردگاری ئێمـە: بەڕاسـتی تـۆ بەخشـیوتەبەفیرعەون و تاقمەبەرزەکانی شتیٚ خۆیانی بیٚئارایشت ئەدەن لـەبەرگ و شخلٚ و کەلو پـەلی ناومـالٚ و داوتە بەوان چەندین دارایی جۆراوجـۆر لـەم ژیـان و زیندەگـانی جهانـەدا لـەزێڕو زیـو ئالٚتون.

﴿ رَبَّنا لِيُضِلُّوا عَنْ سَبِيْلَكَ ﴾ ئەی پەروەرگاری ئێمە: بۆ ئـەوەی ئـادەمیزاد وەرگـێڕن لـەرێگەی خۆت و لـەپەرستنی تۆ لایان بدەن بۆ لای پەرستنی فیرعەون .

﴿ رَبَّنا اطْمِسْ عَلى أمْوالِهِمْ ﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە: تۆ لـەناوبـبە دارایـی ئـەوان و شوێنەواریان مەیەلٚە باسوودی لیٚوەرنەگرن بۆ لادانـی دانیشـتوان لـەرێگـەی ئـاینی تـۆ. مەبەستی موسا ئەوەیە لایان نەدەن نەك ئەوەبیٚ دارایی نەبەخشیٚ بەبیٚ باوەڕان .

﴿ وَأشْدد عَلى قُلُوبِهِمْ فَلا يُؤمِنُوا حَتّى يَرَوُا العَذابَ الآلِيْمَ ﴾ وەتـۆ سـەختی ودلٚڕەقـی بدەبەسەر دلٚیانا و ئازارو نـاخۆش بدەبەسـەریانا، بـۆ ئـەوەیش دوایـی باوەڕنـەهێنن هـەتا بەچاوی خۆیان ببینن سزایەکی ئازاردەر بەخنکاندنیان لــەنێو ئـاودا، موسـا ئەوپاڕانـەوەی کاتیٚ کرد بەئومێدی باوەڕهێنانیان نەمابوو .

﴿ قالَ أجِيْبَتُ دَعْوَتُكُماَ ﴾ خوا فەرمووی: وەلاٚمـی پاڕانەوەکـەتان وەرگـیرا، ئـەوەی داوای ئەکەن جیٚبەجیٚ ئەکریٚ، ئارایشـت و دارایـیو ڕابواردنـی ئـەوان لـەناوئەبـەین و دلٚیان ڕەق ئەکەین، چونکە ئەقلٚی خۆیان ناخەنەکار .

﴿ فَاسْتَقِيْما وَلاتَتَّبِعانِ سَـبِيلَ الَّذِيْـنَ لايَعْلَمُـونَ ﴾ دوایـی ئێـوە هـەردووکتان ڕاوەسـتن لـەسەر ڕاگەیاندنی پەیامی ئێمە و بڕۆن لـەسەرکاری خۆتان هەتا دێت بـۆلای فیرعـەون و تاقمەکەی سزای ئێمەو پەیرەوی کەسانێکی ئەوتۆ مەکەون نـەزانن و باوەڕیـان بەبـەلٚێنی ئێمەی نەبیٚ، موژدەو هەڕەشەی ئێمە گۆڕان و نـەبوونی تێدانـابیٚ و دێنـە بونـەوە. ئـەبیٚ

بزانرێ قەدەغەکردنی پارێزراوان لەگوناه وەك پێغەمەران دروستە لەلایەن خوای گەورەوە، چونکە لەخواوەیە نەك لەجگەی خواوە، بۆ بالآتر هەیە فەرمان بداو قەدەغە بکا لەهەمو کەسێ، ئیتر با پلەیشی بەرزبێ وەك پێغەمەران .

لەپاشا خوای مەزن باسی ئەوسزا گرانە ئەکا، ڕونی ئەکاتەوە ئەنجامی پاشەڕۆژی فیرعەون و تاقمەکەی و ئەفەرموێ :

وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ وَجُنُودُهُۥ بَغۡيٗا وَعَدۡوًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ وَلَقَدۡ بَوَّأۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدۡقٖ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ فَمَا ٱخۡتَلَفُواْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقۡضِي بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٩٣﴾

﴿ وَجاوَزْنا بِبَنِي إِسْرائِيلَ البَحْرَ ﴾ وەئێمە بەنوئیسرائیلیەکانمان پەڕاندنەوە لەدەریای سور بەخۆشی وبەتەندروستیەوە، بەبێئەوەی ئاوی دەریاکە تەریان بکا هەتا گەیشتنە ووشکانی لەکەناری دەریاکە .

﴿ فَأَتْبَعَهُ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ بغيا وَعَدْواً ﴾ دوایی فیرعەون و سەربازەکانی کەوتنە دوای بەنو ئیسرائیلیەکان لەبەرئەوەی ستەمیان لێبکەن و دەست درێژی بکەنە سەریان، لەبەرئەوەیش لەسنوری خوا لایاندابووبەخراپەکردن لەگەڵ بەنو ئیسرائیلیەکاندا بەگوێرەی ویستی خۆیان لەکوشتن و ئازاردانیان. بەلاّم ویستی ئەوان شپرزەکراو موساو گەلەکەی ڕزگاربوون، فیرعەون وگەلەکەی لەناوچوون و خنکان، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ حَتَّى إذا أدْرَكَهُ الغرقَ﴾ هەتا کاتێ گەیشتە فیرعەون خنکان بۆی دەرکەوت ئەخنکێو لەناوئەچێ ئەوکاتە هۆشی هاتەوە بەخۆیاو دەمارەکەی پارچە پارچە بوو دەسەلاّتی نەما .

﴿ قَالَ آمَنْتُ أنَهُ لاإله إلاّ الَّذيْ آمَنَتْ بِهِ بَنُو إسْرائِيْلَ وَأنَا مِنَ الْمُسْلِمِيْنَ ﴾ فیرعەون وتی: باوەڕم هێنا کەبەڕاستی هیچ خوایە نیە پەرستنی بۆ بکرێ مەگەر خوایەکی ئەوتۆ بەنو ئیسرائیلیەکان باوەڕیان پێهێناوەو دوای فەرمانەکانی کەوتوون و، من لەوکەسانەم موسڵمانن و مل کەچی خوام. فیرعەون لەوکاتەدا وازی لەخوایەتی هێنا ، بەلاّم ئەوباوەڕو مل کەچیە سودی پێ نەبەخشی، وەك خوای مەزن ئەفەرموێ :

﴿ ألآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبلُ وَكُنْتَ مِنَ الْمُفْسِدِيْنَ ﴾ ئائێستا باوەڕئەهێنیو بێدەسەلاّتی و لەمەوبەر تۆ بێفەرمانی خوات کردو لەئامۆژگاری پێغەمەرەکەت دەرچووی، کاتێ لەتواناتا هەبو پەشیمان ببێتەوە باوەڕت نەهێناو یاخی بوویت وستەمت بەکارهێناو، تۆلەوکەسانە بوویت خراپەت ئەکردو دانیشتوانت لەڕێگەی ڕاست لائەداو خۆیشت لەڕیگەی ڕاست لات دابوو. کەواتە بچێژە تۆڵەی کردەوەی خۆت بەخنکان و بەلەناوچوون، تۆئەگەڕێیت بەمردارۆبویەکی بێزلێکراوەو دانیشتوان بەو شێوەیە ئەت بینن، هەتا تەمیخواربن بەبۆنەی تۆوە ، وەك خوائەفەرموێ:

﴿ فَالْيَوْمَ نُنْجِيكَ بِبَدَنِكَ لِيَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً ﴾ دوایی کەخنکایو مردی ئەورۆژە ئێمە تۆ ئەپارێزین بەلەشەکەتەوە وەبەمردوویی و نایەڵین بکەوێتە ژێردەریاوەو بێ بەخۆراکی زیندەوەرانی نێو دەریاکەو کەس نەت بینێ، بەڵکو بەهۆی شەپۆلی ئاوەکەوە

فڕێت ئەدەینە فەراغی دەریاکەوە، هەتا دانیشتوان سەیرت بکەن و بێ نرخ تۆیان بۆ دەربکەوێ، بۆئەوەی تۆ ببی بەنیشانەو تەمێ خواری بۆ کەسێ لەپاش تۆوە دێت، ئیسرائیلیەکانیش باوەڕیان زۆرتر بێ، لەم بەسەرهاتەی فیرعەونەدا ئامۆژگاری زۆری تێدایە بۆ ئادەمیزاد.

﴿ وَإِنَّ كَثِيراً مِنَّ النَاسِ عَنْ آياتِنا لَغافِلُونَ ﴾ وەبەڕاستی زۆرکەس لەئادەمیزاد بێئاگان لەنیشانە ڕونەکانی ئێمەو بیرناکەنەوە لەوان هەتا تەمێخواربن .

﴿ وَلَقَدْ بَوَّأْنا بِبَنْي إِسْرائِيْلُ مَبَّو أصِدْقٍ ﴾ دوای ئەوەی موساو گەلەکەیمان ڕزگارکردن لەستەمی فیرعەون بەڕاستی ئێمە ئیسرائیلیەکانمان دانان لەجێگەیەکی چاك و پەسەند شایستە بێ بۆگوزەرانیان لە هەرزانی هەرێمەکەیانا دوای لەناوبردنی فیرعەون .

﴿ وَرَزَقْناهُمْ مِنَ الطَّيْباتِ ﴾ وەئێمە بەخشیمان بەبەنو ئسرائیلی هەندێ لەخوادرەمەنیە پاك، بەتام و هەتا لەخۆشیدا بژین بەچاکترین ژیان.

زانایان لەدیاری کردنی ئەوهەرێمەدا بیریان جیاوازە: هەندێکیان ئەڵێن: ئەوهەرێمە فەلەستینە، هەندێتریان لایان وایە بریتیە لەمیسر و ئەمەیان بەهێزترە بەهۆی فەرموودەی خوا لەئایەتی ( ٥٨) ی سورەتی شوعەرادا ئەفەرموێ: ئێمە فیرعەون وگەلەکەیمان دەرکرد لەنێو چەندین بێستان وسەرچاوەی ئاو و گەنج و جێگەی خۆش، هەر بەو وێنەوە ئێمە ئەو جێگانەمان بەخشی بەبەنو ئیسرائییلیەکان. ئەو ئایەتە بەئاشکرا وائەگەیەنێ خوا بەنو ئسرائیلیەکانی دانا لەجێگەکانی فیرعەونا.

﴿ فَمَا اخْتَلَفُوا حَتّى جاءَ هُمْ الْعِلم ﴾ دوایی بەنو ئیسرائیلیەکان ئاژاوەیان نەبو لەئایینی خۆیانا و یەك پارچە بوون و لەسەریەك ڕێگە ئەڕۆیشتن هەتا کاتێ هات بۆ لای ئەوان زانیاری بەتەورات، دوایی بەدژی مەبەستی فەرمانی تەورات هەڵسان و پارچە پارچەبون و بیروباوەڕی جیاوازیان پەیداکرد و داوای زۆرشتی نەگونجاویان کرد لەموساو ناونیشانی پێغەمەری ئیسلامیان لەتەوراتا گۆڕی و باوەڕیان پێنەهێنا .

﴿ إِنَ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ القِيَامَةِ فِيما كانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ بەڕاستی پـەروەردگاری تۆ فەرمان ئـەدا لـەنێوان بـەنو ئیسـرائیلیەکانا لەپاشـەڕۆژدا لەشـتێکا ئـەوان شـپرزە و ناکۆکیان تێدا ئەکەن، چاکەکەران و خراپەکاران لـەیـەك جویـی ئەکرینـەوەو پاداشـت و تۆڵـەی خۆیان وەرئەگرن لەورۆژەدا .

لـەپاشا خوای گەورە ڕاسـتی پێغەمەرایـەتی مەحەمـەد ڕون ئەکاتـەوە، دوای ئـەوەیش باسی بەسەرهات و مێژووی پێغەمەرانی پێشووی باسکردو ئەفەرموێ:

فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٩٧﴾

﴿ فَإِنْ كُنْتُ فِي شَكٍ مِمّا أنزَلْنا إِلَيْكَ ﴾ دوایی ئەگەر تـۆ لـەگوماندای لەشـتێك ئێمـە ناردومانەتـە خـوارەوە بـۆ لای تـۆ لـەباس و بەسـەرهاتی موسـاو پێغەمـەرانی تـر، یـانێ بەوکەسانە بڵێ گومانیان هەیە لەو ڕاگەیاندنانەی تۆ بەوجۆرەی تۆ باست کردوە.

﴿ فَسأَلَ الَّذِيْنَ يَقْرَأونَ الْكِتابَ مِنْ قَبْلِكَ ﴾ دوایی تۆ پرسیاربکە لەکەسـانێکی ئـەوتۆ نامەکانی خۆیان ئەخوێننەوە لـەپێش تۆوە هاتووە بۆ پێغەمەرەکانی ئـەوان، لـەزانا خـاوەن نامەکان بپرسە، ئەوان هەواڵـت ئەدەنێ کەئەو هەواڵانە تۆ بەوانت ووتوە ڕاسـتە لـەباسـی ئەو پێغەمەرانەدا، ناوونیشانی تۆیش لـەونامەدا نوسراون .

﴿ لَقَدْ جاءَكَ الْحَقُّ مِنْ رَّبِكَ ﴾ بەڕاستی هاتوە بۆ لای تۆ لەلایەن پەروەردگاری تۆ و ڕاستی کەقورئان و ئاینی ئیسلامە بەڵگە و نیشانەی ڕونەوە. کەواتە بەرانبەر بەوکەسانە گومانیان هەیە لەڕاستی ئەوشتەی ئێمە ناردومانە تۆ زۆر توندو تیژ بە لەگەڵیان، لەباوەڕی خۆتا دوودڵی ڕووت تیَنەکا و بەردەوام بە لەسەر باوەڕی خۆت، وەك خوای مەزن فەرمان ئەدا بەپێغەمەرو ئەفەرموێ:

﴿ فَلا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِيْنَ ﴾ دوایی تۆ لەوکەسانە مەبە گومانیان هەیە لەوشتەی هاتوە بۆ لای تۆ دڵت جوڵەی تیَ نەکەویَ، هەروەوەك باوەڕی پێشوی خۆتبە لەبەردەوامیدا .

﴿ وَلاتَكُونَنَّ مِنَ الَّذِيْنَ كَذَّبُوا بِآياتِ اللهِ ﴾ وەتۆ لەکەسانێکی ئەوتۆ مەبە باوەڕیان بەنیشانەکانی خوا نیەو بەدرۆیان ئەخەنەوەو باوەڕیان بەئایەتەکانی ئەو قورئانە نیە هاتوە بۆ لای تۆو تەمیَ خوار نابن بەو شتانەی توشیان بوە، هەموویان زیانیان بەخۆیان گەیاندووە.

﴿ فَتَكُونَ مِنَ الْخاسِرِيْنَ ﴾ دوایی تۆ ببی لەڕیزی ئەو کەسانەدا زیان بەخۆیان ئەگەیەنن، بائەوەیش بزانریَ ئەو هەموە ڕوییَکراوانە بۆ لای پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لەناوەڕۆکا ڕوکردنە بۆ لای جگەی پێغەمەر لەوکەسانەی گومانیان هەیە. ئەگینا پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ نەگومانی هەیە ونەئایەتەکانی بەدرۆ ئەخاتەوە

﴿ إنَّ الَّذِيْنَ حَقَتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لايُؤمِنُونَ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ چەسپاوە بەسەریانا فەرمودەی پەروەردگاری تۆ بەوەی بەبیَ باوەڕی ئەمرن وبەردەوام ئەبن لەسەری، باوەڕناهێنن چونکە فەرموودەی خوا بەدروناخرێنەوەو فەرمانی تێك نادریَ و باوەڕناهێنن .

﴿ وَلَوْ جاءَتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَى يَرَوُا العَذابَ الآلِيْمَ ﴾ وەئەگەر چی هاتوە بۆ لایان هەموو نیشانەو بەڵگەیە لەسەر ئەو شتەی تۆ هێانوتە، ئەوکەسانە باوەڕناهێنن هەتا بەچاوی خۆیان سزای خاوەن ئازار ئەبینن، ئەوکاتەی کاتی بیَ ئومێدیە، باوەڕهێنان بیَسودە بۆیان .

کاتیّ خواباسی ئەوەی کرد خوا باوەڕی لەفیرعەون وەرنەگرت کاتی بینینی سزا، خـوا ئەوباسەی فیرعەونی لکان بەباسی باوەڕهێنانی تاقمی یونــس بەرلەهاتنـەخوارەوەی سـزا، وەك خوا لەئایەتی (٩٨) ی ئەم سورەتە باسی ئەفەرمویّ :

بۆ زانین: کورتەی باسی گەلی یونس بەم جۆرەی خوارەوەیە :

ئەوگەلـە دانیشتووی ( نەینەوا ) بوون لـەنزیکی ( موسلّ )بتیـان ئەپەرسـت، خـودای مەزن یونسی پێغەمەری نارد بۆ لایان، داوای لیّکردن واز لـەبت پەرستی بێنن، ئەو گەلــە یەکەمین جار وەلاّمی یونسیان نەدایەوە. بەلاّم یونــس نزیکـەی نۆسـالّ لـەنێویانا مایـەوەو ئامۆژگـاری ئـەکردن و ئەیفـەرموو: بـت پەرسـتی سـودبەخش نیـە. ئـەو گەلــە هــەر بەردەوامبون لـەسەر بیّباوەڕی خۆیان، کاتیّ کەیونس بەتەمای چاکەو باوەڕی ئەوان نەما، ئاگاداری کردن لـەدوای سیّ ڕۆژ سەرلـەبەیانیەکەی خوای گەورە سزا ئەنێرێتە خـوارەوە بۆ سەرتان. ئەو گەلــە بەیـەکتریان ڕاگـەیاند کـەچاودێری یونـس بکـەن ئەگـەر مایـەوە لەناویانا ترسیان نەبیّ لەوسزایە، ئەگـەر ڕۆیشـتە دەرەوە ئـەوا بێگومـان ئەوسـزایە دێتـە خوارەوە بۆ سەریان، لـەشـەودا یونـس تێشـووی خـۆی هـەڵگرت چـوە دەرەوە. بـەیانی گەلـەکەی هەڵسان و گەڕان یونسیان نەدی، بۆیان دەرکەوت یونس ڕاستی فەرمووە سـزا ئەرژیّ بەسەریانا، دوایی ئەو گەلــە پەشیمان بونـەوە لـەبت پەرسـتی. بـەرگی کۆنیـان لەبەرکرد لـەشار دەرچوون بەژن و خێزانەوەو بەئاژاڵیانەوە. ڕو بەنزاو پاڕانەوە لــەخوای مەزن، هەرستەمێکیان لـەیەکتری کردبوو گـەردنی یـەکیان ئـازاد کـرد، بەوبۆنـەوە خـوا لـەوان خۆشبوو سزاکەی لـەسەر هەڵگرتن بەرلـەوەی برژیّ بەسەریانا، ئەگـەر سـزاکەیان بهاتایە خوارەوە بەتەواوی باوەڕهێنانەکەیان قازانجی نەئەبوو بۆیان بەوێنەی گەلی فیرعەون، لـەمەوپاش لـەسورەتی ( سافاتا) بـەدرێژی باسی بەسـەرهاتی یونـس و گەلـەکـەی دێـت. ژمارەی ئەو گەلـەی یونس سەدهەزار یا زۆرتر بون، خوا نـاوی یونسـی بـردووە بەیـەکیّ لـەپێغەمەران و لـەپیاو چاکان، ناوی بردوە بەخاوەن حوت، خوای مەزن لـەبارەی یونس و گەلـەکەیەو ئەفەرمویّ:

فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٩٨﴾ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٠﴾

﴿ فَلَوْ لا قَرْيَةٌ آمَنَتْ فَنَفَعَها إيمانُها إلا قَوْمَ يُونِسَ ﴾ دووایی بۆ دانیشتوانی هیچ گوندێ لەگوندەکانی نەبوە بێفەرمانی خوایان کردبێلەکاتی هاتنە خوارەوەی سزادا بۆ سەریان باوەڕیان هێنابێ ئەو باوەڕهێنانەیان سوودی بەخشیبێ بەوان باوەڕەکەیان لەوکاتەدا، جگەلە تاقمی یونس باوەڕهێنانیان سوودی پێ نەبەخشین لەکاتی هاتنە خوارەوەی سزادا .

﴿ لَمَّا آمَنُوا كَشَفْنا عَنْهُمْ عَذابَ الخِزْيِ في الحَياةِ الدُّنْيا وَمَتَّعْناهُمْ إلى حِينٍ ﴾ کاتێ تاقمی یونس باوەڕیان هێنابوو لەکاتی بینینی سەرەتای هاتنی سزاکەیان ئێمە لامان برد لەوان سزای ڕسواکردنیان لەزیندەگانی جیهانداو ،ئێمە خۆشی و ڕابواردنمان بەخشی بەوان لەجیهاندا هەتا کاتی تەواو بونی ئەندازەی تەمەنیان بێسزا. کاتێ خوای مەزن لەمەوبەر روونی کردەوە کە باوەڕهێنان بەتۆبزی سودی نیە بۆ خاوەنەکەی، ئەگەر باووەڕهێنان بەزۆر سودی ببوایە خوا هەموو دانیشتوانی زەوی ناچار دەکرد بۆ باوەڕهینان، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿ وَلَوْ شاءَ رَبُّكَ لآمَنَ من الآرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيْعاً ﴾ وەئەگەر پەروەردگاری تۆ ئارەزووی بکردایە بەڕاستی باوەڕیان ئەهێنا کەسانیٚ لەڕوی زەوین هەموویان بەتەواوی . بەلاّم ئارەزووی ئەوەناکا باوەڕ بهێنیٚ هیچ کەسیٚ مەگەر بەئیختیارو سەربەستی خۆی باوەڕبهێنیٚ

﴿ أفَأَنْتَ تُكْرِهُ النّاسَ حَتّى يَكُونُوا مُؤمِنِيْنَ ﴾ ئایا دوایی تۆ ئەتەوێت ئادەمیزاد ناچاربکەی بەزۆر هەتا ئەوان باوەڕبهێنن. کەواتە تۆ زۆریان لیٚمەکە بۆ باوەڕهێنان ئەو شتە لەتوانای تۆدا نیە، خوا تووانای هەیە بەلام سەربەستی بەخشیوە بەهەموو کەسیٚ و ئەتوانن باوەڕبهێنن .

﴿ وَماكانَ لِنَفسٍ أنْ تُؤمِنَ إلا بِأذْنِ اللهِ ﴾ وەپێویست نیە بۆ هیچ کەسیٚ خوا دروستی کردوە کەباوەڕ بهێنیٚ مەگەر بەدەستورو فەرماندانیخواو زانیویەتی باوەڕنەهێنیٚ .

﴿ وَيَجْعَلُ الّرِجْسَ عَلَى الّذِيْنَ لايَعْقِلُونَ ﴾ وەخوا ئەگێڕیٚ و دائەنیٚ بیٚباوەڕی وسزا بەسەر کەسانێکی ئەوتۆ بەکارنایەرن ئەقلّ و بیری خۆیان بۆ دۆزینەوەی بەلّگە لەسەر ڕاستی تۆو ئایینی ئیسلام .

لەپاشا خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە شتیٚ کەکاریگەر بیٚ بۆ ئەو گەلانەی کەبیەویٚ شارەزایان بکا بۆ لای چاکەو ئەفەرمویٚ:

قُلِ انظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾ فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِهِمْ ۚ قُلْ فَانتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُنتَظِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ نُنَجِّي رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا ۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ الْمُؤْمِنِينَ

﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٥﴾ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾ ﴾ (١٠٣)

﴿ قُلْ انْظُرُوا ماذا فِي السَماواتِ وَالآرْضِ ﴾ تۆ بڵێ بەبت پەرستان: ئێوە تەماشابکەن و ببینن چ شتێکی ئەوتۆ لەئاسمانەکان و لەزەویدان، ئەگەر ئێوە ووردببنەوە لەوشتانە ئەبینن بەڵگەو نیشانەی زۆر لەسەر تواناو یەکێتی خوای گەورە. بەڕاستی ئەو ئاسمانانە بەو ئەستێرانەوە لەناویاندان هاتوچۆئەکەن هەریەکەیان لەجێگەی خۆیا، کێشانی یەکتری و ڕاگرتنی هەموویان بۆ یەکتری، زەویش بەوانەوە لەسەرینی و لەناویدان لەئادەمیزاد و گیانەوەرانی تر و گژوگیا و کانگاکان، گۆڕانیان بەهاتنی شەو ورۆژ و گەرماو سەرما و هەرزانی وگرانی، ئەوانە هەموویان بەڵگەن لەسەر دەسەڵات و یەکێتی خوای مەزن .

﴿ وَماتُغْنِي الآياتُ وَالنُذُرُ عَنْ قَوْمٍ لايُؤمِنُونَ ﴾ وەسوود نابەخشێ چەندین نیشانەی ڕوون چەندین ڕەوانەکردنی پێغەمەرانی ترسێنەر بەتاقمێ باوەڕنایەرن، مرۆڤی ژیر نەبێ بەوبەڵگە وپێغەمەرانە تەمێ خوارنابن، ئەوکەسانە بەگوێرەی سروشتی خۆیان ئامادەنین بۆ باوەڕهێنان. کەواتە بەڵگەو هەڕەشەو مۆژدەی ترسێنەران سوودی نابێ بۆیان، ئەو کەسانە جگە لەسوودی خۆیان لەجیهاندا دوژمنی هەموو بەڵگەیەکن و بیر لەهیچ شتێ ناکەنەوە .

﴿ فَهَلْ يَنْتَظِرُونَ إلا مِثْلَ أيامِ الَّذِيْنَ خَلَوْا مِنْ قَبْلِهِمْ ﴾ دووایی ئایا ئـەو بـت پەرستانە چاوەڕووانی هیچ شتێ ئەکـەن لـەبەڵگـەو نیشـانە و چ شـتێ ماوەتـەوە بۆیـان ؟ مەگـەر چاوەڕووانی ڕووداو هاتنە خوارەوەی سزایە بکەن بێت بۆ سەریان بەوێنەی سزای ڕۆژانێ توشی کەسانێکی ئەوتۆ بوون ڕۆیشتبون لـەپێش ئەوانەوە لەوێنەی گەلانی نـوح و عـاد و سەمود و جگەی ئەوانیش. بێگومان ئەوەی تووشی گەلانی پێشوو بـوە تووشـی ئـەمانیش ئەبێ کەواتە تۆ هەڕەشەیان لێ بکەو بیان ترسێنە .

﴿ قُلْ فَأنْتَظِرُوا إني مَعَكُمْ مِنَ الْمُنتظِرِيْنَ ﴾ تۆبلـێ کەواتـە ئێـوە چـاوەڕوانی ئەوسـزایە بکەن دیتە خوارەوە بۆ سەرتان بەڕاستی مـن لـەگـەڵ ئێـوە دا لـەوکەسـانەم چـاوەڕووانی ئەکەن .

بەڕاستی یاسای خوا لـەگەڵ ئادەمیزاد ئەوەیە: کەپێغەمەران ئەنێرێ بـۆ لایـان مـوژدە ئەدا بەوان بەکردنی چاکە، ئەیان ترسێنێ لـەکردنی کاری خـراپ، هـەندێکیان باوەڕبـەو پێغەمەرانە ئەهێنن، هەندێ تریان بەدرۆیان ئەخەنەوە، ئەوانەیان باوەڕناهێنن خوا لـەناویان ئەبا.

﴿ ثُمَّ نُنَجِي رُسُلِنا وَالَّذِيْنَ آمَنُوا ﴾ لـەپاشا ئێمە ڕزگار ئەکەین فروستادەکانی خۆمـان و ئەوکەسـانەی ئـەوتۆ باوەڕیـان هێنـاوە لەوسـزایەو لـەناوبردنیان، لـەپاش لـەناوبردنی بێباوەڕان.

﴿ كَذَلِكَ حَقًّاً عَلَيْنا نَنْجِ الْمُؤمِنِيْنَ ﴾ هەربەوجۆرەی پێغەمەران وباوەڕدارانمان ڕزگارکرد هەربـەوجۆرە پێویسـتە لـەسـەر ئێمـە بـەهۆی گـەورەیی خۆمانـەوە ئێمـە ڕزگاربکـەین ئەوکەسانە باوەڕیان هێناوە بەمەجەمەد، ئەوانیش دوژمنی ئەوانن لەناویان ئەبەین .

لـەپاشا خوای مەزن فەرمان ئەدا بەپێغەمەری خۆی بێزاری خـۆی دەربـڕێ لـەهـەموو پەرستراوێ جگەی خوابێ‌و ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ ياأيُها الْناسُ إنْ كُنْتُمْ فِيْ شَكٍ مِنْ دِيْني ﴾ تۆ بلێ ئـەی ئـادەمیزاد :ئەگـەر ئێـوە لـەگوماندان لـەبۆ ڕاستی ئەم ئایینەی من کەبۆ ئێوەم ڕاگەیاندوە و بۆم ڕون کردونەتەوە .

﴿ فَلا أعْبُدُوا الَّذِيْنَ تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللهِ ﴾ دوایی من ناپەرستم کەسانێکی ئەوتۆ ئێوە ئەیان پەرستن لەجگەی خوایە کەسوودیان نیە بۆ خۆیان و جگەی خۆیان، زیان بەکەس ناگەیەنن .

﴿ وَلَكِنْ أعْبُدُ اللهَ الَّذِيْ يَتَوَفّاكُمْ ﴾ وەبەلام من ئەپەرستم خوایەکی ئەوتۆ ئێوە ئەمرێنیّ، کام لەو دوو پەرستراوانە شایانی پەرستنە ؟ ئەو پەرستراوەی من یا ئەوپەرستراوەی ئێوە ؟

﴿ وَاُمِرْتُ أنْ أكُونَ مِنَ المُؤمِنِيْنَ ﴾ وەمن فەرمانم پێدراوە کەمن لەوکەسانەبم باوەڕئەهێنن بە فەرمانەکانی خوای گەورە بەهۆی شتێکەوە کەئەقڵە، وبەهۆی شتیّ بەسروش نێردراوە بۆ لای من .

﴿ وَأنْ أقِمْ وَجْهَكَ لِلْدِّيْنِ حَنِيْفاً وَلاتَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِيْنَ ﴾ وەفەرمانم پێدراوە: کەتۆ ڕاوەستێنە دەرونی خۆت و ڕوی پیّبکە بۆلای ئایینی من بەجۆریّ فەرمانت پیّداوی بەردەوام بەلەسەری ڕوو وەرمەگێڕە بۆ لای ئایینیّ تر، وخوا ئەفەرمویّ بەمن: تۆ لەوبت پەرستانە مەبە پەرستنی جگەی خوا ئەکەن .

﴿ وَلاتَدْعُ مِنْ دُونِ مالايَنْفَعُكَ وَلايَضُرُّكَ فَإنْ فَعَلْتَ فَإنَكَ مِنَ الظّالِمِيْنَ ﴾ وەتۆ مەپەرستە لەجگەی خوا شتیّ سوود بەتۆ نەداو زیان بەتۆ نەگەیەنیّ، ئەگەر نەیشی پەرستی ئازارت پیّ ناگەیەنیّ، دوایی ئەگەر تۆ ئەوکارە بکەی و جگەی خوا بپەرستی، دوایی بەڕاستی تۆ لەوکەسانە ئەبی کەستەمیان لەخۆیان کردوە، پەرستنیان لەجێگەی شیاوی خۆیا دانەناوە، بێگومان پێغەمەری خوا ئەوەی نەکردووە.

بۆزانین: ئادەمیزاد کاتیّ وائەبیّ تووشی ئازارو زیان ئەبن بەهۆی ئەوشتانەوە خۆیان ئەیکەن. بەلام خوای مەزن سەربەستی پیّ بەخشیون، وایش ئەبیّ شتی وائەکەن ئەبێتە هۆی سوودیان، ئەوانە هەمویان نادرێنەپاڵ خوا، چونکە ئازادو سەربەستن لەکردنی هەموویانا، هەندیّ شت هەن ئادەمیزاد دەستەلاتی خۆیانی تێدا نیە، وەك ئەوەی هەورە گرمەیە لەئاسمانەوە دێت و ئەی کوژیّ، یاخوا بەگێل و گەوج یابەگەورەو زیرەك دروستی ئەکا، ئەوانەو زۆرشتی تر بەدەستی خوایە بەتەنها، وەك خوای مەزن بەبۆنەی ئەوبەشەی دواییان ئەفەرمویّ :

وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٨﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَٱصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾

﴿ وَإنْ يَمْسَسْكَ اللهُ بِضرٍ فَلاكاشِفَ لَهُ إلا هُوَ ﴾ وەئەگەر خوا توشی تۆی بکا ئازاری لەنەخۆشی و هەژاری، دوایی کەسێ نیە لابەری ئەو ئازارەبێ مەرگە خوا، ئیتر ئەو ئازارەی توشی خۆت ببێ یاتوشی دارایی و خێزانت، ئەگەر هەمو بوبنەوەران کۆ ببنەوە بۆ لابردنی ناتوانن لای ببەن .

﴿ وَإنْ يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلا رادّ لِفَضْلِهِ ﴾ وەئەگەر خوا ئارەزوو بکا و بیەوێ چاکەیە ببەخشێ بەتۆ لەلەش ساغی ولەهەرزانی بۆ خۆت یابۆ خێزانت، دوایی هیچ کەسێ نیە بگێڕێتەوە و ڕێگە بگرێ لەوئارەزووی خوایە، هەروەها بونەوەران هەموویان کۆ ببنەوە ئەو شتەی خوا بیەوێ بیدا بەتۆ لەتوواناییان نیە گەڕانەوەی ئەوشتە .

﴿ يُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشاءُ مِنْ عِبادِهِ ﴾ خوا ئەگەیەنێ بەبەندەکانی خۆی هەرکەسێ لەوان ئارەزووی هەبێ هەمویەکێ لەوزیان و چاکەیە، هەر خوایە بەتەنها خاوەنی دان ونەدان ببەخشێ بەبونەوەران بەتەنها .

﴿ وَهُوَ الغَفُورُ الرَحِيْمُ ﴾ وەهەر خوایە لێخۆشبوونی زۆرە بۆ گوناهباران، میهرەبان و خاوەنی بەزەییە بۆ هەمو کەسێ لەخوا پەرستان .

لەپاشا خوای مەزن کۆتایی بەم سورەتە دێنێ بەئامۆژگاری زۆر چاك لەبەردڵدانەوەی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بەموژدەدانیش بەباوەڕداران و هەڕەشە کرد ن لەبێباوەڕان و ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ ياأيُها النْاسُ قَدْ جاءَ الْحَقُّ مِنْ رَبِكُم ﴾ تۆ بلّێ ئەی ئادەمیزاد: بەڕاستی هاتوە بۆ لای ئێوە ڕاستی لەلایەن پەروەردگاری خۆتانەوەلەنامەی خواو پێغەمەری خوا .

﴿فَمَنْ اهْتَدى فَإنَما يَهْتَدي لِنَفْسِهِ ﴾ دوایی هەرکەسێ ڕانومایی وەرگرێ، دوایی ڕانومایی ئەو وەرگرتنە سوودی هەر بۆ خۆیەتی بەتەنها .

﴿ وَمَنْ ضَلَّ فَإنّما يَضِلُّ عَلَيْها﴾ وەهەرکەسێ ڕێگەی وون کردبێ و لەڕاستی لای دابێ، دوایی بەڕاستی ئەوکەسە ئەنجامی خراپەی لەڕێگە لادانەکەی هەر لەسەر خۆیەتی بەتەنها .

﴿ وَما أنَا عَلَيْكُمْ بِوَكِيْلٍ ﴾ وەمن ئاگادارییم نیە بەسەر ئێوەداو کاری ئیوە بەمن نەسپێرراوە. بەڵکو من بەتەنها موژدەدەرو ترسێنەری ئێوەم، هەموو کارێکتان هەرخوا ئاگاداری ئەوانەیە .

﴿ واَتبع ما يُوحَى إلَيْكَ ﴾ وەتۆ پەیڕەوی شتی بکە بەسروش ئەنێرێ بۆ لای تۆ، چەشتێکت فەرمان پێئەدا ڕای بگەیەنە بەئادەمیزاد و خۆیشت کاری پێبکەو بەورووناکیەدا برۆ .

﴿ وَأصْبِرْ حَتَى يَحْكُمَ اللهُ وَهُوَ خَيْرُ الحاكِمِيْنَ ﴾ وەتۆ ئارام بگرە لەسەر ئازارو ئێشێ ئەو کەسانە دژی تۆن لەبێ باوەڕانی مەکە، هەتا کاتێ خوا فەرمان ئەدا لەنێوان تۆو ئەواندا، یاتۆ سەرئەخا یا فەرمانت پێئەدا بۆ جەنگ کردن لەگەڵیان، تۆ هیچ خراپەیەکی ئەوانت توشنابێ لەو ئارام گرتنەی تۆدا، وەهەر خوایە چاکترینی هەموو دادوەراێ و فەرمان بدا لەنێو ئادەمیزادا لەڕووی دادپەروەریەوە هەڵە لەخوای مەزنەوە دوورە، نهێنی وئاشکرای ئادەمیزاد ئەزانێ، خوایەکی ئەوتۆیە ئەبەخشێ بەهەموو کەسێ مافی خۆی ئەگەیەنێ بەهەموو کەس بەشی خۆی لەپاداشت وتۆڵە .

# ﴿ سورەتی هود ﴾

ئەو سورەتە لای زوربەی زانایان لە مەکە هاتۆتە خوارەوە هەموو ئایەتەکانی، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: جگە لە ئایەتی (١١٤) لە مەدینە هاتۆتە خوارەوە، ئەم سورەتە دوای سورەتی یونس هاتۆتە خوارەوە. ئایەتەکانی (١٢٣) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر ۚ كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۚ إِنَّنِى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ ﴿٢﴾ وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ ۖ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴿٣﴾ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤﴾

﴿ ألم ﴾ لە سەرەتای سورەتی ئالی عەمراندا مانای ئەو پیتانە کراوە. لە سورەتی ئەلبەقەرەدابیروبۆچوونی زۆر لە زانایان باسکراوە لە بارەی ئەو پیتانەوە. لەم سورەتەیشدا بایسی بیری هەندێ لە زانایان لە بارەی مانای ئەو پیتانەوە ئەکەین. زاناکان هەندێکیان ئەڵێن: هاتنە خوارەوەی ئەو جۆرە پیتانە بەڵگەی بێگومانن لەسەر ڕاستی پێغەمەرایەتی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ یانێ مرۆڤێکی نەخوێنەوار ئەو نامەیەی لەلای خوای مەزنەوە بۆ نەهاتبێ چۆن ئەزانێ ئەو نامەیە لەم پیتانە پێك دێت. ئەمە لەلایەکەوە لە لایە ترەوە کە لەو پیتانە پێك دێت و بە زمانی عەرەبیشە بۆ زمان پاراوانی عەرەب ناتوانن وێنەی سورەتێ لەو نامەیەدا بنێن. کەواتە بەبێ گومان دروست کراوی ئادەمیزاد نیەو فەرمودەی خوای گەورەیە بە تەنها.

﴿ كِتابٌ أحْكِمَـتْ أياتُـهُ ﴾ ئـەوەی هـاتوە بـۆلای موحەمـەد کـە قورئانـە نامەیەکـە هۆنراوەتـەوە بـە هۆنراوەیـەکی تونـدو تـۆڵ خراپـەو لاوازی ڕوی تـێ ناکـا نەلـەبارەی لەفزەکەیەوە نەلەبارەی ماناکەیەوە قەدەغە کراوە لـە نـەمان و لـە گـۆڕان، پلـەی زۆر گەورەیەو بەهێزەو ئاشکراو کاریگەرە بۆسەر مێشکی ئادەمیزاد. زۆر ڕون و بێ هاوتایـەو یاسای ئیسلامی تێدا ڕون کراوەتەوە. وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ ثُمَّ فُصِلَتْ مِنْ لَدَنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴾ لە پاشا مانـای ئایەتـەکان ڕون کراوەتـەوە بـە شێوەیە بەندەکانی خواپێویستیان پێ هەبێ‌لەلایەن کەسێکەوە کە خوای گەورەیـە هـەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ‌ئاگای لـە هـەموو شتێ هەیـە، هـەموو بیروبـاوەڕی موسـڵمانان و فـەرمان و ئامۆژگـاری و هەواڵـەکانی ئـەو نامەیـە ڕون کراونەتـەوە بـۆ ئادەمیزاد. سورەت بە سورەت ئایەت بە دوای ئایەت ڕون کراوەتەوە.

﴿ أن لا تَعْبُدُوا إلاّ اللهَ إنّني لكم منه نذيرٌ وَبشيرٌ ﴾ لەبەر ئەوەی کە ئێوە هیچ کەسـێ نەپەرستن مەگەر هەر خوای تاك و تەنها و ئێوە لە بت پەرستی دوربخەنەوە. بە ڕاستی من بۆ ئێوە لـەلای خواو ترسێنەرم لە سزای ئاگرو مـوژدەدەرم بـە بەهەشـت و پاداشـت بـۆ باوەڕدارانی دڵپاك.

﴿ وَأنْ أسْتَغْفِرُوا رَبَّكُـمْ ﴾ وەلـەبـەر ئـەوەی ئێـوە دوای لێ خۆشـبوون بکـــەن لـــە پەروەردگاری خۆتان، لـە گوناهەکانی لـەمـەو پـاش خۆتـان بپـارێزن و لـە بـت پەرسـتی دوربکەونەوە.

﴿ ثُمَّ تُوبُوا إلَيْهِ ﴾ لە پاشا ئێوە بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگاری خۆتان پەشیمان ببنەوە لە گوناهەکانتان، لـەمەودوایش خۆتان بپارێزن لە گوناە، بۆ ئـەوەیش بـەر خوداربـن لـە چاکەی خوا بە توندی بەندەیی خوا بکەن، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ ثُمَّ يَمتعكَمْ مَتاعـاً حَسَـناً ﴾ لـە پاشـا پـەروەردگاری خۆتـان خـواردن و خۆشـیو ڕابواردنتان پێ ئەبەخشێ بەڕابواردنێکی شـیرین و خـۆش لـەم ژیانـەی جیـهاندا. ئەگـەر داوای لێ بوردن بکەن.

﴿ إلى أجَلٍ مُسَمىً ﴾ هەتا کاتی دیاری کـراو و نـاوبراو لـەلایـەن خـوای گـەورە بـۆ کۆتایی تەمەنتان.

پرسیار/ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرموێ (إنَ الدُنيا سِـجْنُ الْمُؤْمِـنِ وَجَنَـةُ الْكـافِرِ) بەڕاسـتی جیهان بەندیخانەی باوەڕدارانەو بەهەشتی بێ باوەڕانە. کـەچی مرۆڤـێ وائـەبێ تەنگانـەی وای بەسەردێ بە جۆرێ هیچ شتێکیان دەست ناکەوێ خۆی و خێزانی پـێ بژێنـێ، ئـەو فەرمودەی پێغەمەرە چۆن یەك ئەگرن لـەگەڵ ئەو فەرمودەی خوایـە ( ثُـمَ يَمتعكَـمْ مَتاعـاً حَسَناً ) .

وەڵام/ ئەو فەرمودەی پێغەمەرە ﴿ ﷺ ﴾ بەرانبەر ئەکرێ لـەگەڵ ئەوشتەی خوا ئامادەی کردووە بۆ باوەڕداران لـە بەهەشـتا، بێگومـان جیـهان بۆیـان بەندیخانەیـە. بـەڵام جیـهان بەهەشتی بێ باوەڕانە بەرانبەری ئەگرێ لـەگەڵ ئەو سزا گەورەیە بۆی ئامـادە کـراوە لـە پاشە ڕۆژدا. بێگومان جیهان بەهەشتە بۆیان .

پاش ئەوەی خوای مەزن فەرمانی دا بە پاکی و بێ گەردی پەرستنی خوا، برِیاریشی بە پێغەمەرایەتی موحەمەددا، داوای لێ خۆشبوون بکەین لـە پەروەردگار خۆمـان و پەشـیمان ببینەوە لـە گوناهەکانمان هەتا لـە جیهاندا ماوین. بپارێینەوە بنەبڕمان نەکا وێنـەی گـەلانی پێشو، دوای ئەوانە پاداشتی هەریەکەمان ئەداتەوە بە گوێرەی کردەوەی خۆمـان زۆربـێ. یاکەم. وەك ئەفەرموێ:

﴿ وَيُؤْتِ كَلَ ذي فَضْلٍ فَضْلَهُ ﴾ وەپەروەدگار ئەبەخشێ بـە هـەموو خـاوەن چاکەیـە پاداشتی چاکەی خۆیـان بـەبێ کـەم و کـوڕی لـە پاداشـتی کـردەوەی جیـهانیان بگـرە زۆرتریشیان پێ ئەبەخشێ.

﴿ وَإنْ تَوَلَوْا فَأني أخافُ عَلَيْكُمْ عَذابَ يَوْمٍ كَبيرٍ ﴾ وەئەگەر ئێوە پشت بکەنــە ئـاینی ئیسلام و واز لـە فەرمودەی پەروەردگاری خۆتان بهێنن و پەیڕەوی یاسای قورئان نەکەن، دوای بە ڕاستی من ئەترسم سزای ڕۆژێکی گەورە برِژێ بەسەر ئێوەدا، چونکە ئـەو ڕۆژە ناخۆشی و ئاوزای زۆر گەوەری تێـدا بـەرچاو ئـەکرێ، تۆڵـەی زۆر گـەورەتان لـەسـەر ئەکەوێ، ئەو ڕۆژە بریتیە لـە پاشە ڕۆژ.

﴿ إلى الله مَرْجِعَكُمْ وَهُوَ على كُلِ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ بۆلای خوایه لەو ڕۆژەدا گەڕانـەوەی ئێوەو، هەر خوایشه دەستەڵاتی هەیـە بەسـەر هـەموو شتێکا و خـاوەنی توانـای زۆرە، مردووان زیندوو ئەکاتەوەو پرسیاری کردەوەیان لێ ئەکا، پاداشتی هەموویان ئەداتەوە بـە گوێرەی کردەوەی خۆیان بە جۆرێکی دادپەروەرانە.

لە پێشەوە خوای مەزن باسی قورئانی کـرد. دوایـی ڕونـی ئەکاتـەوە کـردەوەی بـێ باوەڕان لەکاتی بیستنی خوێندنی قورئانداو ئەفەرموێ:

ألَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا مِنْهُ ۚ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٥﴾

﴿ ألا إنَهُمْ يَثْنونَ صُدُرَهُمْ ﴾ ئێوە بزانن و ئاگاداربن بەڕاستی بێ باوەڕان دڵـی خۆیـان لە ڕاستی وەرئەگێڕن. بە تایبەتی کاتێ بەلای تۆدا تێ ئەپەڕن و تۆ قورئان ئەخوێنی، چونکه لە دڵا دوژمنی تۆن و ڕقیان لێتە و ئەو ڕقەیان ئەشاردەوە .

﴿ لِيَسْتَخِفُوا مِنْهُ إلا حِيْنَ يفْشُونَ ثِيابَهُمْ ﴾ لەبەر ئەوەی بشارنەوە نهێنی دڵـی خۆیـان لە خواو پێغەمەرو باوەڕداران ئاگـاداری خراپـە و دوژمنایەتیـەکانیان بـن. ئێـوە بزانـن و ئاگـادربن ئەیانـەوێت ئـەو دوژمنایـەتی و ڕقـەی خۆیـان پەنـهان بـدەن کاتـێ خۆیانیـان دائەپۆشت بە بەرگی خۆیان، چونکه لایان ناخۆش بوو گوێیان لە فەرمودەی خواوەبێ.

﴿ يَعْلَمُ ما يُسرِوُنَ وَما يُعْلِنُونَ إنَهُ عِلِيمٌ بِذاتِ الصُدُور ﴾ پـەروەردگار ئـەزانێ بەشـتێ بێ باوەڕان پەنهانی ئەدەن بەشتێ دەری ئەبڕن و ئاشکرای ئەکەن لە دڵیاناو بەدەم ئـەڵێن لەمەوبەرو لەمەودوایش بەڕاستی خوا ئەزانێ بەشتێ لە دڵیانایـە لـە چـاك و لـە خـراپ گەورەبێ یا بچوك.

ئەو ئایەتە دەربـارەی ئەخنەسـی کـوڕی شـورەیق هـاتوە ، پیـاوێکی گفتوگـۆ شـیرین ڕوخۆشبوو،گفتوگۆی خۆشی لەگەڵ پێغەمەر ئەکردو لە دڵیا ڕقی لە پێغەمەربوو ﴿ ﷺ ﴾ هەندێ لە زانایان ئەڵێن: دەربارەی دووڕوەکان هاتۆتە خوارەوە بە گشتی.

**بە یاریدەی خوا کۆتایی بە نوسینی جزمی یازدەهەم هات لە ڕۆژی دووشەممە حەوتی مانگی ڕەجەب ساڵی (١٤٢٠)ی کۆچی بەرامبەر - ١٥/ ١١ / ١٩٩٩ی زایینی.**

**داواکارم لە خوا بە دڵێکی پاکەو یارمەتیم بدا لەسەر چاپ کردنی ئەم تەفسیرە.**

**لە گوناهی خۆم و باوک و دایکم خۆشبێ. و مناڵەکانم دڵ نەرم بکا**

**لەسەر پەرستی خۆیو هۆش لە پاشە ڕۆژ بکەنەوە**

( بسم الله الرحمن الرحيم )

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس بۆ خوای بونەوەران. درودی بێپایان لەسەر پێغەمەری خۆشەویستمان ولەسەر یار و یاوەران وخێزان و خاوەن باوەڕانبێ .

لەکاتێکا خوای گەورە باسی توانا و زانیاری خۆی کرد یەکەم جار بەسەر هەمو زینەوەرێکا بڕوا بە سەر زەوی دا، دووهەم جار بەسەرئاسمانەکان و زەویدا لەکۆتاییدا باسی توانای خۆی ئەکا بۆ زیندوو کردنەوەی بونەوەران و ئەفەرموێ :

وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا ۚ كُلٌّ فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحْبِسُهُۥٓ ۗ أَلَا يَوْمَ يَأْتِيهِمْ لَيْسَ مَصْرُوفًا عَنْهُمْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨﴾

﴿ وَما مَنْ دَآبَة فِي الأَرْضِ إلا عَلى اللهِ رِزْقها ﴾ وەهیچ شتێکی زیندوو نیە بڕوا بەسەر زەوی و بەنێو زەویدا مەگەر لەسەر خوایە خواردەمەنی بداتێ وبەخێوە بکا، نێر بێ یامێ،

ئاقڵ بن یاگیل، توانای پیٚبەخشیون بگەڕێن بەزەویدا بۆ بەدەست هێنانی خواردەمەنی نـەك بەتەمەڵی دانیشن .

﴿ وَيَعْلَمُ مُستقرها و مُسْتَوْدِعِها ﴾ وەخوا ئەزانیٚ بەو جێگەیە ئەچنەوە بۆ لای و ئارامی تێدا ئەگرن لـەسەر زەویدا ولـەکاتێکا زینـدوون لـەسـەر زەوی، ئەیشـزانیٚ بـەو جێگـەیـە دوای مردنیان لـەوا دائەنرێن .

﴿ وَمُسْتَوْدِعِها ﴾ وەخوا ئەزانیٚ بەو جێگەیە بەر لـەبونیان بـۆ ماوەیـە لـەویٚ دانـراون لـەپشتی باوکیان و منداڵدانی دایکیان و پاشە ڕۆژیان بەرەو چ جێگـەیـە ئـەڕۆن بـەکورتی خوا ئەزانی بە بەسەرهاتی بونەوەران و بەجێگەی بونیان بەر لـەوەی گیان بکریٚ بەبەریاناو دوای ئەوەیش ئەبن بەخاوەنی گیان وبەئەنجامی دوای مردنیان ئەزانیٚ .

﴿ كُلٌ فِيْ كِتابٍ مُبِيْنٍ ﴾ هەمو ئەوشتانەی باسکران لـەبونـەوەران و لـەخواردەمـەنی و بەخێو،کردنیان و بەئەنجامی بەسەرهاتی بەر لـەبونیان و دوای مردنیان تۆمار کراون لـــەنێو نامەیەکی ئاشکراو ڕوندا وبەهەمویان ئەزانیٚ .

﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَـقَ الْسَـماواتِ وَالأَرْضِ فِـي سِـتَةِ أيـامٍ ﴾ وەخـوا کەسـێکی ئەوتۆیـە دروستی کردوە ئاسمانەکان و زەوی لـەماوەی شەش کـاتی جیـاوازدا. لـەئایـەتی (٥٤) ی سورەتی ئەلـئەعرافدا بەدرێژی مانای ئەو ڕسـتەیە کـراوە، هـەروایش لـەسـورەتی یونسـدا لـەئایەتی (٣) لـەمەودوایش لـەئایەتی (٥٩) ی سورەتی فورقـاندا، لـەئایـەتی (٤) سـورەتی سوژدەدا .

﴿ وَكانَ عَرْشَهُ عَلى الْماءِ ﴾ وەخاوەن داری و توانای خـوا بەسـەر ئـاودا بـوو، یـانیٚ جگەی ئاو هیچ شتیٚ لـەبونەوەران دروست نەکرابوو. بەڵام ئە وئـاوە لـە چ جێگـەیـەبوە لـەکوێدا ڕاوەستاوە ئەوانە هەمویان بەڵگەو نیشانەیان لـەسـەر نیـە، ئـەقڵیش بـەجۆرێکی سەلمێنراو ڕێگە بەوشتانە نابا، گۆترەکاری باوی نیە. کەواتە پێویسـتە هەواڵـەی زانیـاری خوای مەزن بکریٚ .

﴿ لِيَبْلُوكُمْ أيُّكُمْ أحْسَنَ عَمَلاً ﴾ خوا دایناوە لـەنێو ئێوەداو لـەنێو زەویدا هێزو توانایـە لـەبەرئەوەی جویٚ بکاتە کەسانێکی ئەوتۆ خۆیان بەخێو ئەکەن بـە مـاندوبوونی خۆیـان و

کەسانێکی ئەوتۆ لەسەر دارایی و سامانی هەژاران خۆیان بەخێو ئەکەن و ستەمیان لێ ئەکەن و لەبەر ئەوە دانیشتوان بزانن کام لایان کاری شیرین و چاك ئەکەن، دوای تۆ لە گوناهباران ئەسێنێ و پاداشتی پیاو چاکانیش ئەداتەوە، ئەگەر بەو جۆرە نەبێ دروست کردنی بونەوەران بێ سود ئەبێ، پیاو چاکان و خراپەکەران لەیەك جوێ ناکرێنەوە.

﴿ وَلَئِنْ قُلْتَ أَنَّكُمْ مَبْعُوثونَ مِنْ بَعْدِ الْمَوتِ لَيَقُولَنَّ الَّذينَ كَفَرُوا إنْ هذا إلاّ سِحْرٌ مُبيْنٌ ﴾ وەئەگەر تۆ بتوتایە بە خزمەکانت: بەڕاستی زیندوو ئەکرێنەوە لەپاش مردنتان، بەڕاستی ئەڵێن: کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە: ئەوەی تۆ ئەیڵێی هیچ شتێ نیە مەگەر جادویەکی ئاشکرایە یانێ بە گوێرەی ئەقڵی ناتەواوی خۆیان ئەو فەرمودەی خوایەیان بەبێ ناوەڕۆك دائەنا وێنەی جادو، بۆ ئەوەیش ئادەمیزاد پێی بخەڵەتێن.

﴿ وَلَئِنَ أخَرْنا عَنْهُمْ الْعَذابَ إلى أمَةٍ مَعْدودَةٍ لِيَقُولَنَ ما يَحِسبَهُ ﴾ وەئەگەر ئێمە ئەو سزایە بەڵێنی پێ درابوو، دوامان بخستایە هەتا ماوەیەکی دیاریکراوی هەڵبژێرراو، ئەو بێ باوەڕانە ئەڵێن: چ شتێکە ئەو سزایەی ڕاوەستانوە ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەی لەوەدا تۆ ئەیڵێ.

﴿ ألا يَوْمَ يأتِهِمْ لَيْسَ مَصْرُفاً عَنْهُمْ وحاقَ بِهِمْ ماكانُوا بِهِ يَسْتَهْزِؤُونَ ﴾ ئێوە ئاگاداربن و بزانن ئەو ڕۆژەی ئەو سزایە دێت بۆلایان لانادرێ لەوان ئەو سزایە و دێتە خوار بۆ سەریان و ئەم لاو لایان ئەگرێ ئەو شتەی ئەوان گاڵتەی پێ ئەکەن و پەلەیانە بێت بۆلایان و لێی ناترسن. لە پاشا خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە چۆنیەتی و بەسەرهاتی ئەو مرۆڤانە کە لە خۆشی و لە ڕابوردندا ئەژیان و سوپاسی خوایان لەسەر نەئەکرد، ئەفەرموێ:

﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَـٰهَا مِنْهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ ﴿٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَـٰهُ نَعْمَآءَ بَعْدَ ضَرَّآءَ

مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّيٓ إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ﴿١٠﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١١﴾

﴿ وَلَئِنْ أذَقْنا الأنسانَ مِنا رَحْمَةً ﴾ وەبەڕاستی ئەگەر ئێمە لەلایەن خۆمانەوە بەخشیمان بە ئادەمیزاد گەورەیی و چاکەی خۆمان لەئاسایشس و ساغی و دارایی و پلەو پایەو خێزانی زۆر.

﴿ ثُمَ نَزَعْناها مِنْهُ إنَهُ لَيَئوُسٌ كَفُورٌ ﴾ لەپاشا ئێمە ئەو چاکانەمان لائەبردو لەو مرۆڤەمان سەندەوە بەڕاستی ئەو مرۆڤە ئەوپەڕی بێ ئومێدی ئەبێ لە هەموو چاکەیەکی ئێمەو سوپاسی چاکەکانی ئێمە ناکاو وائەزانێ ئێمە بۆی ناگێڕینەوە ئەو چاکانەی هاتوچۆی تێدا ئەکرێ.

﴿ وَلَئِنْ أذَقْنا نَعْماءَ بَعْدَ ضَرّاءَ مَسَتْهُ ﴾ وەئەگەر ئێمە بمان بەخشیایە بەو مرۆڤە چەندین خۆشی و چاکە و خواردەمەنی لە پاش ئەو سەختیە توشی بوبو لە بیماری و هەژاری و ناخۆشی.

﴿ لَيَقُولَنَ ذَهَبَ السَيْئاتُ عَنَهُ إنَهُ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ﴾ بەڕاستی ئەو مرۆڤە ئەڵێ: ڕۆشیت ئەو سەختی و ناخۆشیانە توشی من بوبو لەوە ناترسێ ژیانی بگۆڕێ لەو ئاسایشەوە بۆ ناخۆشی. بەڕاستی ئەو مرۆڤە شادمانە بەو چاکەو خۆشیە خۆی هەڵئەکێشێ بەسەر دانیشتوانی ترداو سەری لێ ئەشێوێ، ناخۆشی و هەژاری پێشووی لەبیرئەچێتەوە کەچی شایان بۆ ئەو مرۆڤە ئەوبوایە سوپاسی خوای بکردایە.

﴿ إلا الذيْن صَبَرُوا وَعَمِلُوا الصالِحاتِ أُولئِكَ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأجْرٌ كَبيرٌ ﴾ مەگەر کەسانێکی ئەوتۆ ئارامیان گرت لەسەر ئەو ناخۆشیەو بیماریەو سوپاسی خوایان کردبێ بە

هەموو جۆرێ کردەوە چاکەکانیان کردبێ لە کاتی خۆشی و ناخۆشیدا، ئەو کەسانە بۆ ئەوان ئەبێ لێ خۆشبوونی ئێمە و بۆیشیان ئەبێ پاداشت و مزەی زۆر گەورە لە هەموویان بچوکتر بەهەشتە.

بۆ زانین: قورئانی پیرۆز تەماشای ئادەمیزاد ئەکات لە ڕوی بیروباوەڕوکردەوەیانەوە بە چ شتێ باوەڕ ئەهێنن و بە چ کارێ هەڵئەسن باوەڕیش لە دڵدایەو خوا ئەیزانێ. قورئانی پیرۆز بۆ ڕانموماییی کردن هاتوە دواوای پەرستی خواو ئەکا، بەو شێوانە بە پیاو چاك یاخراپە کار ئەناسرێ، لەبیرمان نەچێ ئەو بیروباوەڕە قورئان داوای ئەکا بڕوایە بە خواو بە پێغەمەرو بە ڕۆژی دووایی، ئەگەر ئادەمیزاد لەو باوەڕە وازی هێنا قورئانی پیرۆز ناویان ئەبا بەستەم کارو زیانۆمەندو بێ باوەڕو نەزان و یاخی و سوپاس نەگوزارو هەزاران شێوەی تری ناپەسەند.

لە پاشا خوای مەزن فەرمانی ئەدا بە نێردراوی خۆی بەوەستانی بەردەوام لەسەر بەجێ هێنانی فەرمانەکانی خواو هانیشی ئەدا بە بەڵگەی ڕون بۆ دانیشتوانی دەربخا هەتا بیانویان نەمێنێ، دوایی ئەفەرموێ:

فَلَعَلَّكَ تَارِكٌۢ بَعۡضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدۡرُكَ أَن يَقُولُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌۚ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٞۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٌ ﴿١٢﴾ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٤﴾

﴿ فَلَعَلَكَ تاركٌ بَعْضَ مايُوحي إلَيْكَ ﴾ دوایی لەوانەیە تۆ واز بـهێنی لـە هـەندێ لـەو شتەی بە سروش ئەنێررێ بۆلای تـۆو ڕای نەگەیـەنێ بـەوان ئـەو شـتە، چونکـە ئـەوان گاڵتەی پێ ئەکەن و ئەو شتە لە تۆ وەرناگرن.

ئەو فەرمودەیە لەوەوە هاتووە کە پێغەمەری خـوا ﴿ ﷺ ﴾ کاتـێ قورئـانی ئـەخوێندەوە بەسەر بت پەرستانداو داوای لێ ئەکردن باوەڕ بهێنن کە خوا بە تاك و تەنها دابنێن کەچی لەوولامی پێغەمەردا ئەو بت پەرستانە کاتی واهەبوو گاڵتەیان پێ ئـەکرد، جـاری وایـش هەبوو داوای کاری پەك خەریان لە پێغەمـەر ئـەکرد، ئـەو کـارە نالەبارانـە پێغەمـەریان خەفەتبار ئەکردو ئازاری پێ ئەچێشت، دوای خوای مەزن دڵ خۆشی پێغەمەری دایـەوەو فەرموی: تۆ لـەسەر کای خۆت بڕۆو گوێ مەدەرە ئەو شـتانەی ئـەوان ئـەیلێن و داوای ئەکەن لەتۆ. کەواتە تۆ هەندێ لەو قورئانە واز مەهێنە کە ئەوان لایان گرانبێ، زۆر ڕونە تۆ کاری بەو جۆرە ناکەی. کەواتە تۆ بۆ ئەبێ خەفەت بخۆی و دڵی خۆت تەنگ بکـەی. بێگومان پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ پارێزراوە لە هەموو گوناهێ و واز لە ڕاگەیاندنی فەرمودەی خوا ناهێنێ نە بەکەم و نەبەزۆری. لەو بارە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَضائق به صدرك أن يقولوا لَوْ لاأنزل عَلَيْهِ كَنْزٌ ﴾ وە دڵی تۆتەنگ ئەبێ بـەو شتە ئەوان دەری ئەبڕن کە ئەڵێن: بۆچی نایەتە خوارەوە بۆسەر موحەمەد گەنجێ لـەزێڕو زیـو هەتا بەکاری بهێنێ لە ژیانی خۆی و خێزانیدا بە وێنەی پاشـایان هـەتا ئێمـە بـەو بۆنـەوە پەیڕەوی بکەین.

﴿ اَوْجاءَ مَعَهُ مَلَكٌ ﴾ یـا بهاتایـە لەگـەڵ موحەمـەدا فریشـتەیە شـایەتی بـدا لـەسـەر پێغەمەرایەتی ئەو، زۆر ڕاستە ئەوانەی خاوەنی دارایی و سامانن لە کۆن و لـە تـازەدا بـەو شێوەیە بیرئەکەنەوە، بـڕوای خراپـەیان وایـە پلـەو پایـەی بـەرز هـەر ئـەبێ بـۆ خـاوەن سامانەکانبێ، هەژاران لای ئەوان بێ بەشە لـە پێشەوایی و پلەی بەرزو باڵا، بۆیـە تانـەیان لە پێغەمەر ئەداو نەیان ئەفامی کە پیشەی پێغەمەران پلەو پایەو دارایی نیە لە جیهاندا.

﴿ إنما أنت نَذِيْرٌ واللهُ عَلَى كُلِّ شَيءٍ وَكِيْلٌ ﴾ بە ڕاستی تۆ هەر ترسێنەری ئـادەمیزادی لەبێ فەرمانی خواو کۆتایی نەکەی لە گەیاندنی فەرمودەی خوا بە گشتی ئیتر بۆ ئەبێ دڵ تەنگ ببێ و، خوا بەسەر هەموو شتێکا ئاگادارەو پشت بـەو بەسـتە بـە چۆنیـەتی ئـەوان ئەزانێ و پاداشتی گفتوگۆو کردەوەی ئەوان ئەداتەوە، گفتوگۆی ئەوان کارت تێ نەکا.

﴿ أمْ يَقُولُونَ أفْتراهُ قُلْ فأتُوا بِعَشْرِ سُور مَثْلِهِ مُفْتَرَياتٍ﴾ بـەڵکو بـت پەرسـتان ئـەڵێن: موحەمەدو ئەو قورئانەی هەڵبەستوەو خۆی دای ناوەو لەلایەن خواوە بۆی نـەهاتوە، تـۆ لە وولامی ئەوانا بڵێ: دوایی ئەگەر ڕاست ئەکـەن(١٠) سـورەت وێنـەی ئـەو قورئانـە بەهەڵبەسراوی لەلایەن خۆتانەوە بهێنن ئەگەر ڕاستە لاتان لە خۆمەوە داماوەو لەلایـەن خواوەوە بۆم نەهاتوە ئێوەش عەرەبن و زمان پاراون وەك من و ئەتوانن وێنەی شتێ دابنێن.

﴿ وَأدْعُوا مِنْ أستَطَعْتُمْ مِنْ دونِ اللهِ إن كُنْتُمْ صادِقِينَ ﴾ وە ئێوە بانگ بکەن بۆ یارمەتی دانی خۆتان لەسەر بۆڕدانی من هەر کەسێ لە تواناتانا هەیە بانگی بکەن لە جێگەی خـوا ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن ئەو نامەیە دەسـت کـردی منـە، لـە ئایـەتی (٢٣)ی سـورەتی ئەلبەقەرە وێنەی ئەو ڕستانە مانایان کراوە.

﴿ فَإنْ لَمْ يَستَجِيبُوا لَكُمْ فأعْلَمُوا أنَما أنْـزِلَ بِعِلْـمِ اللهِ ﴾ دوای ئـەوان ئەگـەر وولامـی ئێوەیان نەدایەوە بۆ دانانی (١٠) سورەت لە وێنەی ئەو قورئانە هاتوە بۆلای ئێـوە، دوای ئێوە بزانن کە بە ڕاستی ئـەو شـتە هاتوەتـەخوارەوە بـۆلای ئێـوە بـەهۆی زانینـی خـواو سروشتی خوایە بە تەنها. بۆ یاسای ڕۆژانەی ژیانی ئادەمیزادە هەتا هەتایە، هەروەها ئێوەی بت پەرست بزانن کە ناتوانن بەرەنگاری ئەو قورئانە بکەن هەتا بۆتان دەرکەوێ جگـەی لە خوا لە توانای کەسدا نیە دانانی ئەو قورئانە.

﴿ وَأنْ لا إله إلاّ هُوَ فَهَلْ أنْتُمْ مُسْلِمُونْ ﴾ وە ئێوە بیشـزانن کـە هیـچ خوانیـە شـایانی پەرستنبێ جگەی خوایە کە زانایـە بـە هـەموو شـتێ و خـاوەنی تووانایـە بەسـەر هـەموو بونەوەراندا، دوایی ئایا بۆ ئێوە سەر دانانەوێنن بۆ خواو بەردەوام نەبن لەسەر ئاینی پوچـی خۆتان و بێ باوەڕیتان، ئێوەی بێ باوەڕ هیچ دەرفەتێکتان بۆ نیە پاش ئەوەی ئێـوە نـەتوانن

بەرەنگاری قورئان ڕاوەستن جگە لەوەی ئێوە بۆ ڕبخۆن و سەر دانەوێنن بەرانبەر بە قورئان و بە موحەمەد.

مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَـٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا وَبَـٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَـٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ ۚ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٧﴾

﴿ مَنْ كانَ يُرِيدُ الحَياةَ الدُنيا وَزِينَتَها نُوفِ إِلَيْهِمْ أعْمالَهُمْ ﴾ وەهەر کەسێ بە سروشتی خواری خۆی زیندەگانی جیهان و ئارایشت و جوانی جیهانی مەبەستبێ و واز لە ژیانی پاشەڕۆژ بهێنێ ئێمە بە تەواوی ئەگەیەنین بەو کەسە پاداشتی کردەوەی خۆی لە جیهاندا لە لەش ساغی و لە پلەو پایەو ڕۆزی فراوان و منالّی زۆر.

﴿ وَهُمْ فِيها لا يَنْجِسُونَ ﴾ وەئەو کەسانە لە جیهاندا هیچ شتێ لە پاداشتەکانیان کەم ناکرێتەوە. ئەدرێتە دەستیان بە تەواوی لە جیهاندا.

بۆزانین: هەرکەسێ هەر شتێ بچێنێ هەر ئەو شـتە ئەدروێتـەوە، هـەر کەسـی ژیرانـە بازرگانی بکا قازانجی دەست ئەکەوێ. هەر کەسێ لـە وانەکانی قوتابخانەدا کۆشش بکا لـە تاقی کردنەوەدا سەرئەکەوێ، هەرکەسێ کارگەیە دروست بکـا یـا کانزایـەك هەڵکـەنێ دارایی زۆر کۆئەکاتەوە لـە گەنجینەکەیدا، هەرکەسێ تەمەڵبێ و کارنەکا هــەژاربێ و بـێ چارە ئەبێ، پاداشت و چاکەی پاشەڕۆژ بەستراوە بە کردەوەی چاکی خاوەنەکەیەوە بەبێ کەم و کوڕی ئەو پاداشتە وەرئەگرێ.

﴿ أوْلَئِكَ الذيْنَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الأخِرَةِ إلا النـارَ وحَبَـطَ مـا صَنَعُـوُا فيـها وَبـاطِلٌ ماكـانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ ئەو کەسانەی چوون بە قوتا لـە جیهانداو وازیـان لــە جگـەی جیـهان هێنـاوە کەسانێکی ئەوتۆن نیە بۆ ئەوان لە پاشەڕۆژدا مەگــەر ئـاگری دۆزەخ و، نـابوت و پـوچ بۆتەوە شتێ ئەوان کردویانە لـە جیهاندا لـە کردەوە چاکەکانیان، چونکە مەبەستیان لــەو شتە پاشە ڕۆژ نەبووە بەڵکو هەر جیهانیان مەبەستبووە، ئەوەی ویستویانە وەریان گرتــوە، کردەوەکانیان لای خوا بەهیچ شتێ ناچی، با کــارێکی وایـان کردبـێ هـەموو ئـادەمیزاد سودیان لێ وەرگرتبێ، بەمەرجێ باوەڕیان بە خواو پێغەمەرو فەرمودەکانی خوا نــەبوبێ و، پوچ و بێ سودە شتێ ئەوان ئەیکەن هەربۆئەوەی لــە جیـهاندا باسـیان بکـرێ و خوایـان مەبەست نەبوبێ و بەردەوام بوبن لـەسەر بێ باوەڕی و بێ فەرمانی خوا.

لە پاش ئەوەی خوای مەزن باسی ئــەو کەسـانەی کـرد کـە کردەوەکانیـان هـەر بـە گوزەرانی خۆش و ناوبردنی جیهانە، لـەمەو پاش باسی ئەوە کەسانە ئــەکا بـۆ خـوا ئیـش ئەکەن و دانیشتوان بانگ ئەکەن بۆلای پەرستنی خواو ئەفەرموێ:

﴿ أفَمَنْ كانَ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِهِ و يَتْلُوهُ شاهِدٌ مِنْهُ ﴾ ئایا دوایـی کەسـێ هـەر مەبەسـتی ژیانی جیهان بێ وێنــەی کەسـێکە لـەسـەر بەڵگەیـەکی ڕونبـێ لەلایـەن پـەروەردگاری خۆیەوەبەهۆی باوەڕبوونی بەخواو بە پێغەمەرو بە قورئان و، هاتبێ بــە دوای ئـەو بەڵگـە ڕونەدا کە بەڵگەیەکی ئەقڵیە شتایەتێ لـەسەر ڕاستی ئەو کەسـە لەلایـەن پـەروەردگاری خۆیەوە، ئەو شایەتە یا جبرائیلە یا زمانی پێغەمەرە ﴿ ﷺ﴾ وێنــەی کەسـێکە بەڵگـەی بـە دەستەوە نەبێ.

﴿ وَمِنْ قَبْلِهِ كِتَابُ مُوسَى أماماً وَرَحْمَةً ﴾ وەلـەپێش هاتنـە خـوارەوەی قورئـان و ڕەوانەکردنی موحەمەدیش نێرابوو نامەی موسا کە تەوراتە بە پێشەواو بەخشش بـۆ ئـەو کەسانە ڕەوانە کرابوو بۆلایان کە دەستی پێ بگرن بۆکاری جیهان و فـێربوونی یاسـایان، گرنگترینی ئەو کارانە موژدەدانی تەورات بوو بە موحەمەدو پێغەمەرایـەتی، پێـش ئـەوەی قورئان شایەتی بۆ بدا لەسەریان.

﴿ أوْلئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ ﴾ ئەو کەسانە دوای بەڵگەکانی ڕاستی ئەکـەون کـە بریتـین لـە قورئان و لە نامەی موسا کە هاتوە بۆسەری باوەڕ بە موحەمەد ئەهێنن.

﴿ وَمَنْ يَكْفُرْ بِهِ مِنَ الأحْزابِ فَالنَارُ مَوْعِدُهُ ﴾ وەهەرکەسێ لە تاقمـەکانی دانیشـتوانی مەکەو ئەو کەسـانەی کۆبونەتـەوە لەسـەر دوژمنایـەتی فروسـتادەی خـواو بڕیاریـانداوە جەنگ بکەن لەگەڵیا، دوایی ئاگری دۆزەخ بەڵێنگای ئەو کەسەیە لە پاشە ڕۆژداو ئـەو ئاگرە جێگەی ئەو کەسانەیە باوەڕ بە موحەمەد ناهێنن.

خوای مەزن ڕوئەکاتە هەموو ئادەمیزاد بە شێوەیەکی گشتی، لەپێغەمەرەوە دەست پێ ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ فَلاتَكُ مِنْ مَرْيَةٍ مِنْهُ الحَقَ مِنْ رَبِكَ وَلكِنَ أكْثَرَ النــّاسِ لا يُؤْمِنُـونَ ﴾ دوایـی تـۆ لـە گوماندا مەبە لـەو ڕاستیەی قورئان و پێغەمەرایەتی موحەمەدو ئەو ئاگرە بەڵێن پـێ دراوە. بەڕاستی ئەو قورئانەو ڕاستی موحەمەدو پاشە ڕۆژی خراپی بێ باوەڕان ئەوانـە هـەموویان ڕاستن و لـەلایەن پەروەردگاری تۆوە هاتوون و، بـەڵام زۆرتـر لـە ئـادەمیزاد بـاوەڕ بـەو ڕاستیە ناهێنن، چونکە ئەوان دوژمنی ڕاستین و بە شتی ڕاسـت ئـاڵۆز ئـەبن و لـە یـاخی بوون و خراپەکردن ناوەستن و بڕوا بە هیچ ئاینێ نایەرن .

مرۆڤی ژیرو کارزان وا پێویستە بۆی گومانی لەوەدا نەبێ کە موحەمـەد فرودسـتادەی خوایە قورئان سروشە لـەلایـەن خـوای گـەورە هـاتوە، دوای ئـەوەی ڕای نوانـدوە ئـەو هەمووە بەڵگەو نیشانە ڕونانە لـەسەر داواکاری پێغەمەری خۆی. بەڵام هەر کاتێ ئاسانبێ بۆ مرۆڤێ کە گومانی هەبێ بەوەی تـەورات و ئینجیـل موژدەیـان داوە بـە پێغەمەرایـەتی

موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ دوایی ئایا ئاسان نیە بۆ ئەو کەسە گومانی هـەبێ لـەوەدا کـە بەڕاسـتی ئەبەخشرێ بە ئادەمیزاد بە هۆی خۆشی و زیندەگانی هەردوو جیهانیان کە قورئانەو شـتی وای هێناوە نە هیچ پێغەمەرێ وە نە هیچ چاکە خوازێ نەی هێناوە.

لـە کاتێکا خوای مەزن ڕونی کردەوە کە موسڵمانان و بێ باوەڕان لـەیەکـەوە دورن و نزیک نابنەوە لـە یەکتری و درێژە ئەدا بەباسی ئەو تاقمە درۆزنانەو ئەفەرموێ:

وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَـٰدُ هَـٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿١٩﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَمْ يَكُونُوا۟ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ۘ يُضَـٰعَفُ لَهُمُ ٱلْعَذَابُ ۚ مَا كَانُوا۟ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ وَمَا كَانُوا۟ يُبْصِرُونَ ﴿٢٠﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢١﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَأَخْبَتُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ

هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٣﴾ مَثَلُ ٱلْفَرِيقَيْنِ كَٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْأَصَمِّ وَٱلْبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾

﴿ وَمَنْ أظْلَمَ مَمِنْ أفْتَرى عَلَى اللهِ كَذِباً ﴾ وەچ کەسێ ستەمکارترە لەو کەسەی درۆ دروست بکات بە بوختان بیدا بەسەر خوادا، وێنەی کەسێ هاوبەش و تکا کاری بێ بەڵگە دابنێ بۆ خوا لە بتەکان و جگەی بتەکان، بەبێ فەرمودەی خواو پێغەمەر خواردەمەنی ڕەواو قەدەغە بکا بە گوێرەی هەوەسی خۆی، دارایی دانیشتوان و داگیربکاو تاڵانیان بکا بە ناوی سەربەستیەوە بڵێ: خوا سروشتی نەناردوە بۆ پێغەمەران، لە کاتێکا درۆدان بەسەر جگەی خوادا خرابتربێ، ئەبێ درۆدان بەسەر خوادا چەندە خرابتربێ.

﴿ أولئِكَ الذيْنَ يَعْرَضُونَ عَلَى رِبهِمْ ﴾ ئەو پوختان چیانە ڕائەبوێرین بەسەر پەروەردگاری خۆیان لە ڕۆژی دواییدا بۆ پرسیار بەهەموو کردارو گفتوگۆیانەوە.

﴿ وَيَقُولُ الأشْهادَ هَـؤلاءَ الذيْنَ كَذَبُوا عَلَى رَبـهِمْ ﴾ وە شایەتەکان ئاگادارن لە فریشتەکانی چاودێری و لە فریشتە کردەوە نوسەکان و لە پێغەمەران و ئەندامەکانی خۆیان ئەڵێن: ئەو تاقمە بوختان چیانە کەسانێکی ئەوتۆن درۆیان ئەدا بەسەر پەروەردگاری خۆیانا لە جیهاندا، ئەمڕۆی پاشە ڕۆژ ئەبن بە پەندو ئابڕویان ئەچێ.

خوای مەزن پێویستی بە شایەت نی‌یە و هەموو شتێ ئەزانێ و توانای بەسەر هەموو بونەوەراندا هەیە. بەڵام ئەو شایەتانە بۆ ئەوەیە هەتا تاوانباران ئازاریان پتربێ و بیانوویان نەمێنێ، بڕوا پەیدا بکەن کەسیان دەست ناکەوێ پەنای بۆ بەن.

﴿ ألا لَعْنَةُ اللهِ عَلَى الظّـالِمِيْنَ الذيْـنَ يَصُدُونَ عَـنْ سَـبيْلِ اللهِ وَيَبْغُونَـها عَوِجاً ﴾ ئێوە ئاگادارین و بزانن بێ بەشبون لە بەزەیی خواو نەفرەتی خوا لەسەر ستەمکارانەو ڕزگاریان

نابێ، ئەو ستەمکارانە کەسانێکی ئەوتۆن ڕێگە لە ئایینی خوا ئـەگرن و نایـەڵن پەرستنی خوا بکەن، وە دوای ڕێگەی خوارو خێچ ئەکەون، ئەڵێن: خوا هاوبەشی هەیەو گومان لە دڵی دانیشتوانا پەیدا ئەکەن هەتا باوەڕ نەهێنن و بگەڕێنـەوە بـۆلای بـت پەرستی و بـێ باوەڕی، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَهُمْ بِالأَخِرَةِ هُـمْ كـافِرُونَ ﴾ وەئـەو سـتەمکارانە لەگـەڵ ئـەو ڕێگـە گرتنەیشـدا باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی و پرسیارو پاداشت و تۆڵـە نیە.

﴿ أوْلئِكَ لَمْ يَكُونُوا مَعْجِزِينَ فِي الأَرْضِ ﴾ ئەو بێ باوەڕانە لەوانە نین پەکی خوا بخـەن کە سزایان بدا لـە جیهاندا ئەگەر خوا ئارەزۆ بکا سزایان بدا لـە زەویدا و ناتوانن ڕێگە لـە تووانای خوابگرن .

﴿ وَما كانَ لَهُمْ مِنْ دُونِ اللهِ أولِياءِ ﴾ وەنابـێ بـۆ ئـەو بـێ باوەڕانـە هیـچ دۆسـت و کاربەڕێوەبەرێکیان لـە جگەی خودا کە سزایان نەدرێ. ئـەو بتانـە ئـەوان کردوینـان بـە دۆست بۆ خۆیان هیچ سودێ بەوان نابەخشێ. مالوم و قەشەکانیش خۆیانیان بـۆ ڕزگـار ناکرێ، ئیتر چۆن چەکی لێ خۆشبوون ئەدەن بە تاقەمەکانیان؟

﴿ يُضاعَفُ لَهُمْ الْعَذابُ ﴾ بەڵکو دوو چەندانە ئەکرێتەوە بۆ ئەو کەسانە سزای خـوا، جارێ لەسەر بوختان کردنیان و درۆدان بەسەر خوادا، جارێ تر لـەسەر ڕێگە گرتنیان لە دانیشتوان بۆ باوەڕهێنان، جارێ تر لـەسەر ئەوەی باوەڕیان بە زیندوو بونەوە نیە.

﴿ ماكانُوا يَسْتَطِعُونَ السَمْعِ وَما كانُوا يُبْصِرُونَ ﴾ ئـەو کەسـانە توانایـان نیـە گـوێ بگرن لە قورئان و بیبسن بە شێوەیە سودی لێ وەربگرن و، بەو جۆرەیش نـەبوون ڕاسـتی ببینن و خۆیانیان کوێر کرد لە ئاستی ئایەتەکانی قورئانی خـوا، بیریـان لـە خۆیـان و لـە بونەوەران نەئەکردەوە بە جۆرێ سودیان پێ بگاو ئامۆژگاریش وەرناگرن. بێگومان لە بێ باوەڕیدا چونەتە خوارەوە.

﴿ وَضَلَ عَنْهُمْ ماكانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ وەوون ئەبێ لەو کەسانە شتێ بە درۆو بـە بوختـان ئەیان کرد بە هاوبەشی خوا. لەناو ئەچێ ئەو شتەی ئەوان ئەیان کرین و ئەیان پەرسـتن و بۆیان دەرئەکەوێ بێ توانان.

﴿ لاجَرَمَ أَنَّهُمْ فِي الأخِرَةِ هُمُ الأخْسَرُونَ ﴾ گومانی تێدا نیە کە بەڕاستی ئـەو کەسانە لە ڕۆژی دوایدا هەر ئەوانن زیانۆمەندو هیچ کەسێ لەوان زیانۆمەندتر نیە.

﴿ إنَّ الذيْنَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصّالِحاتِ وأخْبَتُوا إلى رَبِهِمْ أوْلَئِكَ أصْحابُ الْجَنَةِ هُـمْ فيـها خالِدُونَ ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە بە ئاینی ئیسلام بـە دڵـی پاکـەوەو کردەوەو چاکەکانیان کردەوەو پاڵیانداوە بەلای خواوە بـە کزۆڵـی و ترسـەوە ئارامیـان گرتوە لەسەر ئازار بە نیازی پاکەوە ئـەو کەسانە بـەو جۆرەبـن دانیشـتوی بـەردەوامی بەهەشتن، ئەوان لەناو بەهەشتان دێرکات. کاتێ خوای مەزن باسی چۆنیەتی بێ باوەڕان و ئەو کارەی کرد لەسەرینی لە کۆیرکردنی خۆیان لە ڕێگەی ڕانموویی و ڕێگەی ڕاست، لە کەڕکردنی خۆیان بۆ بیستنی ڕاستی، باسـی بـاوەڕداران و ئـەو شـتەی کـرد کـە ئـەوان لەسەری بوون لە ڕوناکی دڵیان و بیستنی ڕاستیو سەرشۆڕی بۆ فـەرمانی خـوا، خـوای مەزن وێنەیە باس ئەکا لەبارەی ئەو دوتاقمەوە ئەفەرموێ:

﴿ مَثَلُ الفَرِيْقَيْنِ ﴾ وێنەی ئەو دووتاقمەی بێ باوەڕداران و باوەڕداران لـەبێ فـەرمانی خوای گەورەو لە فەرمان بەرداری خوای مەزن بەم جۆرەیە:

﴿ كالأعْمى والأصَمِ ﴾ تـاقمی بـێ بـاوەڕان وەك مرۆڤێکـی کوێـر وایـە بـە ڕێگـەی شارەزایی دەرناکا وەك کەسێکی کەڕ وایە هیچ شتێ نەبیسێ هەرگیز.

﴿ وَالبَصِيرِ والسَميْعْ ﴾ تاقمێ باوەڕداران وەك کەسێکی ساغ وان هەموو شتێ ئـەبینێ وەك کەسێکی گوێ ساغ و بێ دەردوان هەموو دەنگـێ ئەبیسـێ و وەڵامـی بـانگ کـەر ئەداتەوە.

﴿ هَلْ يَسْتَوِيانِ مَثَلاً أفلا تَذْكُرُونَ ﴾ئایا ئـەو دوو تاقمانـە وێنـەی یـەکن و بەرانبـەری یەکتڕین لەلایەن وێنەوە؟ ئایا دووایی ئێوە بۆ ئامۆژگاری وەرناگرن و بیربکەنـەوەو بـاوەڕ بهێنن هەتا بۆتان دەرکەوێ ئـەو دوو تاقمـە وەك یـەك نـین و زۆر جیـاوازن لـە هـەموو ڕویەکەوە. کاتێ لە پێشەوە باسی مـوژدەدان و هەڕەشـەکردن و هـاندان و سەرزەنشـت کـرا، لـەپا باشـا باسـی هـەواڵی پێغەمـەرانی پێشـو ئـەکرێ هـەتابێ بـاوەڕان بترسـن و

باوەڕبهێنن، پێغەمەریش بەو باسە دڵخۆشبێ، بەر لە هەموو پێغەمەران باسی نـوح ئـەکاو ئەفەرموێ:

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٥﴾ أَن لَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٢٦﴾

﴿ وَلَقَدْ أرْسَلْنا نُوحاً إلى قَوْمِهِ إني لَكُمْ نَذِيرٌ مَبِيْنٌ ﴾ وەبەڕاسـتی ئێمـە نوحمـان ڕەوانـە کرد بۆلای خزمان و تاقمی خۆی، دوایی نوح بـەوانی ووت: بەڕاسـتی مـن ترسـێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە، ڕونی ئەکەمەوە بۆتان ڕێگە سزادانتان و ڕێگەی ڕزگاریتان.

﴿ أن لا تَعْبدُوا إلا الله ﴾ کە ئێوە هیچ شتێ مەپەرستن مەگـەر خـوای تـاك و تەنـها و مەیکەن بە هاوبەش بۆخوا لـە پەرستندا جگەی خوا، هەر خوایە شایەنی پەرستنبێ ، ئەگەر خوا بپەرستن ئێوە ڕزگارتان ئەبێ لـە سزای ئازاردەر، ئـەگینا خـوا سـزای زۆرگـەورەتان ئەدا، وەك خوا ئەفەموێ:

﴿ إني أخافُ عَلَيْكُمْ عَذابَ يَوْمِ أَلِيمِ ﴾ نوح ووتی بـە خزمـانی خـۆی: بەڕاسـتی مـن ئەترسم بکەوێتە سەر ئێوە سزایەکی خـاوەن ئـازار ئەگـەر ئێـوە یـەردەوامبن لەسـەر بێ باوەڕی و بت پەرستی. بە کورتی ئەو گەلەی نوح بت پەرست بوون، دوایی نوح بە دوو ووشەی کورتە ئامۆژگاری کردن کە سەرچاوەی پەرستنی خوای مەزنە.

بۆزانین: نوح (د) دووەهەمین فروستادەی خوایە باس کرابـێ لـە پـاش ئـادەمی باپـیرە گەورەی نوح، پاش ئـادەم (ئیدریسـە). نـوح کـوڕی لامیـك کـوڕی متوشـالیح کـوڕی ئوخنوح = (ئیدریس) کوڕی ئەلیا کوڕی مەهلائیل کوڕی ئەنوش کوڕی ئادەم.

نوح بە درێژی باسی کراوە لـە سورەتی ئەلئەعرافدا. لـە سـورەتی هـود. لـە سورەتی ئەلمؤئمنون. لەسورەتی ئەلشوعەرادا. لـە سورەتی ئەلبەقەرە. لـە سورەتی نوحدا.

لەم کاتەدا کە خوای مەزن باسی نوح پێغەمەرمان بۆ ئەکا، وای بە باش ئـەزانم باسی هەندێ شتی زۆر گرنگی دۆزراوەی مێـژوی و ئـایینی بنوسـم کەلەئەوپـەڕی گرنگیدانـە ئەوەیش ئەمەیە، کە مامۆستای زۆر ئایین پـەروەر عـەبدولا زەهـاوی دەری خسـتوە، لـە ڕۆژنامەی ئەلئەهرامی قاهیرەدا بلاوکراوەتـەوە لەلاپـەڕەی (٣)ی ئـەو ڕۆژنامەیـەدا لـە ڕۆژی ١٩٨٤/١١/١٧ ئەمەش دەقی گۆڕانی ئەو دەرکەوتویە لە زمـانی عەرەبیـەوە بـۆ لای زمانی کوردی.

ئێستا زانای بەناوبانگی کەلەپورناسی عێراقی عەبدولا زەهاوی لـە لەندەنـە پایتـەختی بەریتانیا، ئەژی و بەردەوامە بۆ ئەوەی هەموو ڕوی زەوی ئاگادار بکا بە ڕوداوێکی تـازە. بە ڕاستی ئەو مرۆڤە هەڵساوە بە خۆئامادەکردن و خۆماندوکردن و کۆششەوە، مـاوەی دوو ساڵە لە مانا کردن و گۆڕانی چەند تەختەی بەنرخ (الألـواح القيّمـة) خەریکـە کـە نوسراوەتە لەسەر زمانی نوح بە سروش و بـە فـەرمانی خـوای بـەرزو مـەزن، هـەروەها ساڵێکی تری ماوە کۆتایی بەو گۆڕانە بهێنێ. لە پـاش ئـەوەی کـە شـارەزایی وەرگرتـوە بۆلای کردنەوەی گرێ کوێرەی ئەو گۆڕانە (فك رموزها) لە زمانی مزماریەوە لە زمـانی کوردیەوە کە ئەو گرێ کوێرانە بەو دوو زمانە نوسراونەتەوە.

بەڕاستی ئەو زانایە هەرشتێ لەو گۆڕانە کۆتایی پـێ بـهێنێ دای ئـەنێ لـە یـەکێ لـە گەنجینەکانی لەندەندنا چونکە بە گوێرەی بیری خۆی گەنجێکە بۆ مرۆڤ نرخەکەی نایەتە ژمارە.

بەر لەو باسەیش ڕون بۆوەتەوە کە ئەو تەختانە گفوگۆیان کردووە لە بارەی ئـەتۆم و ووزەی نەوەوی (الذرة والطّاقة النووية)، لەو باسەدا گفتوگۆیشـی کـردووە لـە توانـای کاول کەریەکەوە کە بۆ زەوی پەیدا ئەبێ بە هۆی تەقینەوەی ئەتۆمەوە.

ئەمڕۆ ئەو تەختانە دەری خستوە چەند شتێ تری تازە کە لە ئەوپەڕی گرنگیدان. وەك ئەمانەی خوارەوە:

بەڕاستی نوح باسی ووشەی قورئانی کردوە بە زەقی کە قورئان ئەفـەرموێ: بەڕاسـتی نەمانی کێوەکانی زەوی کە بە وێنەی خوری هەلاجی کراویان لێ دێ لە سوکی کێشـانەو تەخت بونیان لـەگەڵ زەوی کە ئەو ڕوداوە بە درێژی لـە قورئاندا باسکراوە.

بەڕاستی نوح ڕائەسپێرێ کە دوای مردنی لـەشەکەی بنێژرێ لـە گۆڕەکەیدا ڕوبـەڕوی مەکە، ئەو فەرمودەی نوحە پێسش دروست کردنـی کەعبـە بـوە بـە نزیکـەی (١٨٠٠) هەزار هەشسەد ساڵ.

بە ڕاستی کەشتی نوح لـەنگەری گرتوە لـە دووای لافاوەکە (التوفان) لـەســەر کێـوی (هلجورد) یانێ هەڵگورد لـە باکوری کوردستانی عێراقدا، هەڵگورد نـاوی تـازەی ئـەوە کێوەیە کە باسی کـراوە لـە قورئـاندا بـە نـاوی (الجـودی). نـوح چـەند پارچەیـە لـەو کەشتییەی خۆی بەکاری هێنـاوە بـۆ ئـەوەی یەکـەمین خـانوی پـێ دروسـت بکـا، ئـەو خانوەیش هەر ئەو شوێنەیە لـەشی نوحی تێدا شاراوەتەوە لـە پـاش ئـەوەی کۆچـی دوایـی کردوە. ژمارەی ئەو کەسانە ڕزگاریان بوە لـەگەڵ نوحدا لـەلافاو چوار کەس لـە نێرینـەو شەش کەس لـە ژنان بۆیەکەمجار.

عەبدوڵا زەهاوی لـە باسەکەیدا ئەڵێ: بەڕاستی کەشتی نوح لـەنگـەری داکوتـاوە لـە دوای شەش ڕۆژ لـەو لافاوە کە هەموو دانیشتوانی ڕوی زەوی داپۆشیوە لـەسـەر کێویـی (نەواخین) ئەو کێوە نانونراوە بەو ناوە، چونکە نـوح پـاش ئـەوەی خـوا ڕزگـاری کـرد لـەگەڵ ئەو کەسانە لـەگەڵی بوون و هاتنە دەرەوە دڵی کرایەوەو باوەڕی زۆرتربو بەخوا. لـە پاشا خوای گەورە داوای کرد لـە نوح ئەو کێوە ناوبنێ بـە نـاوی خۆیـەوە. ووشـەی نەواخین پێك هاتوە لـە دوپارچە: (نوا) کە ناوی نوحە. (خین) یانێ پێکەنین و دڵ کـراوە. لـە قورئاندا ناوی ئەو کێوە هاتوە بە (الجودی) کە کەشتیەکە لـەنگـەری لـەسـەر گرتـوە. وەك خوا ئەفەرموێ: (وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجودِي) یانێ کەشـتەیەکە ڕاوەسـتا لـەسـەر کێـوی جودی. ئەو کێوە ئێستا ناوی هـەڵگوردە کـە کەوتۆتـە کوردسـتانی بـاکوری عـێراق و باکوری شاری گلاڵـە بە نزیکەی شــەش میـل، بـەرزایی ئـەو کێـوە (١٦) هـەزار پێیـە،

یەکەمین جێگەیە کـە نـوح ئـارامی تێـدا گرتـوە گونـدی (ڕایاتـە) لـە بـاکوری کێـوی هەڵگوردەوە بە نزیکەی چوار میل. بەڕاستی نوح وەك باسکرا پارچەکانی کەشـتەیەکەی خۆی بەکارهێنا بۆ سەرگرتنی خانویێ کە خۆی لە قوڕو بەرد دروستی کرد.

تەختە بزماریە کۆنەکان ئەڵێن: بەڕاستی نوح پاش ئەو خانوەو کە خۆی دروستی کـرد بۆی دەرکەوت کە ئەو ناوچەیە کە گوندی ڕایاتی تێ کەوتوە ناوچەیەکی داپۆشراو چـڕە بارانی زۆرە، هەورە گرمەو بریسکەو چەخماخەی بەردەوامەو ڕەشەبای زۆرە، لەبەر ترسی منداڵەکانی وازی لەو جێگایە هێناو جێگایە تری دۆزیەوە لە تەنیشـتی خـوارەوەی کێـوێ ڕێگە بگرێ لە هەواو بای تیژو سەخت و پەناگابێ، دوایی خانویەکی دروسـت کـرد لـە گلاڵە، لـە دووای ئـەوبیش منداڵـەکانی پێنـج خـانوی تریـان دروسـت کـرد لـە نزیـك سەرچاوەی ئاوێك لەو ناوچەیە بۆ خۆیان لە نزیك خانوەکەی نوح و بە دراوسێتی نـوح. لەبەر ئەوەی نوح لە پێش لافاوەکەدا ئاشـی دروسـت ئـەکرد، دوای گەڕایـەوە بۆسـەر پیشەی خۆی، ئاشێکی بۆخۆی دروست کرد لە نزیك سەرچاوەی ئاوێك لەو ناوچەیـەدا شوێنەواری ئەو ئاشە ئێستا ماوەتەوە. لەو تەختانەدا هاتوە:

مەکە ئەو ڕوانگەیەیە کاتێ نوح کۆتایی بە ژیانی هات و زانی لەلایـەن پـەروەردگاری هەموو بوەنەوەرانەوە نزیکە هەتا هەتایە خـەونی پێـدا بکـەوێ و بمـرێ، ڕای سـپارد کـە (ئیریانی) کوڕی بیخاتە گۆڕەوە لە خانوی پێشەوەی خۆی کە گونـدی ڕایاتـەو دروسـتی کردبو بۆخۆی، سەری گرتبوو بەداری کەشتیەکەی خۆی، ئەوەی ڕاستیبێ ژنەکەیشی کە ناوی (ئەمنەیە) لەو خانوەدا نێژراوە.

مامۆستا عەبدوڵا زەهاوی ڕوی زۆر گەشایەوەو ئەیووت: ئالێرەدا موژدەیەکی گـەورە بۆ هەموو موسڵمانان کە بە ڕاستی نوح ڕای سپارد کە ڕوانگەکەی ڕوبـەڕوی مەکـەبێ، تەختە بزماریەکان بە ئاشکرا باسی ئەکرد بە هەموو دەربڕینێکەوە ناوی مەکەی پیرۆز کـە ئەو ڕوداوە ماوەیەکی زۆر بووە بەر لـە دروسـت کردنـی عەکبـە، لـە پاشـا مەکـە بـە (١٨٠٠) ساڵ دووای ئەو ڕوداوە دروست کراوە.

قورئان لـەسەر زمانی نوح (القرأن علی لسان نوح).

هەروەها مامۆستا عەبدولڵا زەهاوی لـەسەر باسەکەی خۆی ئەڕوا، ئەو مامۆستا زۆر لـە خواترسە ڕوی زۆرتر ئەگەشێتەوەو ئەڵێ: لێرەدا موژدەیە تـری زۆر گرنـگ بـۆ هـەموو موسڵمانان کە بە ڕاستی قورئان لـەسەر زمانی نوح بە ئاشکرایی باسی کردوە پێش ئەوەی سروش بێتە خوارەوە ەبۆسەر موحەمەد بە هەزاران ساڵ.

لـە دوای ئەوە کە تەختە بزماریەکان باسی ئۆتۆمۆو هێزە کاول کەرەکانی کرد ( الذرة والنواة والقوّة التدميرية )، نوح ئەفەرموێ لـە تەختەیە تردا: گۆڕەکان لـەمەوپاش نامێننەوە لـە ڕوی زەوی بەهۆی تەقینەوەی نەوەوەی، ئەو کاتە زەوی و ئاوو زەریاکـان هـەموویان گەرم ئەبن و ئاگریان لێ بەرز ئەبێتەوەو گەرم و سور ئەبن، لـەوەو دووا زەوی وەك مردار بۆی بۆگەنی لێدێ. لـە پاشا نوح بە ڕونی باس ئەکا دووای ئەوانە کـە شـێوەی نـەمان و کۆتایی ئادەمیزاد لـە قورئاندا باس ئەکرێ، ئەو لـەناوچونەیش وێنەی لـەناوچونی تۆفان نیە بۆ ئادەمیزاد. بەڵکو لـەمەوپاش بەهۆی هێزێکی کاول کەری ئـەبێ. بێگومـان زەوی لـەو کاتەدا وەك خوری هـەلاجی کـراوی پـێ دێ، ئـەو ڕسـتانە لـە قورئـاندا هـاتوون، وەك ئەفەرموێ: (كالْعِهْنِ الْمَنْفُوشِ).

لـە چ جێگەیە ئەو لافاوە دەستی پێ کردوە (أين بدأ الطّوفان)

لـە بارەی دەست پێ کردنی ئەو لافاوە کە زەوی و ئەو شتانەی بەسەر زەویەوە بـوون دای پۆشیون. لـە تەختـە بزماریەکانـەوە نـوح ئەفـەرموێ: بەڕاسـتی لـەو کاتـەوە زەوی دروست کراوە یەکەمین شارێ لافاو قوتی داوە شاری ڕەسە (الرّس) کە لـە قورئاندا باسی کراوە (قَوْمَ نُوْحَ وأصْحابَ الرّسِ)، ئەو شارە ئەمڕۆ کەوتۆتە ژێر گـۆڵاوە ڕۆچوەکـان و زەلکاوەکانی (رئس العينة) لـە باشوری عـێراقدا، ئـەویش نـاوی تـازەی (الرّسـە)ە هـۆی ناوبردنی بەو ناوە ئەوەیە کە نەوەکانی نوح چونەوە بۆ ئەو جێگەیە جارێ تری دووهـەم، ئەیانزانی ئەو جێگەیە بوە بە هۆی دەردی سەری بونەوەران و نەمانی ئادەمیزاد، ئەوان ئەو ناوەیان بەسەردا بڕی، مانای ئەو ڕستەیە: بەسەرهاتی ڕاستی ئادەمیزاد لـەوێدا شـاراوەتەوە (الحقيقة تكون هنا).

ئەو کەسانەی ڕزگاریان بوو لەگەڵ نوحدا (الذِينَ نَجَوا مَعَهُ).

ژمارەی ئەو کەسانە ڕزگاریان بوو لە گەڵ نوحدا: لە پیاوان چوارکەس: سـام. حـام. أشر. ئیریانی کوڕانی نوح. لە ژنان شەش کـەس: ئەمنـە، ژنـی نـوح و خوشـکی بـاوکی خۆی. چونکە لەو کاتەدا دروست بوە خوشکی باوکی خواسـتن. عایشـە. تـارا. ڕاعنـا. شەرمن. کچانی نوح. ڕوباب کچی مەتای برای دایك و باوکی نوح.

ترساندنێکی تر بۆ ئادەمیزاد (أنذار أخر للبشرية)

نوح ئەڵێ: هەمو ئـادەمیزاد بەگـەل و بـە کاربەدەسـتەکانیانەوە بترسـێنرێن لەچـەکی نەوەوی. لە خۆیـان بـایی ئـەبن و سـەریان لێ تێـك ئـەچێ بـە هـۆی کۆشـك و قـەڵاو تەلارەکانیانەوە، خوای مەزن و بێ گەرد بە نوح، ئەفەرموێ:

ئەگەر تۆ ئەوکەسانە بترسێنی لـەو لەناوچونـە کەباسـکران ئـەڵێن: چ کەسـێ ئـەڵێ ئەوانە پەیدا ئەبن بەبێگومان ؟ لەدواییدا تۆ بەوکەسـانە بڵـێ: ئەوپرسـیارانە لەمـەوپێش ئاراستەی من کراوە لەوکاتەدا من ئێوەم ئەترسان بەلافاو، ئەو کاتەیش ئێـوە ئـەتان ووت بەمن: چ کەسێ ئەڵێ ئەو لافاوە پەیدا ئەبێ ؟

عەبدوڵڵا زەهاوی کۆتایی بەگۆڕانکاری ووتەکەی خۆی ئەهێنێ و ئەڵێ: بەڕاستی مـن هیوام وایە بەناوی خواو بەناوی نـوح پێغەمـەرەوە کـەئادەمیزاد پێویسـتە ئـەو ترسـنادنە بەچاکی وەربگرن بەبێ گاڵتـە ، ئـادەمیزاد خۆیـان ئـەبن بـەهۆی نـەمانی خۆیـان . ئـەم ئەستێرەیە خوا بەخشیویەتی بەوان پیت و خواردەمەنی وای تێدایە پێویستە لەسەر ئادمیزاد خۆیان ماندوبکەن بـەهۆی ئەوشـتەوە لـەزانین کـە دراوە بـەوان و خزمـەتی مرۆڤایـەتی پێبکەن . لەجیاتی ئـەوەی کەشـەیتانەکانی زەوی کاولیبکـەن و لـەناوی بـن خزمـەتی مرۆڤایەتی بەگشتی پێبکەن و زەوی ئاوەدان بکەنەوە .

نوح باسی کردووە وڕایگەیاندوە کەلەوکاتەیشدا دەرفەت هەیـە بـۆ ئاشـتی لـەنێوان گەل و کاربەدەستاندا ئەوەی شایستە بێ بۆ زانایانی ئایینیو زانایـانی مرۆڤایـەتی کـەبزانن وئاگاداری ئەو ترسساندنە بن کە خوا فەرمویەتی لەبارەی ئەوشتەوە من ئەیڵێم.

کۆتایی بەگۆڕانکاری مامۆستا عەبدوڵلاً زەهاوی هات لەنوسراوە بزماریەکان بۆلای زمانی عەرەبی، منیش کەدانەری ئەم تەفسیرەم دەقی نوسراوەکەی مامۆستا عەبدولاً زەهاویم وەرگێراوە لەزمانی عەرەبیەوە بۆلای زمانی کوردی کەزمانی زك ماکی نوح پێغەمەرە ﴿ ﷺ ﴾.

دوای ئەوەی نوح گەلەکەی خۆی ئاگادارکرد و ترساندنی لەسزای خوا، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو سزایە توشیان ئەبێ لەپاشەڕۆدا ئەگەر خوا بەتەنها نەپەرستن، پیاوە گەورەو سەرۆکەکانیان بڕوایان پێ نەهێناو دژی وەستان. وەك خوا ئەفەرموێ :

فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍۭ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَءَاتَىٰنِى رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمْ لَهَا كَٰرِهُونَ ﴿٢٨﴾ وَيَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مَالًا ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ رَبِّهِمْ وَلَٰكِنِّىٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٩﴾ وَيَٰقَوْمِ مَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمْ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣٠﴾ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ

أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٌ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِىٓ أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًا ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ إِنِّىٓ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣١﴾

﴿ وَقالَ المَلأُ الّذِيْنَ مِنْ قَوْمِهِ مانَراكَ إلا بَشَـراً مِثْلَنـا ﴾ دوایـی تـاقمیٚ لـەسـەرۆکەکانی تاقمەکەی ئەوانەی ئەوتۆیان باوەڕیان نـەهێناو ووتیـان: ئێمـە تـۆ بـەهیچ نـازانین مەگـەر ئادەمیزادێکی وێنەی ئێمە نەپاشای و نەفریشتە، هیچ ڕێزێکی زیاترت نیە بەسـەر ئێمـەدا، چۆن تۆ لـەنێو ئێمەدا هەڵبژێرراوی بۆ پێغەمەرایەتی. ئێمـە چـۆن بچووکـی تـۆ ئەکـەین، بیریان لـەفەرمودەی نوح بەباشی نەکردەوە .

﴿ وَما نَراكَ اتّبَعَكَ إلاّ الّذِيْنَ هُمْ أراذُ لَنا بادِىءَ الرَّأيِ ﴾ وەئێمـە تـۆ نـابینین پـەیڕەوی تۆیان کردبیٚ مەگەر کەسانێکی ئەو تۆ دوای تۆ کەوتوون یەکەم کـات بەرلـەبیرکردنـەوە ئەوانە لـەنێو ئێمەدا هەژار وبیٚنرخن و جۆلاو پینەچی و پیشەیان بیٚنرخە .

﴿ وَمانَرىَ عَلَيْكُمْ مِنْ فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كاذِبِيْنَ ﴾ وەئێمـە بـۆ ئـێوە هیـچ گـەورەیی و ڕێزیٚ نابینین بەسەر ئێمەوە هەتا تۆ بەتەنها ببیت بەپێغەمەر، هەتا بتوانی ناخۆشـی و ئـازار تووشی ئەوکەسانە بکەی. وەڵامی تۆیان نەداوەتەوە، بـەڵکو ئێمـە گومـان ئەبەینـە ئێـوە درۆزنـن لـەداوای پێغەمەرایـەتیدا و ئەوانـەیش دووای تۆکـەوتوون درۆزنـــن لــەباوەڕ پیٚکردنی تۆدا وراست ناکەن وپیٚوەبوون و لـەرو داماون. بیٚگومان پیاوانی خاوەن پلـەو ڕەگەزپەرست بەچاوی بیٚنرخ تەماشای هەژاران ئەکەن، کردەوەی چـاك لای بیٚبـاوەڕان بۆش وبیٚ هودەیە، ئیتر چۆن باوەڕ بەپێغەمەران ئەکەن کەخاوەنی کۆشك و تەلار نین .

﴿ قالَ ياقَوْمِ أرَأيْتُـمْ إنْ كُنْتُـمْ عَلى بَيْنَـةٍ مِـنْ رَبّـي وآتـاني رَحْمَـةً مِـنْ عِنْـدِهِ ﴾ نـوح بەتاقمەکانی خۆی فەرمووی: ئێوە هەواڵ بدەن بەمن ئەگەر من لـەسەر بەڵگەیەکی ئاشکرابم

لەلایەن پەروەردگاری خۆمەوەو وە بەخشییێتی بەمن ورێزی منی گرتبێ بەپێغەمەرایەتی وئیسلامەتی لەلایەن خۆیەوە کەمن ڕاست ئەکەم، ئایا لەوکاتانەدا ئەتانەوێ من چ شتێ بکەم و داوای چ شتێ لە من ئەکەن ئایا ئەتانەوێ من واز لەپێغەمەرایەتی بهێنم و بڵێم بەخوا من پێغەمەرایەتیم ناوێ و بەئادەمیزاد ڕاناگەیەنم پەیامی تۆ .

﴿ فَعَمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوها وَأَنْتُمْ لَها كارِهُونَ ﴾ دوایی ئێوە کوێرایی دراوە بەسەر چاوەکاناتانا و پێغەمەرایەتی من لاتان داپۆشرابێ ونەتوانن ڕێگەی پێ بدۆزنەوە، ئایا ئەتانەوێ ئێمە ئێوە ناچار بکەین لەسەر وەرگرتنی ئەو بەڵگانەو باوەڕ بەفروستادەیی من بهێنن و خوابناسن کەتواناتان هەیە بەسەریانا بەوێنەی من و لەکاتێکا ئێوە ئەو شتانەتان پێ ناخۆشبێ ولاتان گرانبێ، ئەو پێغەمەرە بەوشتانەوە هاتوەتە خوارەوە خۆشتان ناوێن، ئەبێ‌بزانن زۆتان لێ‌ناکرێ و خۆتان سەربەستن .

﴿ وَياقَوْمِ لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مالاً إِنَّ أَجْرِيَ إِلاّ عَلَىَ اللهِ ﴾ وەئەی تاقمەکانی من: من داوا لەئێوە ناکەم لەسەر ڕاگەیاندنی فەرمودەی خوا هیچ داراییە هەتا گرانبێ لەسەرتان گفتوگۆی من، کرێ وپاداشتی من لەسەر هیچ کەسێ نیە مەگەر هەر لە سەر خوایە، پێغەمەران داوای کرێی ناکەن ئەگەر ڕاست بکەن. بەلاّم مفتە خۆر و دەست بڕ و درۆزن ئەو کەسانەن داوای دارایی و سامان لەدانیشتوان ئەکەن بۆ گەیاندنی فەرمودەی خواو پێغەمەران. لەم سەردەمەی ئێمەدا ئەو جۆرە مرۆڤانە زۆرن بەتایبەتی ئەوکەسانەی بەناو ئەڵێن: ئێمە خاوەنی تەریەقەتین، هەندێ بەناوزانای ئایینی دوکانی تەڵاق چاکردنەوو نوشتە نوسینیان داناوە. بێ‌باوەڕان داوایان کرد نوح باوەڕداران دەربکا .

﴿ وَما أَنا بِطارِدِ الَّذِيْنَ أَمَنُوا إِنَهُمْ مُلاقُوا رَبِّهِمْ ﴾ وەنوح لەوەلاّمی ئەوانا فەرموی : من کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە ڕاویان نانێم و دەریان ناکەم هەرلەبەرئەوەی هەژار و بێ سامانن، هەژاری لای خوابەگوناه دانانرێ، یادەریان کەم لەسەر ئەوەی باوەڕیانهێناوە. بەڕاستی ئەو کەسانە بەخزمەت پەروەردگاری خۆیان ئەگەن لەڕۆژی دواییدا، هەرخوا ئەزانێ بەنیازی دڵیان، پاداشتیان بداتەوە بەگوێرەی باوەڕی خۆیان .

﴿ وَلكِنِّي أراكُم قوماً تجهلون ﴾ وە بەلاّم من ئێوە بەگەلێکی نەزان و گێـل تەماشـا ئەکـەم، نازانن بەو شتانە ئەبنە هۆی سوودی ئێوە، زۆر راستە مرۆڤ دوژمنی شتێکە نەیزانێ .

﴿ وَيَاقَوْمِ مَنْ يَنصُرُنـي مِـنَ اللهِ إنْ طَـرَدْتُـهُمْ أفَـلا تَذَكَّـرونَ ﴾ وەئـەی تـاقمی مـن چ کەسێکە یارمەتی من بدا و قەدەغەی بکا لـەمن سـزایە لـەلایـەن خـواو بێـت ئەگـەر مـن ئەوباوەڕدارانە ڕاوبنێم و دەریان بکەم ؟ ئایا دوایی بۆ ئێوە ئامۆژگاری وەرناگرن و لـەخوا ناترسن کەداوای دەرکردنی ئەو کەسانە ئەکەن .

﴿ وَلا أقُولَ لَكُمْ عِنْدِي خَزائِنُ اللهِ وَلاأعْلَمُ الْغَيْبَ وَلاأقُولُ إني أمْلِـكُ ﴾ وەمـن بـەئێوە نالّێم لای من هەیە گەنجینەو داراییەکانی خواو خاوەنی جۆرەها سامانم و ئەیدەم بـەخۆم و بەوکەسانەی پەیڕەوی من ئەکەن. بەڵکو من مرۆڤێکم وەك ئێـوەو ئاگـام لـەنیازی دڵـی کەس نیە و، من ئەو شتانەی دیارنین و لـەبەرچاو نین نایانزانم و نـایش لێـم بەڕاستی مـن فریشتەم. بەڵکو من مرۆڤێکم .

﴿ وَلاأقُولُ لِلّذِيْنَ تَذدَري أعْيُنُكُمْ لَنْ يُؤتِيَهُمُ اللهُ خَيْراً ﴾ وەمن نالّێم بەکەسانێکی ئەوتۆ ئێوە فەرمان ئـەدەن بەسـەریانا بـێ نرخـی و بـەچاوی سـوکەوە تەماشـایان ئەکـەن خـوا نابەخشێ بەوان چاکە لـەهەردوو جیهاندا، خوا سەریان ئەخاو یاریدەیان ئـەداو ڕاغوییـان ئەکا .

﴿ اللهُ أعْلَمُ بِما في أنْفُسِهِمْ إني إذاً لِمَنَ الظـالِمِيْنَ ﴾ خـوا زانـاترە بەشـتێ لـەدەروونی ئەوکەسانەدایە لـەچاکەو لـەخراپە و نیازی پـاك لـە وەرگرتنـی بانگـەوازی نـوح بـۆلای پەرستنی خوا، ئەگەر ئەوەی ئێوە داوای ئەکەن من بیکەم لەگەڵ باوەڕداران. بەڕاستی من لەوکاتەدا لـەستەمکاران ئەژمێرڕێم لـەخۆم و لـە بونەوەران. بێباوەڕیە بەنامەکانی خوا.

لەپاشا خوای مەزن باسی وەڵامدانەوەی گەلی نوحمان بۆ ئەفەرموێ بەرانبەر بە نوح :

قَالُواْ يَـٰنُوحُ قَدْ جَـٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ

إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِيٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَعَلَيَّ إِجْرَامِي وَأَنَا۠ بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُجْرِمُونَ ﴿٣٥﴾

﴿ قالُوا يانُوح قَدْ جادَلْتَنا فَـأَكْثَرتَ جِدالَنـا ﴾ تاقمەکـەی نـوح ووتیـان: ئـەی نـوح: بەڕاستی تۆ دوژمنایەتی ئێمەت کردو گفتوگۆی زۆرت دژی ئێمەت کـردوە دوایـی ئـەو دوژمنایەتیەت زۆرتر کرد ولەئەندازە دەرچوە .

﴿ فَآتِنا بِما تَعِدُنا إنْ كُنْتَ مِنَّ الْظالِمِيْنَ ﴾ کەواتـە تـۆ ئەوسـزایە بـەڵێنی پیَ‌ئـەدەی و هەڕەشەی پیَ‌ئەکەی لـەئێمە بیهێنە ئەگەر تۆ لـەوکەسانەی ڕاست ئەکەی لـەبەڵێنی خۆتا.

﴿ قالَ إنّما يَأتِيكُمْ بِهِ اللهُ إنْ شاءَ وَمـاأَنْتُمْ بِمُعْجِزيْـنَ ﴾ نـوح فـەرموی: بەڕاسـتی ئـەو هەڕەشەی منە هەرخوا ئەی هێنیٚ ئەگەر ئارەزوی هەبیٚ زوتـر بـیٚ یـا درەنـگ تـر، ئێـوە ناتوانن پەکی خوا بخەن و ڕێگە لەو سزایە بگرن، ناتوانن لەدەستی خوا هـەڵبێن بـا پێتـان وابیٚ ژمارەتان زۆرە .

﴿ وَلايَنْفَعَكُـمْ نُصْحِـيَ إنْ أرَدْتُ أنْ أنْصَـحَ لَكُـمْ إنْ كـانَ اللهُ يُرِيْـدُ أنْ يُغْـوِ بِكُـمْ ﴾ وەئامۆژگاری من سوود بەئێوە نابەخشیٚ ئەگـەر مـن بمـەویٚ کـەئامۆژگاری ئێـوە بکـەم، چونکە ئێوە دڵتان ڕەقەو ئاوڕیٚ نادەنەوە بۆ دۆزینەوەی ڕاست و ئامۆژگاری سوودی بۆ ئێوە نابیٚ ئەگەر خوا بیەویٚ ئێوە لـەڕێگەلادا و بنەبڕتان بکا بەهۆی سـزای خۆیـەوە، ئیـتر من چارەم نامێنیٚ. بەڵام هەرچەندە هەمووشتیٚ بەدەستی خوایە، بێگومان خوا ئـادەمیزادی سەربەست کردوەو ئەقڵی داوەتیٚ بۆ هەڵبژاردنی کردەوەی چـاك یـاخراپ ، هـەرکامیان هەڵبژێریٚ خوا ئەوەیانی بۆ دروست ئەکا.

﴿ وَإِلَيْهِ تُرْجِعُونَ ﴾ وەئێوە هەربۆلای خوا ئەگەڕێنەوە لەڕۆژی دواییدا، پاداشتی هەمو کەسێ ئەداتەوە بەگوێرەی کردەوەی خۆیان چاکبێ یاخراپ .

﴿ أمْ يَقولُونَ افْتَراهُ ﴾ بەڵکو تاقمەکانی نوح ئەڵێن: نوح خۆی ئەو شتانەی هەڵبەستوەو سروشی خوانیە، خوای مەزن ئەفەرموێ. کەئەوەیان بۆتۆ ووت لەوەڵامی ئەواندا .

﴿ قُلْ إنْ إفْتَرَيْتُهُ فَعَلّي إجْرامِي وَ أنا بَرِيءٌ مِمّا تَجْرِمُونَ ﴾ تۆ بڵێ: ئەگەر من خۆم ئەو سروشەم هەڵبەستبێ دوایی لەسەر من ئەکەوێ بەتەنها تۆڵەی ئەو تاوان کردنەی من و، من بێزارم لەتاوانی شتێ ئێوە ئەیکەن لەبەدۆرخستنەوەی من و بوختان بەمن کردن کە گۆیا من لەخۆمەوە سروشم هێناوە .

لەپاشان خوای مەزن باسی بەسەرهاتی نوح و گەلەکەی ئەکا، دوای ئەوەی گفتوگۆی زۆر لەنێوان نوح وگەلەکەی ڕوی داو ئەفەرموێ :

وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۚ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٣٧﴾ وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُوا۟ مِنْهُ ۚ قَالَ إِن تَسْخَرُوا۟ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾

﴿ وَأُوحِيَ إِلَى نُوحٍ أَنَّهُ لَنْ يُؤْمِنَ مِنْ قَوْمِكَ إِلا مَنْ قَدْ آمَنَ فَلا تَبْتَئِسْ بِماكانُوا يَفْعَلُونَ ﴾
وە سروش نێررا بۆ لای نـوح کەبەڕاسـتی کەگـەلی تـۆ باوەڕنـاهێنێ لەمـەوپاش مەگـەر کەسێکی ئەوتۆ باوەڕی هێنابێ لەمەوبەر ، دوایی تـۆ خەفـەتبار مەبـە بـەهۆی شتێکەوە ئەوان ئەیکەن لـەبەدرۆخستنەوەی تۆو ئازاردانی تۆو گەیاندنی پەیامی خوا ، خوای مـەزن هەواڵی بەنوح دا ئەوشتەی ئێمە بەتۆمان سپارد کۆتایی پیٚهـات ویـەیامی منتـان گـەیاند بەوشێوەیە داوات لیٚکرابوو .بەلاّم ئەوان وەلاّمی تۆیان نەدایەوە .

کاتیٚ خوای مەزن ویستی گەلی نوح بنەبڕ بکا فەرمانی دا بەپێغەمەری خۆی کەشـتیەك دروست بکات بۆ خۆی و تاقمە باوەڕدارەکانی . فەرموی :

﴿ وَاصْنَعْ الفُلْكَ بِأَعْيُنِنا وَوَحْيِنا وَلا تُخاطِبْنِي في الَّذِيْنَ ظَلَمُـوا أَنَـهُمْ مفرَقُـونْ ﴾ وە تـۆ دروست بکە کەشتیە بەئاگاداری ئێمەو لـەبەرچاوی ئێمە و بەهۆی سروشی ئێمـە بـۆلای تۆ لەچۆنیەتی دروست کردنی ئەو کەشتیە بەچ شێوە یە دروسـتی بکـەی تـۆ گفتـو گـۆ مەکە لـەگەڵ من و داوام لیٚمەکە لـەبارەی کەسانێکی ئەوتۆ ستەمیان لــەخۆیان کـردوە و باوەڕیان نەهێنا کەلـەوکەسانە ببورم، بۆیان مەپاڕێرەوە بەڕاستی ئەوان ئــەخنکێرێن بـەئاو بەهۆی فەرماندانی منەوە، ئیتر بائەوکەسانە نزیکترین خزمی خۆت بن .

﴿ وَيَصْنَعِ الْفُلْكَ وَكُلَّما مَرَّ عَلَيْهِ مَلأٌ مِـنْ قَوْمِـهِ سَـخِرُوا مِنْـهُ ﴾ وەنـوح دەسـتی کـرد بەدروست کردنی کەشتیەکە بەو جۆرەی خوا فەرمانی پیٚدابوو، هەمووکاتیٚ سەرۆکەکانی تاقمەکەی بڕۆشتنایە بەلای نوحدا گاڵتەیان بەنوح ئەکرد و پیٚئەکەنین، نـوح ئەیفـەرموو: من خۆم ئەزانم چ شتیٚ ئەکەم .

﴿ قالَ إِنْ سَخَرُوا مِنّا فَإِنّا نَسْخَرْ مِنْكُمْ كَما تَسْـخَرُونَ ﴾ نـوح فـەرموی بەتاقمـەکانی خۆی: ئەگەر ئێوە ئێستا گاڵتە بەمن ئەکەن و نازانن من چ شتیٚ دروست ئەکـەم، دوایـی ئێمەیش بەڕاستی گاڵتە بەئێوە ئەکەین لـەکاتی هاتنە خوارەوەی سزا بۆ سەر ئێوە هـەروەك ئێوە گاڵتە بەئێمە ئەکەن ئێستا .

﴿ فَسَوْفَ تُعْلَمُونَ مَنْ يَأتِيهِ عَذابٌ يُخزِيهِ وَيَحلُّ عَلَيْهِ عَـذابٌ مُقِيـمٌ ﴾ لەمـەودوا بـەم نزیکە ئێوە ئەزانن چ کەسێ لەئێمە و لەئێوە دێت بۆلای سزایە ئابڕوی بباو ڕسـوای بکـا لەجیهاندا بەخنکانی لەنێو لافاودا، چ کەسێ ئەڕژێ بەسەریا سـزای بـەردەوام و پایـەدار لەپاشەڕۆژدا و هەرگیز ڕزگاری نەبێ لەوسزایە لەڕۆژی دواییدا .

گەلی نوح ئەیان ووت: ئێمە ئەزانین سودی دروست کردنی ئـەو کەشـتیە چ شـتێکە، بەلاَم بەگوێرەی هەوەسی خۆیان گاڵتەیان بە نوح ئەکرد. بەلاَم نوح بڕوای بەخۆی هـەبو ئەیزانی ئەنجامی کردەوەی و باوەڕداران چۆنـە ؟پاشـەڕۆژی بێبـاوەڕانیش چـۆن ئـەبێ . لاوانی ئەم سەردەمەیش لەگاڵتە کردنیـان بـەئایین وێنـەی بێبـاوەڕانی ئـەو سـەردەمەن، ئەوەتە ئەڵێن: نوێژ وڕۆژ و لـە خولی بیستەمدا باوی نـەماوە، گاڵتـە بەوکەسـانە ئەکـەن خاوەنی ئایینی پاکن و نازانن سودی پەرستنی خوا چ شـتێکە، وێنـەی گـەلی نـوح ئـەیان ئەزانین سودی دروست کردنی ئەو کەشتیە چ شتێکە، بەبێ ئاو چـۆن دروسـت ئـەکرێ هەتا توشیان بەتوشی ئەو لافاوە بو. کەواتە پێویستە لاوانی ئەم سەردەمە بترسـن لەسـزای خوا، نازانن خوای گەورە چ شتێکی لایە .

نوح بەردەوام بـو لەسـەر دروسـت کردنـی ئـەو کەشـتیە بـەگوێرەی ئامۆژگـاری و سروشی خوای مەزن بەباوەڕی بێگومانەوە .

حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلۡنَا ٱحۡمِلۡ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ وَمَنۡ ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٞ ﴿٤٠﴾ ۞ وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٤١﴾ وَهِيَ

تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ سَآوِي إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ ﴿٤٣﴾ وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ ۖ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٤٤﴾

﴿ حتّى إذا جاءَ أمْرُنا وَفار التنّور﴾ هەتا کاتێ فەرمانی ئێمە ڕۆیشت بـۆ سـزادانی ئـەو گەلـەی نوح، ڕوی زەوی جۆشی خوارد و ئاو لـەڕوی زەوی لـەهەمو لایەکەوە هەڵقولا.

بۆ زانین: ووشەی (التنّور ) بەزۆر ماناهاتوە: دەرکـەوتنی ڕونـاکی بـەیانی، ئەوشتەی ئەوتۆ نانی تێدا ئەبرژێ ئەم مانایە بیرۆکەی زۆرترینی زانایانە. بـەمانا ڕوی زەوی، زانایـان لایان وایە لێرەدا ئەو مانایە مەبەستە، هـەرکامیانبێ مەبەسـت نـاگۆڕێ، خوایـش ئـەزانێ بەهەمو شتێ .

﴿ قُلْنا احْمِلْ فِيها مِنْ كُلِّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ ﴾ وەئێمە بەنوحمان ووت: تۆ هـەڵبگرە لـەنێو ئەو کەشتیەدا لـەهەموو جۆرە گیانداری سودی لێ وەرئەگیرێ و لـەهـەموو جوتـێ دووان نێرێك ومێیەك، خوای مەزن بە میهرەبانی خۆی ئەو گیاندارانەی بۆ نوح کۆکردەوە .

﴿ وَأهْلَكَ إلا مَنْ سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ ﴾ وەهـەڵیش بگـرە خێزانـەکانی خـۆت ئەوانـەیان باوەڕدارن مەگەر کەسێك لـەوخێزانەت پێش کەوتبێ لـەسەری فەرمودەی ئێمەو بڕیارمـان دابێ بۆ خنکاندنی بە ئاوو باوەڕی نەهێنابێ وەك ژنەکەی نوح و کوڕەکەی .

﴿ وَمَنْ آمَنَ ﴾ وەهەڵیشی بگرە لەنێو ئەوکەشتیەدا کەسێ باوەڕی هێناوە لەجگەی خێزانەکانت .

﴿ وَما آمَنَ مَعَـهُ إلاَّ قَلِيْـلٍ ﴾ وەباوەڕیـان نـەهێنابوو لـەگـەڵ نوحـدا مەگـەر کـەمێك لـەگەڵـەکەی خۆی وەك ژنێکی تری و کوڕەکانی و (٧٢) کەسی تر لـەوان .

﴿ وَقالَ ارْكَبُوا فِيْها بِسِمِ اللهِ مَجْراها وَمَرْساها ﴾ وەنوح فـەرمانی خـوای بـەجێهێناو فەرموی بەوانەی لـەگەڵیابون: ئێوە بچنە نێو ئەو کەشـتیە بـەهۆی پـیرۆزی نـاوی خـواو لـەکاتی ڕۆیشتنی کەشتیەکە ولـەکاتی وەستانیدا و لـەنگەر ئـەگرێ، یـانێ بـەهۆی هـێزو توانای خواوّ ئەوکەشتیە ئەڕواو ئەیشوەستێ .

﴿ إنَّ رَبِّي لَغَفُـورٌ رَّحِيْـمٌ ﴾ بەڕاسـتی پـەروەردگاری مـن لێ خۆشبوونـــی زۆرە بـــۆ باوەڕداران، میهرەبان و خاوەن بەزەییە کە ڕزگاریان بکا لـەمەترسی ئەو لافاوە .

﴿ وَهِيَ تَجْرِي فِي مَوْجٍ كَالجِبالِ ﴾ وەئەو کەشتیە ئەڕۆیشت بەسەر نشینەکانەوە لـەنێو شەپۆی ئاودا کەوەك کێوەکان وابون ، لـەو کاتە تەنگیەدا نـوح بـانگی کـەنعانی کـوڕی خۆی کرد بەپەژارەوە وەك ،خوا فەرموی :

﴿ وَنادى نُوحٌ ابْنَهُ وَكانَ فِي مَعْزَلٍ يابُنَيَ إرْكَبْ مَعَنا ﴾ وە نوح بانگی کوڕەکەی خۆی کرد لـەکاتێکا ئەوکوڕە لـەگۆشەیەکی کەناردا بو بەتەنهایی: ئەی کوڕی خۆشەویستم: تۆ سواری کەشتیەکە ببە لـەگەڵ ئێمەدا و باوەڕبهێنە بانەخنکێی لـەنێو ئاودا .

﴿ وَلاتَكُنْ مَعَ الْكافِرِيْنَ ﴾ وە کوڕی خۆم تۆ لـەگەڵ بێبـاوەڕاندا مەبـە و ئـەخنکێی و ئەمری. نوح ئەیزانی ئەو کوڕەی بێباوەڕو دوو ڕووە .

﴿ قالَ سآوي إلى جَبَلٍ يَعْصَمُنِي مِنَ الماءِ ﴾ کوڕەکـەی نـوح ووتـی: مـن لـەمـەوپاش پەنائەبەم بۆلای کێوێ ئەمپارێزێ لـەئاوو ناخنکێم، وای ئەزانی ئەوو گیروگرفتـە توشـیان ئەبێ ئاوە بەتەنها، نەی ئەزانی هۆی خنکان خەشمی خوایە لـەبێباوەڕان و ئەیەوێ بنـەبڕیان بکا .

﴿ قالَ لاعاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أمرِ اللهِ إلا مَنْ رَّحِمَ ﴾ نوح فەرموی بەکوڕەکەی: ئەمڕۆ هیچ پارێزەرو پەنایە نیە ڕێگەبگرێ لەفـەرمانی خـوا بـۆ سـزادان و خنكـان بـەئاو، كێوەكـان هەرچەندە بەرزبن ڕێگە لەتوانای خوا ناگرن مەگەر بۆ كەسێ خـوا بەخشـندەیی لـەگـەڵ كردبێ و ویستبێتی بیانپارێزێ لەئاوی لافاو. كەواتە گیرو گرفتی ئێوە بەهۆی لافاوەكەوە نیە و پارێزەر هەر خوایە بەتەنها، هەركەسێ خوا میهرەبانی لەگەڵ كردبێ ڕزگاری ئەكا .

﴿ وَحالَ بَيْنَهما الْمَوْجُ فَكانَ مِنَ المغرقين ﴾ وەكەوتە نێـوان بـاوك و كـوڕەوە شـەپۆلی ئاوی لافاوەكە، دوایی كوڕەكەی نوح لەڕیزی ئەو كەسانەی باوەڕیان نـەهێنابوو خنكـا، ئەو گفتوگۆیانە ڕۆیشت لەنێوان نوح و كوڕەكەیدا، وێنەی ئەوەی ئـەوان یـەكجار زۆرە لەنێوان باوك و كوڕی ئەمڕۆدا لە خوا یاخی بوون و بڕو بەهانەی پوچ دروست ئەكەن و نازانن پاشەڕۆژ یان وێنەی نوح و كوڕەكەیەتی .

﴿ وَقِيْلَ ياأَرْضُ أبْلَعي ماءَكَ وَياسَماءُ اقْلِعِي ﴾ وەبێژرا لەلایەن خـوای مەزنـەوە: ئـەی زەوی: قوت بدەرەوە و هەڵی مژە ئاوەكەی خۆت و ئەی ئاسمان: بگرەوە ئاوی خـۆت و بەسبێ هاتنە خوارەوەی باران .

﴿ وَغَيْضَ الْماءُ قضى الأَمْرُ ﴾ وەچوە خوارەوە ئاو بەزەویدا و جێبـەجێكرا فـەرمانی خوا كەویستبوی بنەبڕكردنی گەلی نوح ورزگاركردنی نوح و خێزانەكەی و باوەڕداران.

﴿ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِي ﴾ وەكەشتیەكە ڕاوەستاو لەنگەری گـرت لەسـەر كێـوی جودی كەنزیكی شاری موسڵە لە بـاكوری عـێراق، ئـەو كێـوە كـەنێو نـراوە بـەجودی لەبەرئەوەیە گـەلی كـورد نـاوبراون بـە ( گۆتـی ) دانیشـتووی دەوری ئـەو كێوەبوون لەكۆندا، بۆ ئەو مەبەستە تەماشای نامەی جەمال بابان بكـە بـەناوی (أصـول أسمـاو المدن والمواقع العراقيه ) لاپەڕەی ( ٩٥ - ١١٦- ١٢٩ ) .

﴿ وَقيلَ بُعْداً لِلْقَوْمِ الظالِمِيْنَ ﴾ وەبێژرا لەلایەن خواوە : دووربـێ بـەدور بونـی زۆر لـە میهرەبانی خوا بۆ تاقمێ ستەمیان لەخۆیان كردو باوەڕیان نەهێناو هەمویان خنكان .

خوای مەزن كۆتایی بەباسی نوح و لافاو وگەلەكەی نوح ئەهێنێ و ئەفەرموێ:

وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ ۖ فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۖ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ ۖ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾ قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهْبِطْ بِسَلَٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ ۚ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٨﴾ تِلْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا ۖ فَٱصْبِرْ ۖ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾

﴿ وَنـادى نُـوحٌ رَبُّـهُ فَقـالَ رَبِّي إنَ النبـي مِـنْ أهْلِي ﴾ وە نـوح هـاواری کـردە پەروەردگاری خۆی، دوایی ووتی ئەی پـەروەردگاری مـن: بەڕاستی ئـەو کـوڕەی مـن هەندێکە لـەخێزانەکانی من، تۆیش فەرموتە خێزانەکانی تۆ ڕزگار ئەکەم لـەخنکان .

﴿ وَإنَ وَعْدَكَ الْحَقُ وَانْتَ أحْكَمُ الحاكِمِيْنَ ﴾ وەبەڕاستی بەڵێندانی تۆ زۆر ڕاستە، تـۆ دادوەرتریـنـی هـەمو دادوەرانـی، لـەهـەمو زانایـان زانـاتری و فـەرمانی تـۆ هـەر ڕاسـتە وبێگومانە .

﴿ قالَ یانُوحَ إنَّهُ لَیْسَ مِنْ أهْلِكَ إنَّـهُ عَمَـلٌ غَیْرُ صـالِحٍ ﴾ خـوا فـەرموی ئـەی نـوح: بەڕاستی ئەو کوڕە لـەخێزان و هاو ئایینی تۆ نیە، لـەوکەسانە نیە خوا بەڵێنی دابێ ڕزگاری بکا، چونکە بەڕاستی ئەو کورە خاوەنی کردارێکی چاك نیە، خێزانی پێغەمـەران پێویستە پیاو چاك و لـەخوا ترسبن، باوەکو لـەڕەگەزیشدا دووربن لـەپێغەمەران .

﴿ فَلا تَسْألْنِ مالَیْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ ﴾ دوایی تۆ داوا مەکە لـەمن شـتێ نـەزانی چاکـە یـا خراپە، مەیلی باوکایەتی پاڵ بەتۆوە نەنێت ئـەو داوایـەم لێ بکـەی، لـەو ڕاسـتیەوە ڕون ئەبێتەوە ئەو پەیوەندیە لـەنێوان باوك وبرادایە بەهۆی بێ باوەڕیەوە لـەیەك ئەبچڕێن. پشـت و ڕەگەز لای خوا باوی نیە و بەهیچ شتێ دانـانرێ بۆیـە خـوای مـەزن قەدەغـەی کـرد لەنوح پاڕانەوەی بۆ کوڕەکەی کەباوەڕی نەهێنابوو، عـەلی کـوڕی ئـەبو تـالیب ئـەڵێ: دۆستی موحەمەد کەسێکە پەیڕەوی خـوا بکـاو بیپەرسـتێ بـاوەکو لەویشـەوە دووربـێ، دوژمنی موحەمەد کەسێکە بێفەرمانی خوا بکا، باوەکو خزمی نزیکیبێ .

﴿ إنِي أعِظُكَ أنْ تَكُونَ مِنَ الْجاهِلِیْنَ ﴾ بەڕاستی مـن ئامۆژگـاری تـۆ ئەکـەم و لێـت قەدەغە ئەکەم لـەو کەسانەی چاك وخراپ نەزانن رلـەبارەی ئـەو پرسـیارەتەوە بـۆ ئـەو کوڕەبێ باوەڕەت، داوای شتێ بکە خوا بڕیاری دابێ بیکا لـەخنکاندنی کوڕی بێباوەڕت.

﴿ قالَ یـارَبِّ إنِّـي أعُـوذُ بِـكَ أنْ أسْألَكَ مـالَیْسَ لِـي بِـهِ عِلْـمٌ ﴾ نـوح ووتـی: ئـەی پەروەردگاری من: بەڕاستی من پەنائەگرم بەهۆی تۆوە کـەمن داوابکـەم لـەتۆ شـتێ مـن نەزانم ئەو شتە چاکە یا خراپە، کەتۆ بتەوێ شتێ بکەی من داوابکەم تۆ ئەو شتە نەکەی .

﴿ وَإلا تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِي أكُنْ مِنَ الْخاسِرِیْنَ ﴾ وەئەگـەر تـۆ لـەمن خـۆش نـەبی و بەخشندەیم لـەگەڵ نەکەی من لـەو کەسانە ئەبم زیانیان بەخۆیان گەیاندوە، ناوەڕۆکی ئـەو ئایەتە ئەوپەڕی ترساندنە لـەخوای گەورە، ئەوپەڕی پاڕانەوەیە لەلایەن پێغەمەرێکەوە کـە گوناهی لێ ناوەشێتەوە، پێویستە ئێمە بەو هەموو کردەوە خراپانەوە خۆمـان ئـەیزانین بـەو فەرمودەیە تەمێ خوا ربن ووانەی لێ وەرگرین .

پرسیار/ چۆن خوای گەورە و بەبەزەیی منالاّنی بیّ گوناه لەگەلی نوح و لـەگیانادارانی بیّ تاوان هەمویانی لەناوبرد ؟

وەلاّم/ زانایان وەلاّمی زۆری ئە وپرسـیارەیان داوەتـەوە، ئـەوەیان جیّگـەی متمانـەبیّ ئەمەیە: کە خوای مەزن خاوەنی هەمو شتیّکە، ئەوەی بیەویّ بیکا ئەیکا ونـابیّ پرسـیاری بکریّ .

﴿ قِيْلَ يانُوحُ اهْبُط بِسَلامٍ مِنّا وَبَرَكاتٍ عَلَيْكَ ﴾ بیّژرا لـەلایەن خواوە: ئەی نــوح: تـۆ دابەزەو بیّرە خوارەوە لـەنیّو کەشتیەکەدا بۆ سـەرزەوی بەئاسایش و بەئاشتی بژی لـەلایـەن ئیّمەو بەچەندین فـەڕو پیـت و پـیرۆزی لـەسـەر تـۆ بـیّ بـەزۆربونی منـالّو نەتـەوەکانت لەمەودوا، هەتا بەئادەمیّکی دووهەم بناسریّت .

﴿ وَعَلَى اُمَمٍ مِمَنْ مَعَكَ ﴾ وەئەو ئاسایش و پیرۆزیە لـەسەر تاقمیّکیش بن لـەگەلّ تـۆن و باوەڕیان هیّناونەتەوە لە دوای نەوە هەتا ڕۆژی دووایی

﴿ وَاُمَمٌ سَنُمَتِعُهُمْ ثُمَّ يَمسَّهُمْ مِنّا عَذابٌ اَلِيْمٌ ﴾ وەچەندین تاقمیّ تـر لـەمـەودووا پـەیدا ئەبن ئیّمە بەخۆشی ئەیان ژێنین. لـەجیهاندا بەڕۆزی فراوان وسامانی زۆر، لـەپاشا لەلایـەن ئیّمەوە توشیان ئەبیّ سزایەکی خاوەن ئـازار لــەڕۆژی دواییـدا بـەهۆی بیّباوەڕی و بـیّ فەرمانی خوا، وەك گەلی عادو سەمود و بت پەرستانی تر .

﴿ تِلْكَ مِنْ اَنْباءِ الْغَيْبِ نُوحِيها إلَيْكَ ماكُنْتَ نَتعْلَمُها اَنْتَ وَلاقَوْمُكَ مِنْ قَبْلِ هذا ﴾ ئـەو هەوالّەی نوح وبەسەرهاتی گەلی نوح هەندیّکە لـەو هەولاّنەی نادیارین و نهیّنی بوە ئیّمـە ناردومانە بۆلای تۆ بەسروش بەهۆی جبرەئیلەوە، نەتۆو نەتاقمەکانی تۆ ئــەو هەوالاّنـەیان نەزانیوە بەرلـەڕەوانەکردنی سروش بۆلای تۆ .

﴿ فَاصْبِرْ اِنَ الْعاقِبَةَ لِلْمُتَّقِيْنَ ﴾ دوایی تۆ ئارام بگرە و خۆڕاگر بە لـەسـەر ئەوشـتانەی توشی تۆ ئەبن لـەلایەن قورەیشیەکانەوە بەهۆی گەیاندنی ئایینی خوا بەوان. هەروەك نـوح خۆگرو خاوەن ئارام بوو لـەسەر ئازاری گەلـەکەی خـۆی. بەڕاسـتی پاشـەڕۆژی چـاك و ڕزگاربوون بۆ ئەوکەسانەیە خۆیان ئەپاریّزن لـەگوناه ولـەبت پەرستی وبیّباوەڕی و لـەخوا ئەترسن وێنەی ئەو کەسانە باوەڕیان هیّناوە .

باسکردنی لافاو: وەنەبێ هەربەتەنها نامە ئایینیەکان باسیان کردبێ، بەڵکو باسی ئەو لافاوەی کاتی نوح زانایانی تر دەستیان کەوتووە لەتەختەکانی ( الألواح ) بابل وئاشوریەکان کەئەوانیش باسی لافاوی کاتی نوحیان کردوە ( ۲۱۰۰ ) دووهەزارو سەد ساڵ بەرلەدایك بوونی عیسا، زانایان گومانیان نیە کە گەلانی ڕابووردوویش وێنەی گەلانی هیندوستان و یۆنان وچین و بەرازیل وجگەی ئەوانیش باسی ئەو لافاوەیان کردوە هەرچەندە جۆرە جیاوازیش لەنێوان باسەکاندا هەیە، بەڵام لەناوەڕۆکدا هەمویان وەك یەکن، ئەبێ بزانین باسی ئەو لافاوە بۆ تەمی کردنی ئادەمیزادە لەسەر ستەم کردن .

وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۚ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ يَا قَوْمِ لَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى الَّذِي فَطَرَنِي ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٥١﴾ وَيَا قَوْمِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا مُجْرِمِينَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا يَا هُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِي آلِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٥٣﴾ إِن نَّقُولُ إِلَّا اعْتَرَاكَ بَعْضُ آلِهَتِنَا بِسُوءٍ ۗ قَالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ

وَٱشۡهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦۖ فَكِيدُونِي جَمِيعٗا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّي تَوَكَّلۡتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٦﴾

﴿ وَإِلى عادٍ أخاهُمْ هُوداً قاالَ ياقَوْمِ اعْبُدُوا اللهَ ﴾ وەئێمە رەوانەمان کرد بـۆلای گـەلی عاد هودی برای پشتی و نیشتمانی خۆیان ووتی : ئەی خزمـانی خـۆم ئێـوە خـوا بەتەنـها بپەرستن . لـەباسی مانای ئایەتی (٢٦) ی سورەتی ئەلئەعرافدا باسی هود بەدرێژی کـراوە لەگەڵ جێگــەی گۆڕەکـەیدا، یەکـەمین کەسـە بـەزمانی عـەرەبی گفتوگـۆی کـردوە .. ئەوگەلـەی هود بت پەرست بوون، هود داوای لێکردن خوا بپەرستن ووتی :

﴿ مالَكُمْ مِنْ إلَهٍ غَيْرَهُ إنْ أنْتُمْ إلاّ المفترون ﴾ نیە بۆ ئێوە هیچ خوایــە شـایانی پەرسـتن بێت جگەی خوا مەگەر ئێوە تاقمێکی درۆزن و بوختــان چـین . بەدڵسـۆز یـەوە بـەوانی ووت :

﴿ ياقَوْمِ لا أسْألُكُمْ عَلَيْهِ أجْراً ﴾ ئەی خزمانی خۆم :من داواناکەم لەئێوە هیچ کـرێ یە لـەسەر گەیاندنی پەیامی خوا ، بەڵام پێویستە هەموو پێغەمەرێ گەلی خـۆی ئاگاداربکـا کەهیچ شتێکی لـەجیهاندا ناوێ ، بۆ ئەوەی نەبێت بە جێگــەی گومـان ، نیـازی پـاك بـۆ دانیشتوان ڕون بکاتەوە .

﴿ إنَ اَجْري إلا عَلَى الَّـذِيْ فَطَرَنِـيْ اَفَـلا تَعْقَلُـونَ ﴾ کـرێو مـزەی مـن لـەسـەر هیـچ کەسێ‌نیە مەگەر لەسەر کەسێکی ئەوتۆیە بەتوواناى خۆی منی دروست کردووە لـەسـەر ئاینی پاکی خۆی و بێزارم لـەبت پەرستی .

ئایا ئێوە بۆ تێناگەن و ووردنابنەوە لەسەر بەسەرهاتی گەلی نـوح و تـەمێ خوارنـابن ؟ ئەو گەلەی هود پیشەیان کشت وکالّو دانەوێڵەچاندن بوو، پێویستیان بەدانەوێڵـەی زۆر هەبوو. کاتێ وەلاّمی هودیـان نەدایـەوە خـوا بـارانی لێ گرتـەوەو توشـی گرانـی بـون، ژنەکانیشیان منالّی نەئەبو، نەزۆکی تووشی ژنەکانیان بوو بۆیە هود فەرموی بەگەلەکەی.

﴿ وَيَاقَوْمِ إِسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَاراً ﴾ وەئەی خزمـانی من ئێوە داوای لێ خۆشبوون بکەن لەپەروەردگاری خۆتان لەپاشا ئێوە بگەڕێنەوە بـۆلای خواو لەگوناهەکانتان پەشیمان ببنەوە، نیازی خۆتان خاوێن بکەن، ئەگەر ئێوە ئەو کارانـە بکەن پەروەردگار ئەینێرێ و ئەیرێژی بەسەر ئێـوەدا بـارانی زۆر و بـەخورِ و پـەیتا پـەیتا لەکاتێکا پێویستیان بەباران هەبێ بۆ سەوزبونی دانەوێڵەکانتان .

﴿ وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَى قُوَّتِكُمْ وَلاَتَتَوَلَّوا مُجْرِمِينَ ﴾ وەخوا زۆر ئەکا بۆ ئێوە دووچەنانـەی ئەکاتەوە هێزێ تر لەگەڵ ئەو هێزە ئێسـتا ئێـوە هەتانـە یـانی بـەروبومی کشـتوکاڵتان و منالّتان دووپات ئەکاتەوە، ئێوە واز لـەو شـتە مـەهێنن مـن بـانگی ئێـوەی بـۆ ئەکـەم و بەردەوام مەبن لەسەر کردنی تاوانی خۆتان و گوناەکردن .

﴿ قَالُوا يَاهُودُ مَاجِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَانَحْنُ بِتَارِكِي آلِهَتِنَا عَنْ قَوْلِكَ ﴾ تاقمەکـەی هـود ووتیان: ئەی هـود: تـۆ بەبەڵگەیـەکی ڕون و ڕاسـتیەوە نـەهاتویی بـۆلای ئێمـە لەسـەر پێغەمەرایەتی خۆت هەتا ئێمە دوای تۆ بکەوین و، ئێمە بـە‌گفتوگۆی تـۆ واز لەپەرسـتنی خوا کانی خۆمان ناهێنین دوای خوایەکی تەنها بکەوین .

﴿ وَمَانَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴾ وەئێمە باوەڕ بەتۆ ناهێنین وەك ئەو کەسانەی پـەیڕەوی تـۆ یان کردوە ئێمە پەیڕەوی تۆ ناکەین، چونکە تۆ مرۆڤێکی وەك ئێمە شایستەی ئـەوە نیـت باوەڕ بەتۆ بکەین و داوی تۆ بکەوین .

﴿ إِنْ نَقُولُ إِلاَّعْتَرَاكَ بَعْضُ آلِهَتِنَا بِسُوءٍ ﴾ ئێمـە لـەبارەی تـۆوە هیـچ شـتێ نـالّێین مەگەرئەزانین هەندێ لەخواکانی ئێمە توشی تۆیان کردوە نەخۆشـەیکی خـراپ لەشـێتی وگێلی، چونکە تۆ جنێوت داوە بەو خوایانەی ئێمە .

﴿ قالَ إِنِي أُشْهِدُ اللهَ وَ اشْهَدوا أَنِـي بَـرِيءٌ مِمّـا تُشْـرِكُونَ مِـنْ دُونِـهِ ﴾ هـود ووتـی: بەڕاستی من خوا ئەکەم بەشایەت و ئێوەیش شـایەتی بـدەن بەڕاسـتی مـن بـێزارم و دورم لـەشتێ ئێوە ئەیکەن بەهاوبەش بۆ خوا لـەجگەی خوا .

﴿ فَكَيْدني جِمِيْعاً ثمّ لتَنْتَظِرُونَ ﴾ دوایی ئێوەو خواکانتان بەهەموتانـەوە فێڵـی خۆتـان بەکاربهێنن بۆ من و چیتان لـەلایە بەکاری بهێنن بۆ لـەناوبردنی مـن لـەپاشا مۆڵـەتی مـن مەدەن و من دوا مەخەن .

﴿ إنّي تَوَكَلْتُ عَلَى اللهِ رَبّي وَرَبّكُمْ وَما مِنْ دابّةٍ إلا هُـوَ آخـذٌ بَناصيتـها إنَّ رَبّـي عَلَـى صِراطٍ مَسْتَقِيْمٍ ﴾ بەڕاستی من ئیشی خۆمم هەواڵـەی لای خوام کردوە پەروەردگاری من و پەرورەدگاری ئێوە، هیچ شتێ نیە لـەگیانداران بڕوا بەسەر زەویدا مەگەر خـوا بەتەنـها خاوەنیەتی بەهەمو جۆرێ و بەئارەزووی خۆی هـەڵی ئەسوڕێنێ وڕامیـان ئـەکا لـەسـەر کارێ بیەوێ، هیچ کەسێ خاوەنی قازانج نیە نەبۆ خۆیی و نەبۆجگـەی خـۆی. بەڕاسـتی پەروەردگاری من لـەسەر ڕێگەی ڕاست و دادپەروەریە، هەرکەسێ پەنای بـۆ ببا پـەنای ئەدا .

فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقَدْ أَبْلَغْتُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦٓ إِلَيْكُمْ ۚ وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّى قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴿٥٧﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ عَادٌ ۖ جَحَدُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْاْ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٥٩﴾ وَأُتْبِعُواْ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ عَادًا كَفَرُواْ رَبَّهُمْ ۗ أَلَا

﴿ بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ ﴿٦٠﴾

﴿ فَإِنْ تَوَلَّوا فَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ ماأُرْسِلْتُ بِهِ إِلَيْكُمْ ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە وازبهێنن لەباوەڕهێنانو پشت بکەنە پەیامی خوا، دوای بەڕاستی من ڕام گەیاندوە بە ئێوە شتێ من نێرراوم لەلایەن خواوە بەو شتەوە بهێنم بۆ لای ئێوە و پێتانڕاگەیەنم .

﴿ وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّي قَوْماً غَيْرَكُمْ وَلاتُضِرُّونَهُ شَيْئاً ﴾ وەپەروەردگاری من دائەنێ لەجێگەی ئێوە گەلێکی تر جگەی ئێوە، دارایی و سامانی ئێوە بەوان ئەبەخشێ، کۆمەڵێك ئەبن چاکتر لەئێوە و دروستیان ئەکاو، ئێوە هیچ زیانێ بەپەروەردگاری من ناگەیەنن بەهۆی وازهێنانیان لەپەیامی خواو باوەڕهێنان بەخوا .

﴿ إِنَّ رَبِّيْ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَفِيْظٌ ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری من ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکا و بەنیازی هەمویان ئەزانێ، کردەوەی ئێوە لەوپەنهان نیەو بێئاگانیە لەپاداشت دانەوەتان .

﴿ وَلَمّا جاءَ أَمْرُونا نَجَّيْنا هُوداً وَّالَّذِيْنَ آمَنُوامَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنّا ﴾ وەکاتێ فەرمانی ئێمە چوو بۆ لای سزادانی گەلی عاد و بۆ بنەبڕ کردنیان، ئێمە هودو کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێنابوو لەگەڵیا ڕزگارمان کردن بەهۆی بەخشندەیی و بەزەیی لەلایەن ئێمەوە بۆ ڕزگارکردنی ئەوان لەسزای جیهان .

﴿ وَنَجَّيْناهُمْ مِنْ عَذابٍ غَلِيْظٍ وتِلْكَ عادٌ جَحَدُوا بِآياتِ رَبِّهِمْ ﴾ وەئێمە باوەڕدارانمان لەگەلی عاد ڕزگارکرد لەسزایەکی زۆر قورس وگران لەڕۆژی دواییدا و، ئەو هۆزەی عادبون باوەڕیان بەنیشانە ڕوونەکانی پەروەردگاری خۆیان نەهێنابوو، هودیان بەدرۆ خستەوە کە ئێستا گۆڕەکانیان نیشانەیان دیارە لەچۆڵایی ئەحقافدا .

﴿ وَعَصَوا رُسُلَهِ وَاتَّبَعُوا أَمْرَ كُلِّ جَبارٍ عَنِيْدٍ وَأتبَعُوا فِي هذِهِ الدُّنْيا لَعْنَةً وَيَوْمَ القِيامَةِ ﴾ وەگەلی عاد بێفەرمانی پێغەمەرەکانی پەرورەدگاری خۆیان کردبوو، پەیرەوی فەرمان و کاری هەمو زۆر دارێکی یاخیان ئەکرد گوی یان لەڕاستی نەئەگرت و، لەم جیهانەدا

ولەڕۆژی دواییدا دوای شتیٚ کەوتبون کە هۆی لەناوبردنیان و بیٚ بەشبوون لەبەزەیی خوا لەهەردوو لایانا.

﴿ إلا اِنَّ عاداً كَفَرُوا رَبَّهُمْ ألا بُعْداً لِعادٍ قَوْمِ هُودٍ ﴾ ئێوە ئاگـاداربن وبزانن بەڕاستی گەلی عاد باوەڕیان بەپەروەردگاری خۆیان نەهێنابو بۆیە تووشی سزای خوابون، ئاگاداربن و بزانن دورن بەدوربونی تەواو لەبەزەیی خوا گەلی عادی تاقمی هود.

وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾ قَالُوا۟ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآۖ أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَءَاتَىٰنِى مِنْهُ رَحْمَةً فَمَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥۖ فَمَا تَزِيدُونَنِى غَيْرَ تَخْسِيرٍ ﴿٦٣﴾

﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ اَخاهُمْ صالِحاً قالَ ياقَوْمَ أعْبُدوا اللهَ ﴾ وەئێمە ڕەوانەمان کردبوو بـۆلای سەمودی دانیشتوانی حیجر برایٚ پشتی خۆیان نەك برای ئایینی سالّح ووتی: ئەی خزمانی خۆم ئێوە خوا بپەرستن و بەتەنهای دابنێن .

﴿ مالَكُمْ مِنْ إلَهٍ غَيْرُهُ هو أنْشَأَكُمْ مِنَ الأرْضِ وَاْستَعْمَرَكُمْ ﴾ وەبۆ ئێوە نیە هیچ خوایـە شایانی پەرستن بێ جگەی خوایە تاك وتەنهابێ، خوا ئێوەی دروسـت كـردوە لـەزەوی و لـەو ئادەمەی لەزەوی دروست كراوە. بەتايبەتی لـەو تۆوەی ئێوەی لێ‌پەیدا ئەبێ، هـەموو بونەوەرێ لـەئادەمیزاد و لـەئاژاڵ و درەخت و گژوگیایا ڕاستەو خۆیان بەهۆی شتێ تـرەوە لـەزەوی دروست كراون و تەمەنیشـی پێ‌بەخشـیون و، داوای كـردووە لـەئێوە تەمـەنی خۆتان بەسەر ببەن لـەزەویدا و ئاوەدانی بكەنەوەو تەمـەن درێـژی بـەئێوە بەخشـیوەو بـۆ ماوەیە لـەزەویدا دانیشن و دوایی بەجێی بهێڵن بۆ تاقمێ تر، بۆیە:

گێڕراوەتەوە پاشایانی فارس ڕوباری زۆرِیان هەڵكـەند و درەختـی زۆریـان ناشـت و تەمەنی زۆریان پێ درابوو كەچی ستەمكاربون، بۆ ئـەو مەبەسـتە پرسـیاریان لـەپێغەمـەرێ كردلـەوكاتەدا لـەوبارەیەوە، خوا سروشی بۆ نارد، ئەوان زەوی ئاوەدان ئەكەنەوەو دوایی بەندەكانی تر لـەوێدا ئەژین بەخۆشی .

﴿ فَاْستَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إلَيْهِ إنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ ﴾ دوایی ئێوەی گـەلی سـەمود داوای لێ‌خۆشبوون بكەن لـەخوا لـەبۆ گوناهەكانتان، لـەپاشا ئێوە بگەڕێنـەوە بـۆلای و پەشـیمان بینەوە، بەڕاستی پەروەردگاری من زۆر نزیكە لـەوكەسـانەی بـە ئومێـدی لێ خۆشـبوونی خوان، وەلاٌمی ئە وكەسانە ئەداتەوە لـەخوا ئەپاڕێنەوە .

﴿ قالُوا ياصـالِحَ قَـدْ كُنْـتَ فِيْنـا مَرجُـوا قَبْـلَ هـذا ﴾ خزمـانی صـالح ووتیـان: ئـەی صالح:بەڕاستی جێگەی ئومێدبووی لـەنێو ئێمەدا بەرلـەوەی تـۆ ئـەم كـارە بلاٌوبكەیتـەوەو بتەوێ ببی بەپاشای ئێمەو پرس پێ‌كراوی ئێمە .

﴿ اتَنْهانا أنْ نَعْبُدُ مايَعْبُدُوا آبأؤُنا ﴾ ئایا تۆ ئەتەوێ قەدەغەی بكـەی لـەئێمـە كـە ئێمـە بپەرستین شتی باوباپیرانی ئێمە ئەو شتەیان پەرستوە پشت لـەدووای پشـت ، چـۆن ئێمـە ووەلاٌمی تۆ ئەدەینەوە .

﴿ وَإنّنا لَفِي شَكٍ مِمّا تَدْعُونا إلَيْهِ مُرِيبٍ ﴾ وەبەڕاسـتی ئـەو شـتەی تـۆ ئـەیلێی ئێمـە ئەخاتە گومان وئازاری دەرون و گومانەكەی ئاشكرایە .

﴿ قَالَ يَاقَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كُنْتُمْ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي وَآتَانِي مِنْهُ رَحْمَةً ﴾ سالْح فەرموی : ئەی خزمانی من : ئایا ئێوە هەواڵ ئەدەن بەم ئەگەر من لەسەر بەڵگەی ڕون و ڕاستبم لەلایەن پەروەردگاری خۆمەوەو خوا دابێتی بەمن میهرەبانی وپێغەمەرایەتی لەلایەن خۆیەوەو فەرمانی پێ‌دابم بانگی ئێوە بکەم بۆلای پەرستنی خوا یەکی تەنها .

﴿ فَمَنْ يَنْصُرُنِي مِنَ اللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُ فَمَا تَزِيدُونَنِي غَيْرَ تَخْسِيرٍ ﴾ دوایی چ کەسێکە یاریدەی من بداو فریام بکەوێ ئەگەر من بێ فەرمانی خوابکەم لەبەر دڵی ئێوەو پەیامی خوا ڕانەگەیەنم ، دوایی پەیڕەوی‌کردنی ئێوە هیچ شتێ بۆ من پەیداناکا جگەلەوەی زیان لەخۆم بدەم بە پوچ کردنەوەی شتێ خوا بەخشیویەمە بەمن و خۆم پیشانی سزای بدەم بەهۆی ئەو شتەی ئێوە داوای ئەکەن .

وَيَٰقَوْمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ قَرِيبٌ ﴿٦٤﴾ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُوا۟ فِى دَارِكُمْ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ ﴿٦٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَٰلِحًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَمِنْ خِزْىِ يَوْمِئِذٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَا۟ كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ أَلَا بُعْدًا لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾

﴿ ویاقَوْمِ هذهِ ناقَةُ اللهِ لَكم أيةً ﴾ وەئەی خزمانی من: ئەمە هوشـتریکە دروستکراوی خوایە لەسەر شێوەی جگەی هوشترانی تـر دروسـت کـراوە بـۆ ئێـوەی تێدایـە بەڵگـەو نیشانەی رون و کاری پەکخەر .دروست کردنی ئـەو هوشـترە لـەوەوەهاتوە گەلەکـەی داوایان کرد لە ساڵح کە لەو بەردە هوشترێ بێتە دەرەوە، سـاڵح داوای کـرد لـەخواو خوایش مەبەستەکەی هێنایەدی .

﴿ فَذَرُوها تأكُلُ فِي أرْضِ اللهِ وَلا تَمَسُّوها بِسُوءٍ فَيأخُذَكُمْ عَذابٌ قَرِيـبٌ ﴾ دوایـی واز لەوهوشترە بهێنن بابۆخۆی بخواو بلەوەڕێ لەگژوگیای زەوی و بخواتـەوە ئـاوی زەوی و، ئێوە ئازاری مەدەن و زیانێ بەئێوە ناگەیەنێ و بابۆخۆی بلـەوەڕێ وئێـوە هیـچ خراپـە و ئاازرێ بەو هوشترە مەگەیەنن لەکوشتن و جگەی کوشتن ، دوایی ئێوە تووشی سـزایەکی زۆر نزیك و کوتوپڕ ئەکا .

﴿ فَعَقَرُوها فَقالَ تَمَتَّعُـوا فِـي دارِكُـمْ ثَلاثَـةَ أيـامٍ ﴾ دوایـی گەلەکـەی هوشـترەکەیان سەربڕی ، دوایی ساڵح فەرموی: ڕابوێرن وبژین لەخانوەکانی خۆتانـا مـاوەی سـێ ڕۆژ لەدواییدا ئێوە لەناوئەچن .

﴿ ذَلِكَ وَعْدٌ غَيْرَ مَكْذُوبٍ ﴾ ئەوسزایەی ئەوتۆ خوا بەڵێنی پێ داوەو دووای سێ ڕۆژ دێت بۆ لاتان و درۆی تێدانابێ و ناگەڕێنەوە .

﴿ فَلَّماجاءَ أمْرُنا نَجَّيْنا صالِحاً وَّ الَّذِيْنَ آمَنُـوا مَعَـهُ بِرَحْـمَةٍ مِنّـا ﴾ دوایـی کـاتێ هـات فەرمانی ئێمە بۆ سزادانی ئەو کەسانە ویستمان لەناویان ببەین، ئێمە سـاڵح و کەسـانێکی ئەوتۆ باوەڕیـان هێنـابو لەگـەڵیانا ڕزگارمـان کـردن بـەهۆی میـهرەبانی و بەخشـندەیی خۆمانەوە لەجیهاندا .

﴿ وَمَنْ خِزْيِ يَوْمَئِذٍ إنَّ رَبَّكَ هُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيْزُ ﴾ وەرڕزگارمـان کـردن لـەئابڕوچوون ولەڕسـوایی هـەردوو جیـهان و لەجیـهاندا لەناونـەچوون و لەپاشەڕۆژیشـدا سـزای گـەورەتریان نـادرێ بەڕاستی پـەروەردگاری تـۆ زۆر بەتوانایـە و زۆر بەدەسـەڵاتە بـۆ ڕزگاررکردنی دۆستانی خۆیی وبۆ لەناوبردنی دوژمنانی ئایین .

﴿ وَأَخَذَ الَّذِيْنَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دِيـارِهِمْ جاثِمِيْنَ ﴾ وەکەسـانێکی ئـەوتۆ ستەمیان لـەخۆیان کرد دەنگێکی زۆر سەخت و تیژگرتنی لـەلایـەن جبرەئیلـەوە ، دوایـی لـەنێو شارەکەیانا کەوتن بەدەما بەمردوویی .

﴿ كَأَنْ لَمْ يَغْنُوا فِيْها﴾ بەوێنەیـەکی وایـان لێ‌هـات کەهـەرگیز لـەو شـارەدا نـەبوین ومایەوە لـەوێدا نەبوین .

﴿ أَلا إِنَّ ثَمُودَ كَفَرُوا رَبَّهُمْ إِلا بُعْدًا لِثَمُودَ ﴾ ئێوە ئاگادارین وبزانـن بەڕاسـتی تـاقمی سەمود باوەڕیان بەپەروەردگاری خۆیان نەهێنا ،ئاگادارین دورن بەدوربون لـەبەزەیی خوا تاقمی سەمود .

لـەپاشا خوای مەزن باسی بەسەرهاتی ئیبراهیم و لـوت ئەکا و ئەفەرنوێ:

وَلَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَىٰ قَالُوا سَلَامًا ۖ قَالَ سَلَامٌ ۖ فَمَا لَبِثَ أَنْ جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا رَأَىٰ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۚ قَالُوا لَا تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾ وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِنْ وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتْ يَا وَيْلَتَىٰ أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِي شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوا أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ ۖ رَحْمَتُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ ۚ إِنَّهُ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ﴿٧٣﴾

﴿ ولَقَدْ جاءَ رُسُلُنا إبْراهِيْمَ بِالْبُشْرى ﴾ بەڕاستی چـون بـۆ لای ئیـبراهیم بـەموژدەدان کۆمەڵی نێراوەکانی ئێمە لـەفریشتەکان هەتا موژدەی خۆش بـدەن بـەئیبراهیم و ژنەکـەی کە خوای مەزن کوڕێکیان ئەداتیٚ کە ناوی بنێن ئیسحاق و دوایـی ئیسـحاق یـەعقوب . ئەوەی شایانی باسبیٚ ئەو فریشتانە لـەسیٚ کەمتر نەبوون .

﴿ قالُوا سَلاماً قالَ سلامٌ ﴾ لـەپێشەوە فریشتەکان بەئیبراهیمیان ووت: سـلاٚو وئاشـتی ئێمە لـە سەرتۆ بیٚ ئیبراهیم لـەوەلاٚمی فریشتەکاندا ووتی: ئاشتی و بیٚوەیی لـەسەر ئێوەبیٚ.

﴿ فَما لَبِثَ أنْ جاءَ بعجل حنين ﴾ دوایـی ئیـبراهیم نەوەسـتا و بەپەلـە بـۆ یـانی هێنـا گوێرەکەیـەکی بـرژاو بەگـەرمی کەخۆشـترین خواردەمـەنیبو کـەخوانیان ڕاخسـت و خواردەمەنیەکەیان دانا لـەسەری دەستیان بۆ نەبرد .

﴿ فَلَّما رَای أيدِيَهِمْ لا تَصِلُ إلَيْهِ نَكْرَهُمْ وَاَوْجَسَ مِنْهُمْ خَيفَةً ﴾ دوایی کـاتیٚ ئیـبراهیم بینی نێرراوەکانی دەست درێژ ناکەن بۆ لای خواردەمەنی گۆشـتی ئـەو گوێرەکەیـە ئـەو کارەی ئەوانی پیٚ ناخۆشبو کەنای خۆن، وە کەوتە ترس لـەوان کە ئازاری بدەن .

﴿ قالُوا لاتَخَفْ إنّا أرْسِلْنا إلى قَوْمِ لوطٍ ﴾ ووتیان تۆ مەترسە بەڕاستی نێرراوین بـۆ لای تاقمی لـوت کە بەفەرمانی خـوا سزایان بدەیـن بـەوجۆرەی فـەرمانمان پـیٚدراوە ،ئێمـە ئاازرمان بۆ تۆو تاقمی تۆ نابیٚ .

﴿ وَأمْرأتُهُ فائِمةٌ فَضَحَكَتْ فَبَشِّرْناها بِاسْحاقَ وَمَنْ وَراءَ إسْحاقَ يَعْقُوبَ ﴾ وەژنەکـەی ئیبراهیم وەساتبو لـەودیوی پەردەوە و گوێی گرتبو لــەگفتوگۆیان، دوای لـەنـەمانی تـرس لـەسەریان لـەخۆشیانا پیٚکەنی و لـەخۆشی بنەبڕکردنی ئەو گەلـە داوێـن پیسـەی لـوت . دوایی ئێمەی فریشتە موژدەمان دا بەژنەکەی ئیبراهیم بەوەی خوا کوڕی ئـەداتیٚ بـەناوی ئیسحاق و دووایی کوڕیٚ تری ئەداتیٚ بەناوی یەعقوب .

﴿ قالَتْ ياوَلْتاً ألَدُ وَأنا عَجُوزٌ وَهذا بعلي شَـيْخاً إنّ هـذا لَشَـيءٌ عَجِيْـبٌ ﴾ ژنەکـەی ئیبراهیم ووتی: ئەی هاوار بۆ من جیگەی سەرسوڕمانی منە، ئایا من چـۆن منـاڵـم ئـەبیٚ و من پیرەژنێکی نەزۆك و لـەو تەمەنەدام مناڵـم ببیٚ بەگوێرەی ئاسایی و ئەوەش مێردەکەمـە

لەتەمەندا گەیشتوەتەکاتێ پیری ولـەپیاوەتی کـەوتوە، زانایـان ئـەڵێن: تەمـەنی ئیـبراهیم (١٢٠) ساڵ بو تەمـەنی خـاتون سـارای ژنـی (٩٠) سـاڵ .بۆیـە ووتـی: بەڕاسـتی ئـەو مۆژدەدانە لـەبارەی مناڵ بوونی منەوە شتێکی سەر سوڕێنەرە بەگوێرەی سروشت .

﴿ قالُوا أتَعْجِبْنَ مِنْ أمْرِ اللهِ ﴾ فریشتەکان ووتیان بەخاتوون سارای ژنی ئیـبراهیم: ئایـا تۆ سەرت سوڕئەمێنێ لـەکارو فرمانی خوا، خـوا ویسـتی هەرشـتێ بکـا ئەفـەرموێ: ببـە ئەوشتە ببە کوتوپڕ ئەبێ .

﴿ رَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ عَلَيْكُمْ أهْلَ الْبَيْتِ إنَّهُ حَمِيْدٌ مَجِيْدٌ ﴾ میهەبانی وبەخشندەیی خواو پیت و پیرۆزی لـەسەر ئێوە بێ ئەی خانەدانی پێغەمەر، بەشتان لـەپیاوچاکان نـەبڕێ هـەتا ڕۆژی دوایی، خۆیشتان خاوەنی پیت و پیرۆزی و نەوەی زۆربن، هـەروایش بـوو خـوای گەورە نەوەی زۆری پێ بەخشین و زۆریان کران بەپێغەمـەر و ئیـبراهیم بـەئاگر نەسـوتا، لـەنەوەی ئیبراهیم گەورەترینی هەمو بونەوەران خوای مەزن دروستی کرد کە موحەمەدی کوڕی عەبدولاّیـە. بەڕاسـتی خـوا خـاوەنی هـەمو چاکەیـە و شـایانی هـەمو سوپاسێکە لـەئەنجامی ئـەوەدا چاکـەی زۆری بـێ ژمـارەی بەخشیوە بەبـەندەکانی خۆی، خـاوەنی گەورەیی و سەخاوەتە. کەواتە جێگەی سەرسوڕمان نیە کە خوا چاکە بدا بەهەمو کەسێ و داوای بکا لـەخوا و بزانن بەو چاکەیە .

فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾

﴿ فَلَما ذَهَبَ عَنْ إبْراهِيْـمَ الـرَّوعُ ﴾ دوایـی کـاتیَ ڕۆیشـت و لاچـو تـرس لـەلایـەن ئیبراهیمەوە لـەبارەی نەخواردنی گۆشتی گوێرەکەکەوە مێوانەکانی ناسی و زانـی ئیشـیان چیە .

﴿ وَجاءَتْهُ الْبُشرى ﴾ وەچو بۆلای ئیبراهیم مـوژدەدان بـەکوڕ و کوڕەزایـە و خـاتون سارای ژنیشی دلّشادبوو بەو موژدەیە. بەلاّم ئەوەبو بە سزادانی گەلی لوت دلّ گرانبون.

﴿ يَجادِلُنا فِيْ قَوْمِ لُوطٍ ﴾ ئیبراهیم دەستی کرد بەگفتو گۆکردن لـەگـەلّ نوێنـەرەکانی ئێمە لـەبارەی سزادانی تاقمی لوتەوە .زانایان ئەلّێن: چۆن ئیبراهیم توانی ئەو گفتوگۆیـە لـەگەلّ پەروەردگاری خۆی بکا ؟

لـەوەلاّمدا زۆربەی زانایان و پێشەوای ڕازی و خاوەنی تەفسیری مەنارو ووتویانە: ئـەو گفتوگۆیە لـەبەرتاقمیَ نەبوە بەلّکو لـەبەرلوت بوەو ترسـاوە لـەگـەلّ تاقمەکـەیدا تووشـی سزا ببیَ .

هەندیَ تر لـەزانایان ئەلّێن: هیچ جیاوازیە نیە لـەنێوان گفتوگۆکردن لـەبارەی لـوتـەوەو لـەنێوان تاقمی لـوت. بەلاّم لـەبەرئەوەبو هەتا بەتەواوی بڕوا پەیدا بکـا لــەوکارە خراپـەی ئەوان کەبەجۆرێکە ئومێدی چـاك بوونیـان لیَنـاکریَ .لـەبەرئەویشـە بەڕاسـتی گفتوگـۆ کردن لـەگەلّ خوادا بۆ لابردنی سـزا یادوورکـەوتنی گونـاهو بـیَ فـەرمانی نیـە، بـەلّکو پێچەوانەکەی ڕاستە، ئەو داوایەش دلّ نەرمی وبەزەیی ئەبەخشیَ، بۆیە خوا باسی ئیـبراهیم ئەکا بەچاکەو ئەفەرمویَ:

﴿ إنَّ إبْراهِيْمَ لَحَلِيْمٌ أواهُ مِنيبٌ ﴾ بەڕاستی ئیبراهیم مرۆڤێك بـوە پەلـەی نـەکردووە تۆلّەبسێنیَ لـەکەسیَ خراپەی لـەگەلّ بکا، خەفەتی زۆری ئەخوارد بۆ ئادەمیزاد بیَ فەرمانی خوا بکەن، ڕوی بۆلای خوا ئەکرد بەتەنها .

﴿ ياإبْراهِيْمُ أعْرِضْ عَنْ هَذا ﴾ .فریشتەکان ووتیان: ئەی ئیبراهیم: تـۆ واز بهێنـە لـەو گفتوگۆیە، داوای هیچ شتیَ مەکە لــەبارەی سـزادانی گـەلی لوتـەوە و بـەزەییت بـەوانا نەیەتەوە. ئێمە فەرمانمان پیَدراوە .

﴿ إِنَّهُ قَدْجاءَ أَمْرُ رَبِّكَ ﴾ بەڕاستی فـەرمانی خـوای پـەروەردگاری تـۆ هـاتوە بـۆلای لەناوبردنی گەلی لوت، داواو پاڕانەوەی تۆ بۆ ئەو سـزایە ناگەڕێنێتـەوە، چونکـە ئـەوان بەردەوامن لەسەرکردەوەی خراپی خۆیان .

﴿ وَإِنَهُمْ آتِيهِمْ عَذابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴾ وەبەڕاسـتی دێـت بـۆلای ئـەو گەلـە سـزایەکی نەگەڕاوە ، پاڕانەوەی تۆو جگەی پاڕانەوە بێسودە.

لەپاشا خوای مەزن هەواڵ ئەدا بەچونی فریشتەکان بۆلای‌ی لـوت، پـاش ڕۆیشـتنیان لەلای ئیبراهیم، باسی ئەو شـتانەیش ئەفـەرموێ لـەنێوان لـوت و فریشـتەکاندا ئـەڕواو ئەبێژرێ وئەفەرموێ :

وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴿٧٧﴾ وَجَاءَهُ قَوْمُهُ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِن قَبْلُ كَانُوا يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ ۚ قَالَ يَا قَوْمِ هَٰؤُلَاءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ ۖ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِي ضَيْفِي ۖ أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ ﴿٧٨﴾ قَالُوا لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ ﴿٧٩﴾ قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ ﴿٨٠﴾

﴿ وَلَمّا جاءَتْ رُسُلُنا لُوطاً سِيءَ بِهِمْ وَضاقَ بِهِمْ ذِرْعاً ﴾ وەکـاتێ نێرراوەکـانی ئێمـە چون بۆ لای لوت کەوتە نێو خەفەتەوە بەبۆنەی هاتنی نێرراوەکانەوەو ئازاری پێگەیشت

و، دڵی بەهاتنی ئەوان تەنگبو بەجۆرێ گرانبو هەڵگرتنی ئــەو خەفەتـەو توانـای نـەمابو.

لـەباسی ئایــەتی (٨٠) ی سـورەتی ئەلئـەعرافدا باسـی ئـەوەمان کـرد کـەلوت بـرازای ئیبراهیمە ودانیشتوی ڕۆژهەڵاتی ئەردەن بوە .

ئەو گەلـەی لوت یەکەمین نەتەوە بـوون چونەتـە لای پیـاوان بـۆ کردنـی ئـەو کـارە خراپەی لـەجگەی ژنان، ئەوکارە خراپەیان ئەکرد لـەگەڵ پیاوان بەئاشـکرایی، هەرکەسـێ وەڵامی نەدانایەوە بەزۆر خوسیان ئەداو سواری ئەبون بـا میوانیـش بوایـە زۆریـش بـەڕێز بوایە .

هەرلـەبەرکردنی ئەو کارە خراپە و ناڕەوایە کاتێ فریشتەکان چون بۆلای لوت لـەسەر شێوەی لاوانی جواندا لـوت ترسـا گەلەکـەی دەسـت درێـژی بکەنەسـەریان و نـەتوانێ بیانپارێزێ بۆیە زۆر دڵی تەنگبو .

﴿ وَقالَ هَٰذا يَومٌ عَصِيبٌ ﴾ وەلـوت فەرموی: ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر سەخت و گرانـە لای من بەجۆرێکە لەتوانای هیچ کەسێکدا نیە بەرگەی ئەوکارە بگرێ .

﴿ وَجاءَهُ قَوْمُهُ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ ﴾ وەتاقمەکەی لوت چون بۆلای خانوەکـەی لـوت زۆر بەگورجی ڕایان کرد و پەلەیان ئەکرد بگەنەلای خانوەکەی بۆ کردنی ئەوکارە ناهەموارە لـە دڵیانابو، وایان ئەزانی ئەم جارەیش وەك جارانی پێشوەو کەس نیە بەرەنگاریان بکا.

﴿ وَمِـنْ قَبْـلُ كـانُوا يَعْمَلُـونَ الْسَـيِّئاتِ ﴾ وەلـەپێش هـاتنی ئـەو فریشـتانە ئەوگەلـە ئەوکارەخراپ و بێزلێکراوانەیان ئەکرد و ئەم جارەیش وایان ئەزانی ئە وفریشـتانە منـاڵی جووانن، هیچ نرخێکیان بۆ پاشەڕۆژ دانەنا .

﴿ قالَ ياقَوْمِ هَؤُلاءِ بناتي هَنَّ أَطْـهَرُ لَكُـمْ ﴾ لـوت فـەرموی: ئـەی تاقمەکـەی خـۆم: ئائەوانە کچەکانی منن ئێوە ئەمانەتان بوێ ئەمانە پاکترن بۆ ئێوە لـەپیاوان و مارەیان بکـەن و بیان کەن بەژنی خۆتان، مەبەستی لوت لـەوکچانــە کچـانی گەلەکـەی بـون، چونکـە هەمو پێغەمەرێ بەرامبەر بەگەلی خۆی وەك باوکیان وایە هــەمویان وێنـەی کـوڕو کچـی ئەون، ئەو کاتە دروست بووە ژن مارەبکرێ لـەبێباوەڕان.

﴿ فَاتَّقُوا اللهَ وَلاتَخْزُونَ فِي ضَيْفِي ﴾ دوایی ئێوە لەخوا بترسن وکاری قێزەون مەکەن و ئێوە من شەرمەزار و ڕسوا مەکەن لەبارەی میوانەکانمەوە، دەستی ناپاکیان بۆ درێژ مەکەن وڕێزیان لێبگرن .

﴿ أَلَيْسَ فِيْكُمْ رَجُلٌ رَشِيْدٌ ﴾ ئایا بۆ نیە لەنێو ئێوەدا پیاوێکی ژیر و شارەزا ڕاغویتان بکا بۆلای ڕاستی و بتان گێڕێتەوە لەکردەوەی قێزەون .

﴿ قَالُوا لقد عَلِمْتَ مالَنا فِي بَناتِكَ مِنْ حَقٍ وَ إِنَّكَ لَتَعْلَمُ مائُرِيْدُ ﴾ تاقمی نوح ووتیان بەڕاستی تۆ زانیوتە ئێمە هیچ پێویستێکمان بەکچەکانی تۆ نیە، مارەبڕین و چونە لای ژنان ڕێگەو ڕچەی ئێمە نیە و چونە لای پیاوان ڕێگەی ئێمەیە و، بەڕاستی تۆ ئەزانی ئێمە چ شتێکمان پێویستە، ئیتر گفتوگۆی تۆ نرخی نیە لای ئێمە .

بۆ زانین: مرۆڤ کەڕێگەی بۆ بەرەڵلاّ کرا لەویژدانی خۆیشیانا لەهیچ کەسێ نەترسان و خۆی بەئایین و مرۆڤایەتیەوە نەبەست شەرمی نامێنێ و خاوەن هیچ ڕەوشتێکی چاك نابێ. کەواتە ئارەزووی هەرشتێ بکا ئەیکا، وێنەی گەلی لوت لەم سەردەمەی ئێمەدا یەك جار زۆرە، بێگومان خوای گەورە هەتا ماوەیە مۆڵەتیان ئەدا، دوربێ یانزیك بەتۆڵەو پاداشتی کردەوەی خۆیانیان ئەگەیەنێ، بەتایەبتی کاربەدەستانی ئە مسەردەمە بەرپرسیارن یاسای خوا نابەزێنن . لوت کەبۆی دەرکەوت ئامۆژگاری کردن سودێ بەوگەلە ناگەیەنێ ڕوی کرد بۆلای میوانەکانی .

﴿ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً ﴾ لوت فەرموی بەمیوانەکانی: بەڕاستی ئەگەر بۆم هەبوایە هێزێك بەرانبەر بەم گەلە ئەم خستە کار بۆ پاراستنی ئێوە لەوان .

﴿ أَوْ آوِي إِلى رُكْنٍ شَدِيْدٍ ﴾ یا پەنام ئەبرد بۆلای گۆشەیەکی سەخت لەپیاوانی بەهێز و ئازا لەهەر هۆزێ بوایە و ئەچومە لایان بۆ پاراستنی خۆم وبۆ پاراستنی ئێوە، بەلاّم ئێوە ئەزانن کەمن بەم شێوەیەم ئێوە ئەم بینن وئێوەش ژمارەتان کەمە هەتا یاریدەم بدەن، دۆست و کەس وکاریشم کەمەلەسەرمان هەڵبدەنێ. کەواتە داوای لێبوردن دەکەم .

کاتێ فریشتەکان ناخۆشی و خەفەتیان لەلوتەوە بینی کاتی ئەوەهات ئەو مەبەستە نهێنیە بۆی ڕەوانەکراون دەری برن، موژدەیان بەلوت دا بەم چوار مەژدەیە: (١) ئەوان

نێرراوی خـوان. (٢) بێبـاوەڕان بـەئاواتی پیسـی خۆیـان ناگـەن. (٣) خـوا ئـەو گەلـە بنەبڕئەکا. (٤) خوای مەزن خۆت و خێزانەکانت ڕزگار ئەکا، وەك ئەفەرموێ:

قَالُواْ يَـٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيْكَ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمْ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ﴿٨١﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَـٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِىَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾

﴿ قالُوا يالُوطُ إنّا رُسُلُ رَبّكَ ﴾ نێرراوەکانی خوا ووتیان: ئەی لـوت: بـەڕاستی ئێمـە نێرراوی پەروەردگاری تۆین، بۆ سزادانی ئەوان هـاتووین، دڵـت بـەهێز بـێ و ئێمـە بـۆ ڕزگارکردنی خۆت و خێزانەکەت هاتووین .

﴿ لَنْ يَصِلُوا إلَيْكَ ﴾ ئەو تاقمە ناگەنە لای تۆ بەجۆرێ بتوانن ئازاری تۆ بدەن، خـۆت بگرە و لـەئێمە مەترسە و قاپی خانوەکەی خۆتانیان بۆ بکـەرەوە، دوایـی هاتنـە ژوورەوەو چاویان نەی ئەبینی، وێنەی کوێر چوونە دەرەوە و هاواریان ئەکرد و ئەیان ووت: خۆتـان ڕزگاربکەن. بەڕاستی جادوگەران لەخانوی لوتان .

﴿ فَأسْرِ بِأَهْلِكَ بِقَطعٍ مِنْ الّيلِ وَلا يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أحَـدٌ ﴾ دوایـی تـۆ لـەم شارە بچـۆرە دەرەوە بەخۆت وخێزانتەوە بەبەشێك لـەشەودا وە ڕۆژ نەبێتەوەو، هیچ یەکێ لـەئێوە ئـاوڕ

بۆ پاشەوەی خۆی نەداتـەوەو نـەنوارێ بـۆ دووای خـۆی. هیـچ کەسـێ لـەخێزانـەکانت بەجێمەیڵە .

﴿ إلا أمرَأتَكَ إنَّهُ مُصِيْبُها ما أصابَهُمْ ﴾ مەگەر ژنەکەی تۆ نەبێ، بەڕاسـتی توشـی ئـەو ژنە ئەبێ ئەو شتەی توشی ئەو گەلـە ئەبێ و ئەویش وەك بێباوەڕانی تر لـەناو ئەچێ. لـوت بەدڵ تەنگیەکەوە فەرموی: چ کاتێ لـەناوئەچن، نێرراوەکانی ووتیان:

﴿ إنَّ مَوْعَدَهُمْ الصُبْحُ أَلَيْسَ الصُّبَـحُ بقَرِيْـبٌ ﴾ بەڕاسـتی کـاتی سـزادانی ئـەو گەلـە دەست پێدەکات لـەسەرەتای بەیانیەوە، ئایا کاتی بەیانی نزیك نیە. بەڵێ: زۆر نزیکە، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿فَلَمّا جاءَ أمْرُنا جَعَلْنا عَلَيَها سـافِلِها ﴾ دوای بـەیانی کـاتێ هـات فـەرمانی ئێمـە بـۆ سزادانیان لـەکاتی دیاری کراودا و بنـەبڕیان بکـەین ئێمـە سـەرووەی شـارەکەمان خسـتە ژێرەوەی و ژێراو ژوورمان کردن، هەموو دانیشتوانی لـەناو چون .

﴿ وَ أمطرنا عَلَيْها حِجارةً مِـنَ سَـجِيلٍ مَنْضُـودٍ ﴾ وەئێمـە ڕژاندمـان بەسـەریا پارچـە پارچەی ئەو شارەدا وبەسەر ئەوانە یانا چوبونە دەرەوە بۆ کـاروان بـەردی ڕەق لـەگڵی سۆرکراوەی وێنەی خشتی سوور یەك لەدوای یەك و بەبێ ووچان ئەڕژا بەسەریانا .

﴿ مُسَـوَّمةٍ عِنْـدَ رَبّـكَ ﴾ ئـەو بەردانـە دیـاری کرابـون و نیشـانە کرابـون لـەلایـەن پەروەردگاری تۆو بەنیشانەیەکی دیاری کراو و تایبەتی کەهەرەیکەیان جێگەیەکی تایبەتی بۆ دیاری کرابو کە لـەو جێگەیەدا. خوای مەزن بت پەرستانی مەکـە هۆشـیار ئەکاتـەوە کە دوور نیـە بەڕاسـتی ئـەوەی تووشـی گـەلی لـوت بـوە توشـی ئـەوانیش ببـێ ، وەك ئەفەرموێ:

﴿ وَماهِيَ لِلْظّالِمِيْنَ بِبَعِيْدٍ ﴾ وەها تنە خوارەوەی وێنەی ئەو بـەردە دورنیـە بـۆ سـتەم کارانی مەکەیش بێتە خوارەوە .

بۆ زانین: هەموو ستەمکارانی ئـەم ڕۆژە لـەڕووی هـەمو زەویـدا نیشـانەن بـۆ هاتنـە خوارەوەی سزا لـەئاسمانەوە، باستەم لێکراوان ڕاپەڕن و خوایش یاریدەیان دەدا کۆشـك و تەلاریان ژێراو ژوور بکەن بەوێنەی گەلی لووتیان پێبێ .

بەڕاستی خـوای مـەزن کـاتێ ویستی سـزا گـەلی لـوت بـدا فـەرمانیدا کـەزەوی بومەلەرزەیەکی زۆر بـەهێز و ناهـەمواری لێپـەیدا ببـێ. بـەڵێ: ئـەوەبو چیایـەکی ئـاگر لەزەویدا تەقیەوە، شارەکەی لەبنج دەرهێنا، سەرەوەو خوارەوی بەدانیشتوان و کۆشك و تەلاریانەوە ڕۆچون، لەکاتی تەقینەوەی شارەکەیان بەردی گڕاوی ئەچو بەئاسماندا بەهۆی ئەو هێزەوە کـەخوا دای نـابوو لـەنێو زەویـدا، پـەیتا پـەیتا بـەردە گـەرم ئـەڕژا بەسـەر شارەکەدا، دوورنیە دەریاچـەی لـوت جێگـەی ئـەو شـارەبێ، ئـەو شـارە سـێ ڕۆژ لـە بەیتولموقەدەسەو دوورە .

خـوای مـەزن لـەپاش بەسـەرهاتی گـەلانی ڕابـوردو باسـی بەسـەرهاتی شـوعەیب و گەلەکەی ئەکا.

وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ وَلَا تَنقُصُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ ۚ إِنِّىٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾ وَيَٰقَوْمِ أَوْفُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿٨٦﴾

﴿ وَإِلى مَدْيَنَ أخاهُمْ شُعَيْباً﴾ وەئێمـە ڕەوانـەمان کـرد بـۆلای دانیشـتوانی مەدیـەن شوعەیبی برای خۆیان، ئەو شارە نێو نراوە بەناوی مەدیەنی کـوڕی ئیبراهیم. زانایـان بـۆ ڕەگەزی شوعەیب بیریان جیـاوازە. هـەندێکیان ئـەڵێن شـوعەیب کـوڕی نویبـل کـوڕی ڕەعویل کوڕی عینا کوڕی مەدیەن، هەندێ لایان وایە کوڕی نووەیـب کـوڕی مەدیەنـە، هەندێ تریان ئەڵێن: کوڕی عینای کوڕی مەدیەنە .

﴿ قالَ یاقَوْمِ اعْبُدُوا واللهَ مالَکُمْ مِنّ إلهٍ غَیْرَهُ ﴾ شوعەیب فەرمووی : ئەی تاقمی مـن : ئێوە خوا ببەرستن بۆ ئێوە نیە هیچ خوایە شایانی پەرستن بێ جگەی خوا .

ئەو گەلـەی شوعەیب لـە کێشانەو پێوانەدا زۆریان بۆ خۆیان ئەبرد و کەمیان بەجگەی خۆسیان ئەدا، شوعەیب دوای داواکردنی پەرستنی خوای لێ کـردن، داوایشـی لێ‌کـردن واز لـەو ڕەوشتە خراپە بهێنن و فەرمووی :

﴿ وَلاتَنْقصُوا المِکْیالَ وَالمِیْزانَ إنّي أراکُمْ بِخَیْرٍ وَإنّي أخافُ عَلَیْکُمْ عَذابَ یَوْمٌ مُّحِیطٍ ﴾ وەئێوە بەشی ئادەمیزاد کەم مەکەنەوە لـەپێوانەو کێشانەداو کەمیان بدەنێ. بەڕاسـتی مـن ئێوە وائەبینم بەچاکەیەکی گەورەوە ئـەژین و لـەهـەرزانیدان و دارایـی ز ۆرتـان هەیـە و پێویستیتان بەکەم کردنەوەی مافی ئادەمیزاد نیە کە ئەو کارە خراپە بکەن و مـن ئەترسـم لـەسەر ئەو کارە خراپە ئێوە ئەیکەن توشی سزایە بـن چـوار دەورتـان بگـرێ و بنـەبڕبن ئەگەر بەردەوام بن لـەسەری .

﴿ وَیاقَوْمِ أوْفُـوا لْکَیْـلَ وَالمِـیْزانَ بِالْقِسْـطِ ﴾ وەئێـوە بـا پێوانـەو کێشـانەتان تـەواوبێ بەجۆرێکی دادپەروەرانە و هەریەکە مافی خۆی بدرێتێ ، دوای قەدەغەکردنی کەم کردنی پێوانەو کێشانە فەرمانیشی پێدان بۆ تەواوکردنیان بەدادپەروەرانە بۆ باشتر پەیوەیستیان بـە تەواوکردنیانبێ .

﴿ وَلاتَنْجِسُـوا الْنـاسَ أشْـیاءَهُمْ ﴾ وە ئێـوە مـافی ئـادەمیزاد کـەم مەکەنــەوە لـەدارایيەکانیان. لـەبەرئەوەی ئەو گەلـە بەردەوامبون لـەسەر ئـەو کـردەوە خراپـە خـوای مەزن سێ جار ئەو قەدەغەکردنەی دووپـات کـردەوە هـەتا ئـەو فەرمانـە بـەهێزتربێ بـۆ وازهێنان لـەوکارە خراپە ئەگینا ناوەڕۆکی ئەو ڕستانە هەمویان یەکن .

﴿ وَلاتَعْثَوا فِي الآرْضِ مُفْسِدِيْنَ ﴾ وەئێوە بـڵاو مەکەنـەوە خراپـەی کێشـانەو پێوانـە لەزەویدا لەکاتێکا ئێوە بتانەوێ خراپـە کـەربن و واز لەخراپـە کـردن نەیـەرن و رێگـە لەدانیشتوان بگرن و دارایی ئەوان داگیر بکەن .

﴿ بقِيَةُ اللهِ خَيْرٌ لَكُمْ إنْ كُنْتُمْ مُؤمِنِيْنَ وَماأنا عَلَيْكُمْ بحَفيظ ﴾ شتێ خوا ئەیهێڵێتەوە بـۆ ئێوە لەقازانج دوای تەواوکردنی پێوانەو کێشانە چاکترە بۆ ئێوە و پیتی زۆتر ئەبێ ئەگـەر ئێوە باوەڕتان بەخوا هەبێ و، من خراپەی ئێوە ناپارێزم و کردەوەکانتان ناژمێرم و دوایـی پاداشتان بدەمەوە. من تەنها فەرمانی خوا بەئێوە ڕائەگەیەنم و ئامۆژگاریم لەسەرەو بەس.

بۆ زانـین: ئەگـەر ئێمـە ووردبینـەوە لـەمێژووی گـەلانی پێشـوو، لـەڕووداوی ئـەم سەردەمەی خۆیشمان ووردبینەوە بۆمـان ڕون ئەبێتـەوە هـۆی هـەمو ئاژاوەیـە لـەڕووی زەویـدا شـاردنەوەو داگـیرکردنی سـامانی ئـادەمیزاد و زەوت کردنـی مـاف و دارایـی هەژارانەکە بەو بۆنەوە کەمێك لەستەمکاران ئەبنە خاوەنی سامانی زۆر مـافی دانیشـتوان پێ شێل ئەکەن، کار بەدەستان و چڵکـاو خۆرەکانیـان ئەبنـە خـاوەنی دەیـان کۆشـك و تـەلار. بـەڵام بەهـەزاران ئـادەمیزاد بەوبۆنـەوە بـێ خـانوو بێدەرامـەت و بـێ نـان بەسەرگەردانی ئەسوڕێنەوە. ناوەڕۆکی مانای ئەو ئایەتانە ئەوانەمان بۆ ڕون ئەکەنەوە .

قَالُواْ يَٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِيٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُۚ وَمَا تَوْفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾

وَيَٰقَوْمِ لَا يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِىٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثْلُ مَآ أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ أَوْ قَوْمَ هُودٍ أَوْ قَوْمَ صَٰلِحٍ ۚ وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ ﴿٨٩﴾ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّى رَحِيمٌ وَدُودٌ ﴿٩٠﴾

﴿ قَالُوا يَاشُعَيْبُ أَصَلاتُكَ تَأْمُرُ أَنْ نَتْرُكَ مايَعْبُدُ آباؤُنا ﴾ گەلی شوعەیب ووتیـان: ئـەی شوعەیب: ئایا نوێژی تۆ فەرمان ئەدا بەئێمە کەواز بهێنین لـەپەرستنی شتێ باوباپیری ئێمـە ئەیپەرستن ؟

﴿ أَوَ أَنْ نَفْعَلَ في أَمْوالِنا مانَشاءُ ﴾ یا کەئێمە واز بهێنین لـەکردنی شـتێ ئارەزوومـان هەبێ بیکەین لەداراییەکانی خۆمان، بەگوێرەی گفتوگۆی تۆ ئێمە قازانجی زۆر ئەکەین بەر جۆرێ ئارەزوومان هەبێ .

﴿ إِنَكَ أَنْتَ الحَلِيْمُ الرشِيدُ ﴾ بەڕاستی تۆ مرۆڤێکی هێمنـو ژیـری. کەواتـە تـۆ چـۆن بەئێمە ئەڵێی، بەلای ئێمە تۆ بووی بەپیاوێکی گێل و ڕێگـەت لێ تێـك چـوە، هەرکەسـێ باوەڕی بەخواو بەڕۆژی دوایی نەبێ نوێژ ئەکا بـە جێگـەی گاڵتـە کـردن بەنوێژکـەران. بێگومان شوعەیب یەکێ بوە لـە نوێژکـەران، بۆیـە خزمـەکانی ووتیـان بەشـوعەیب، ئایـا نوێژەکەت فەرمانت پێ ئەدا کەئێمە ئەو کارانە نەکەین .

لـەوئایەتەی پێشوودا ئەمانەمان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە: کەپـەیامی پێغەمـەران هەربەتەنـها بەجێهێنانی دورشمی ئایینی نیە. بەڵکو هەموو شێوەیەکی کۆمەڵایەتی و زانیاری و ئابووری و بەرگری و ڕامیـاری ئەگرێتـەوە بەمـەرجێ دژی ئـایین نـەبن. یاسـای پێغەمـەران مـافی ئادەمیزادی دیاری کردوە لەهەڵسان وکردەوەیا لــەژیانی ڕۆژانـەیا. نابێ دەسـت درێـژی

بکرێتە سەر مافیان، قەدەغەیشی کردووە زیـان بەدانیشـتوان بگەیـەنرێ نەلـەیـەکێکیان و نەلـەزۆریان لـەلایەن هیچ کەسێك و هیچ لایەنێکـەوە، ڕونیشـی کردوەتـەوە گـەورەترین دوژمنی پێغەمەران و نوێژکەران وپیاوچاکان ئەو کەسانەن دارایی زۆریـان کۆکردوەتـەوە بەفێڵ و بەدەست بڕیـن و دەسـت خسـتنە، ژیـانی پاشـەڕۆژی هاونیشـتمانان بـەگوێرەی هەوەسی خراپی خۆیان .

ئایینی ئیسلام دژی سەرمایەداری و سۆشیالیستە. یەکەمیان لـەبەرەئـەوەی کۆمـەڵێکی کەم مافی زۆربەی نیشتمانان داگیر ئەکەن وبێبەشیان ئەکەن لـەپیت و فـەڕی نیشـتمانی خۆیان. دووهەمیان لـەبەرئەوەیە نرخ بۆ تاکەکـەس وگشـت ئـادەمیزاد دانـانێن، هـەموو دانیشتوان خاوەنی هیچ جۆرە دارایی وسـامانێ نـین و بەنانەسـکی ئـەژین.. بـەلام ئـایینی ئیسلام ئەیەوێ گرێ کوێرەی هاونیشتمانان بکرێتـەوە پیـت و دەسـت کـەوتی نیشـتمان بەیەکسانی بەش بکرێ بۆ هەمو لـەنێو دانیشتوانا، هەموو ناخۆشی هاونیشـتمانان ڕێگـەی لێبگیرێ لـەلایەن کاربەدەستانەوە، هیچ گیانەوەرێ بێبەش نەکرێ لـەپیتی نیشـتمان، ئیـتر خاوەنی هەر پلـەیە بن. خزم بن یابێگانە، هاوئایین بن یانە.

﴿ قالَ ياقَوْمِ أرَأيْتُمْ إنْ كُنْتُمْ عَلى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبّي ﴾ شوعەیب فەرمووی: ئەی تاقمی مـن: ئایا ئێوە هەواڵ ئەدەن بەمن ئەگـەر مـن لـەسـەر ڕێگـەی ڕون بم لـەلایـەن پـەروەردگاری خۆمەوە بەجۆرێکی شایستە و بچێتە مێشکەوە بڕوام پێئەکەن یانە ئێوە چ شتێکتان لـەمن ئەوێ، ئەو شتەی بۆ خۆم پێم خۆشبێ بۆ ئێوەش پێم خۆشە .

﴿ وَرَزَقَنِي مِنْهُ رِزْقاً حَسَناً ﴾ وە پەروەردگاری من لـەلایـەن خۆیـەوە ڕۆزی بەخشـیوە بەمن و دارایی وسامانی ڕەوای داوە بەمن بەبێ ئەوەی دەستی هیچ کەسێ ببڕم و پێوانـەو کێشانەیش ناتەواوبکەم، لـە گەڵ ئەو هەمو چاکەو میهرەبانیەدا ئایا شایستەیە مـن فـەرمان نەدەم بەئێوە واز لـەبت پەرستی بهێنن، لـە دەسـت بڕینـی دانیشـتوان کۆتـایی بهێـنن. پیشەی پێغەمەران ئەوەیە فەرمان بدا بەچاکـەو بەقەدەغـەکردنی خراپـە. مـن لـەخۆمـەوە فەرمان نادەم و لـەلایەن خوای گەورە بەسروش بۆم دێ .

﴿ وَما أُرِيدُ أنْ أخالِفَكُمْ إلى ماأنْهاكُمْ عَنْهُ إنْ أُرِيدُ إلا الآصْلاحَ ماأسْتَطَعْتُ ﴾ وەمن نامەوێ کەمن پێش ئێوە بکەوم بۆلای شتێ، ئێوە لەوشتە قەدەغەبکەم و من بەتەنها داگیری بکەم بۆ خۆم، مەرجە بۆ هەموو پێغەمەرێك کارەکانی بۆ موژدەدانبێ و دانیشتوان ڕاونەنێ، من هیچ مەبەستێکم نیە مەگەر کە ئێوە چاك بکەم بەهۆ فەرماندانم بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپەلەماوەی توانی خۆمدا بۆ چاك کردنتان لەکارو گفتوگۆتانا و بەردەوامم لەسەر هەڵگرتنی هەمو ئازارێ لەو ڕێگەیەدا، پاشەڕۆژتان بەختیاربێ بەهۆی پەرستنی خواۆ هەتا ماوم کۆڵ نادەم لەچاکەکردنی ئێوە بەگوێرەی تواناو، چاکەخوازان بەدەم وبەزمان وبەکردەوەی چاکی خۆیانە ئامۆژگاری دانیشتوان بکەن و بەردەوامبن لەیانگ کردنیان بۆلای ڕێگەی چاك و بەرگە گرێ بۆ ئازار لەورێگەیەدا و بەئارەقی ناوچاوانی خۆیان بژین و نەبن بەسەر خەڵکەوە بەبار.

﴿ وَماتَوْفِيقي إلا بِاللهِ عَلَيْهِ تَوَكَلْتُ وَإلَيْهِ أُنِيبُ ﴾ وەرێگەی چاکەو خوا پەرستی ئاسان ناکرێ بۆ من مەگەر بەهۆی ویست وهێزی خواوە، هەر لەسەر خوا پشت ئەبەستم بۆ گەیاندنی فەرمانی خوا نەك بەهۆی خۆمەوە. هەر بۆلای خوا ئەگەڕێمەوە بەونیازەوە هەر بۆلای خوا ڕوئەکەم لەهاتنە خوارەوەی هەمو کارەساتێ .

﴿ وَياقَوْمِ لايَجْرِ مَنْكُمْ شِقاقي أنْ يَصِيبكُمْ مِثْلَ ماأصابَ قَوْمُ نُوحٍ أوْ قَوْمَ هُودٍ أوْ قَوْمَ صالِحٍ ﴾ وە ئەی خزمانی خۆم: دوژمنایەتی زۆرکردنی من نابێتە هۆی ئەوەی کە توشی ئێوەی بکا وێنەی شتێ توشی گەلی نوح بوبە خنکاندنی ئاو یا توشی گەلی هود بو بەبایەکی زۆر سەخت یاتوشی گەلی صالح بەدەنگێکی توندو تیژ کە ئەوانە هەمویان بنە بڕبون بەهۆی بەدرۆخشتنەوەی پێغەمبەرەکانیانەوە، هیچ گەلێ دوژمنایەتی پێغەمبەرەکانی خۆیان نەکردووە ئەگەر کردبێتیان سزای خوا هاتوەتە خار بۆسەریان بەهۆی بێ باوەڕی خۆیانەوە .

﴿ وَما قَومُ لُوطٍ مِنْكُم بِبَعيدٍ أَسْتَغفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَ تُوبُوا إِلَيهِ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ ﴾ وەگەلی لوت دورنیە لە ئێوەوە وشوێنەکانیان لێتانەوە نزیکە، بۆچی ئێوە تەمێ خوار نابن و ئێوە داوای لێخۆش بون لە پەروەردگاری خۆتان بکەن کەبتەکاناتان پەرستوە، لەپاشا ئێوە پەشیمان بنەوە بۆلای خوای پەروەردگارتان کە چاکەی زۆر ئەبەخشی بەو کەسانە لەکەم کردنەوەی پێوانەو کێشانە وازئەهێنن. بەڕاستی پەروەردگاری من زۆر بەخشندەو میهرەبانە بۆئەو کەسانە لەخوا ئەپارێنەوە، چاکەو خۆشەویستی بەکار ئەهێنێ بۆ پیاو چاکان.

قَالُوا يَا شُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَاكَ فِينَا ضَعِيفًا ۖ وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَاكَ ۖ وَمَا أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ ﴿٩١﴾ قَالَ يَا قَوْمِ أَرَهْطِي أَعَزُّ عَلَيْكُم مِّنَ اللَّهِ وَاتَّخَذْتُمُوهُ وَرَاءَكُمْ ظِهْرِيًّا ۖ إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٩٢﴾ وَيَا قَوْمِ اعْمَلُوا عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ ۖ سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَمَنْ هُوَ كَاذِبٌ ۖ وَارْتَقِبُوا إِنِّي مَعَكُمْ رَقِيبٌ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا فِيهَا ۗ أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾

﴿ قالُوا يا شُعَيْبُ ما نَفْقَهُ كَثِراً مِماّ تَقُول ﴾ گەلی شـوعەیب ووتیـان: ئـەی شـوعەیب ئێمە نازانین زۆر شت لەو شتەی تـۆ ئـەیڵێی لـە یـەکێتی خـواو قەدەغـەبونی ناتـەواوی کێشراوو پێوراوەکان .

ئەو گەلـەی شوعەیب ئەیانزانی بەو شتەی لە هەڕەشەکردن و ترساندن کە شـوعەیب ئەی فەرمو بەوان .

بەڵام مەبەستیان ئەوە بـوو ئـەو شـتانەی ئـەوان ئەیکـەن بۆچـی ئەبێتـە هـۆی هاتنـە خوارەوەی سزا بۆسەریان ؟ بەگومانی خۆیان وایان ئەزانی پیاو چـاکن. پەرسـتنی بتـەکان دام و دەزگای باپیرانە، کـەم کردنـەوەی کێشـانەو پێوانـە سەربەسـتیە لـە پـەیداکردنی دارایی‌دا، ئیتر ئەوانە بۆ ئەبێ خراپ بن ؟ کەواتە فـەرمودەی شـوعەیب لای ئـەوان گـێرە شێوێنی‌و هۆی کاول کردنی وولاتە. ئەو بیرو بۆچونەی ئـەوان نـەریت و رەوشـتی هـەمو چەتەو دەست بـڕو ڕێگەگرانـە لەهـەمو کـات و جێگەیـە، ئـەو نامەردانـە خۆیـان هـاو نیشتمانی خۆیان ئەکوژن وسامانیان داگیر ئەکەن و بەلایانـەوە وایـە خـراپ نیـە، ئەگـەر خراپەیان لێ بگیرێ ئەڵێن بەو هەژارانە: ئێوە تاوانبارن و وولات تێك دەرن و گێروگرفت ئەسازێنن و دژی یاساو ئاسایش و ئاشتین: ئەو خوێن مژانە مەبەستیان ئەوەیە دانیشـتوان سەریان بۆ شۆڕ بکەن. بەدەیان و سەدانیان ئەدەن بەدادگای نارەوای خۆیان بۆکوشـتن و بەند کردنیان.

﴿ وَإنا لَنَراكَ فِينا ضَعِيفاً ﴾ وەئێمە بەڕاستی تـۆ ئـەبینین مرۆڤێکـی لاوازو بـێ هـێزی، ناتوانی بەرانبەر ئێمە راوەستی. کەواتە تۆ بۆخۆت دانیشەو سەر کزبکە.

﴿ وَلَولا رَهَطُكَ لَرَجَمْناكَ وَما أنْتَ عَلَيْنـا بِعَزيْزٍ ﴾ وە ئەگـەر خزمـەکانی تـۆ نەبوایـە کەلـەسەر ئایینی ئێمەن بەڕاستی ئێمە تۆمـان بـەردەباران ئـەکردو، تۆهیـچ گەورەییـەکت بەسەر ئێمەدا نیەو لـە ئێمە بەدەسەلات ترنیت هەتا نەتوانین بەردەبارانت بکەین.

﴿ قَالَ يا قَوْمِ أَرَهطِي أَعَزُّ عَلَيْكُمْ مِنَ اللهِ ﴾ شوعەیب فەرموی: ئەی تاقمی من: ئایا ئەو خزمو تاقمەی من بەهێزو دەسەڵات ترن لەلای ئێوە لەخواو نامەو ئایینی خوا، ئەبوایە ئێوە خواتان بەگەورەتر بزانیبایە .

﴿ وأتخذتموه ظِهْرِياً ﴾ وەئێوە فەرمانی خواتان واز لێ هێناوەو بەوێنەی شتێکی فڕێدراو ئاوڕی لێ نادەنەوەو لەبیری خۆتانی ئەبەنەوەو ئەی خەنە پشتی خۆتانەوە .

﴿ إنَّ رَبي بما تَعْمَلُونَ مُحِطٌ ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری من ئەزانێ بەشتێ ئێوە بیکەن، کردەوەی ئاشکراو نهێنی ئێوە ئەزانێ لەڕۆژی دواییدا بەگوێرەی کردەوەی خۆتان پاداشتان ئەداتەوە .

﴿ وياقَومُ اعمِلُوا عَلى مَكانِكُمْ إني عامِلٌ ﴾ وەئەی تاقمی من: ئێوە کاری خۆتان بکەن بەگوێرەی تواناو هێزی خۆتان لەکردنی کاری خراپ و چ شتێکتان پێ خۆشە ئامادەی بکەن بۆخۆتان. بەڕاستی منیش کاری خۆم دەکەم بەگوێرەی توانای خۆم لەچاکەو لە کۆشش ناترسم بۆ بەدەست هێنانی ئاواتی خۆم بەجۆرێ خوابڕیاری دابێ‌و پاشەڕۆژیشم هەر سەرکەوتنە .

﴿ سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَنْ يَأتِيهِ عَذابٌ يخزيه وَهُوَ كاذِبٌ ﴾ لەمەو دوا ئێوە ئەزانن چ کەسێ دێت بۆلای سزایە ڕسوای بکاو ئابڕوی بباو ئەیشزانن چ کەسێ درۆ ئەکا، لەمەو دوا ڕاستگۆو درۆزن ئەزانرێن و لەیەك جویێ ئەبنەوە .

﴿ وأرتَقِبُوا إني مَعَكُمْ رَقِيبٌ ﴾ وەئێوە چاوەڕوان بکەن بۆ ئەو شتەی ئەیڵێم و بۆتان دەرئەکەوێ چ شتێکی سامناك پەیدا ئەبێ، بۆتان دەرئەکوێ کام لامان سەرئەکەوین . بەڕاستی من لەگەڵ ئێوە چاوەڕوان ئەکەم بۆ هاتنی ئەو سزایە . من بەبێ گومان بڕوام بەڕاستی‌و بە پێغەمبەرایەتی خۆم هەیە .

﴿ وَلَما جاءَ أَمْرُنا نَجَيْنا شُعِيباً وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنا ﴾ وەکاتێ فەرمانی ئێمە ڕۆیی بۆلای سزادانی ئەو گەلەو بۆلەناو بردنیان ئێمە شوعەیب و کەسانێکی ئەو تۆ باوەڕیان هێناوە لەگەڵ شوعەیب ڕزگارمان کردن لەو سزایە بەهۆی میهرەبانی‌و بەزەیی لەلایەن ئێمەوە .

﴿ وَأَخَذَتِ الَّذِيْنَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دِيارِهِمْ جاثِمِيْنَ كَـأَنْ لَـمْ يَغْنَـوا فِيـهَا ﴾ وەدەنگی سزایەکی سەخت کەسانێی ئەو تۆ ستەمیان لـە خۆیـان کردبـو ئـەیان گـرت‌و هەمویان ئەمرن، دوایی ئەو گەلـە بەدەما لـەسەر هەردو ئەژنۆیان ئەکەون بە مردویی لـەنێو شارەکەیان وەك ئەوەی هیچ کەسێ لـەو شارەدا نەبوبێ‌و کەسی تێدا نەژیابێ .

﴿ أَلا بُعْـداً لِمَدْيَـنَ كَمـا بَعِـدَتْ ثَمُـودُ ﴾ ئێـوە بزانـن و ئاگـاداربن یـاخوا دوربـن لـەمیهرەبانی‌و بەزەیی خوا بۆ دانیشتوان مەدەیەن وەك ئەوەی سـەمود دورکەوتنـەوە لـە میهرەبانی خوا .

لە دووای ئەوەی خوای مەزن باسی ئەو شتانەی کرد توشی گەلی نوح و هودو سالح و لوت و شوعەیب بوو، باسی فیرعەون و گەلی فیرعەون ئەکاە ئەفەرموێ :

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَا وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمْرَ فِرْعَوْنَ ۖ وَمَآ أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ ﴿٩٧﴾ يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ ﴿٩٨﴾ وَأُتْبِعُواْ فِى هَـٰذِهِۦ لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ بِئْسَ ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ ﴿٩٩﴾

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنا مُوسى بِآياتِنا وَسُلْطانٍ مُبِيْنٍ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کردبو موسـا بەچەندین کاری پەك خەر ونیشانە ڕونەکانی ئێمە و بەدەستەلاتێکی ئاشکرای پەك خــەر، لـەوانە تەوەرات وداری دەستی وەدەستێکی سپی بێ نەخۆشی وبێ دەرد.

﴿ إلى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَاتَّبَعُوا أَمْرَ فِرْعَوْنَ ﴾ بۆلای فیرعەون وپیاوە بـەڕێزەکانی، دووایـی ئەو تاقمە پەیڕەوی کارو کردەوەی فیرعەونیان کرد وباوەڕیان نـەهێنا. ئەگـەر فیرعـەون یارمەتیدەری نەبوایە بەو ئەندازەیە بێشەرم نەئەبو بڵێ: من پەروەردگاری گەورەی ئێـوەم و جگەی من ئێوە خوایە ترتان نیە، سروشتی ئادەمیزاد لەمەوبەرو ئێستاش هەروەك ئەوان وان. بـەڵام ناوەکانیـان لـەیـەك جـوێ ئەبنـەوە جـارێ بەفیرعـەون ناوئـەبرێ جـارێ تـر بەنەمرودو، لەم سەردەمەی ئێمەیشدا بەجۆرە ناوێ تر ناوئەبرێن ولەسـتەم کردنـدا وەك ئەك وان، بەوێنەی هاوپەیمانی سەربازی .

﴿ وَمـا أَمْـرُ فِرْعَـوْنَ بِرَشِـيدٍ ﴾ وەفـەرمان و کـاری فیرعـەون ژیرانـە نیـە ولەسـەر پرۆگرامێکە ڕاست نیە سەرلێشێوانی ڕوت و گومڕایی ئاشکرایە. موسـا بەفـەرمانی خـوا بانگی فیرعەون و تاقمەکەی ئـەکرد بـۆ لای پەرسـتنی خـوا لەیەکـەم کاتـا دژی موسـا ڕاوەستاو بەلایەوە گرانبو جگەی ئەو بپەرستێ، ئەو بیرو بۆچونەی فیرعەون ژیرانـە نـەبو. بەڵام هەموو مەبەستەکەی فیرعەون مانەوەی گەورەیی خۆی بوو، ئەترسـا ئەوپلـەو پایـە هەیەتی لەناوبچێ، هەموو کەسـێ لـەپیاوەکانی پـەیڕەوی فیرعـەونیان ئـەکرد و ئـەویش پێشیان کەوت بۆ لای گومڕایی لەجیهاندا .

﴿ يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ القِيامة فَـأَوْرَدَهُمُ النّـارَ وَبِئْـسَ الْـوِرد والْـمَوْرُودُ ﴾ فیرعـەون لـەڕۆژی هەڵسانەوە لەگۆڕدا پێشی تاقمەکەی خۆی ئەکەوێ بۆ لای دۆزەخ هـەروەك لەجیـهاندا پیشیان کەوتبوو بۆ لای گومڕایی. دوای تاقمەکەی خۆی خستە نێـو دەریـا لەجیـهاندا، پێشیان ئەکەوێ و ئەیان خاتە نێو ئاگری دۆزەخەوە لەڕۆژی دواییدا.خراپە ئـەو جێگەیـە ئەوان ئەچنە ناوی. ووشەی ( الورد) بەمانا گەیشـتنە بـەئاو، ووشـەی ( المـورود) بـەمانا ئاوە، لێرەدا بەکارهێنراون بۆ ئاگر. لەجیاتی ئەوەی تینویەتیان بشکێنێ ڕیخۆڵـەیان پارچـە پارچە ئەکاو ئەندامەکانیان ئەسوتێنێ .

﴿ وَأُتْبِعُوا فِي هذهِ لعنَةً وَيَوْمَ القِيامَةِ بِئْسَ الرِّفْدُ المَرْفُودُ ﴾ وەدوای ئەوان خراوەو بەوان بەخشـراوەبێ بەشبوون لـەمیهرەبانی وبـەزەیی خـوا لـەم جیهانـەو لـەڕۆژی دووایـدا،

لەجیهاندا خنكان بـەئاوی دەریـا و لـەپاشـەڕۆژدا ئەخرێنـە نـاو، ئـاگری دۆزەخ. خراپـە كۆمەكی بەوان وئەوەی بەوان بەخشراوەو خراپ بەخششێكە بـەوان بەخشـراوە دوای ئەوەی خوای مەزون باسی بەسەرهاتی نەتەوەكانی پێشووی كرد لەگەڵ هەڵوێسـتیان بـۆ پێغەمەرەكان، ئیستاش بەپێغەمەری بەڕێزی خۆی ئەفەرموێ:هـەندێ لـەونەتەوانـە سـۆماو شوێنەواریان ماوەتەوە، وەك شارەكانی عـاد و سـەمود، هـەندێكیان شـوێنەواریان نـەماوە بەوێنەی گەلی نوح ولوت، خوا ئەفەرموێ :

ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾

﴿ ذٰلِكَ مِنْ أنْباءِ الْقُرى بَقُصُّهُ عَلَيْكَ ﴾ ئەوەی باسكرا لـەهەواڵی گوندەكـاول بوەكـان ئێمە هەواڵەكانیان باس ئەكەین، بۆئەوەی تۆیش بگێڕیتەوە بۆ گەلـەكەی خۆت هـەتا ببـێ بەئامۆژگاری بۆیان و تەمێ خوار بن .

﴿ مِنْها قائِمَ وَحَصِيْدٌ ﴾ هەندێ لـەو گوندانە هەیانە ئاوەدانــەو شـینایی تێدایـە هەیانـە كاولـن بەوێنەی شینایی دروەكراو یانێ هەیانــە شـوێنەواریان مـاوەو هەیانـە شـوێنەواریان نەماوە .

﴿ وَما ظَلَمْناهُمْ وَلَكِنْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ﴾ وەئێمە بەلەناوبردنی دانیشتوانی ئەو گوندانە ستەممان لەوان نەکردووە، بەلاّم ئەوان خۆیان ستەمیان لەخۆیان کردوە بەنەپەرستنی خواو بەوەلاّم نەدانەوەی پێغەمەرەکانیان .

﴿ فَما أَغْنَتْ آلِهَتُهُمْ الَّتِي يَدْعَوْنَ مِنْ دُونِ اللهِ لَمّا جاءَ أَمْرُ رَبِّنا وَمازاوَدُهُمْ غَيْرَ تَتْبِيتٍ ﴾ دوایی خوا کانی ئەوتۆی ئەوان ئەیان پەرستن لەجگەی خـوا سـوودی بـەوان نەبەخشی کاتێ هات فەرمانی پەروەردگاری تۆ بۆ سـزادانیان و خـەشمی خـوا لـەوان ناگێڕێتـەوەو، خواکانیان زۆرناکەن بۆ ئەوان جگەی لەناوبردن و زیاندان بەوان .

﴿ وَكَذلِكَ أَخذُ رَبِّكَ إِذا أَخَذَ الْقُرى وَهِيَ ظالِمَةٌ ﴾ وەبەوێنەی ئەو سزادانەیە: سزادانی پەروەردگاری تۆ کاتێ سزای دانیشتوانی گوندەکان بـدات وەکـاتێ دانیشـتوانیان سـتەم لەخۆیان بکەن .

﴿ إِنَّ أَخذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴾ بەڕاستی گرتن و سزادانی پەروەردگار خـاوەن ئـازارەو زۆر سەختە .بەلاّم دوای ئاگادارکردنیان بەهۆی پێغەمەرەکانیانەوە ئەگەر پەشیمان نەبنەوە .

ئەو هەڕەشەیە بەردەوامە بەهۆی فەرمودەی قورئان و فەرمودەی پێغەمـەرەوە.کەواتـە پێویستە لەسەر دانیشتوانی ڕوی زەوی چاوەڕوانی هەمو جۆرە سزایە بکەن ئەگەر واز لە بێ فەرمانی خوا نەهێنن. بە تایبەتی لـەم سـەردەمەی ئێمـەدا گـازی کیمیـاوی و بۆنبـای ئۆتۆمی وچەندین مینی چێنراو لەزەویدا کەبۆ دانیشتوان ئامادەکراون .

إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ الْآخِرَةِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ النَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴿١٠٣﴾ وَمَا نُؤَخِّرُهُ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴿١٠٤﴾ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾ فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُوا فَفِي

ٱلنَّارِ لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ ۞ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِي ٱلۡجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۖ عَطَآءً غَيۡرَ مَجۡذُوذٖ ﴿١٠٨﴾ فَلَا تَكُ فِي مِرۡيَةٖ مِّمَّا يَعۡبُدُ هَٰٓؤُلَآءِۚ مَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن قَبۡلُۚ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمۡ نَصِيبَهُمۡ غَيۡرَ مَنقُوصٖ ﴿١٠٩﴾

﴿ إِنَّ فِي ذٰلِكَ لآيَةً لِمَنْ خافَ عَذابَ الآخِرَةِ ﴾ بەڕاستی لەباسکردنی ئەو هەواڵ و بەسەرهاتەی گەلانی ڕابووردودا هەیە. بەڵگەی ڕون بۆ کەسێ لەسزای پاشەڕۆژ بترسێ، پەند و ترس هەر باوەڕداران سودی لێوەرئەگرن .

پرسیار/ بەڕاستی تۆفان وبومەلەرزەو کارەساتی تر کەپەیدا ئەبن کارێکی سروشتیە لەوانەیە لەمەوبەر و ولەمەو دوایش پەیدا ببن و تاوانبار و بێتاوان و باوەڕداران وەك لەیەك لەناوئەبەن، پەیوەندیان بەخراپە کردنەوە نیە. کەواتە پێغەمەران دەوریان نیە ؟.

وەڵام/ بەڕاستی پێغەمەران پێشەکی گەلەکانی خۆیان ئەترسان بەپەیدابوونی ئەو شتانە بۆ سزادانیان، هەر لەو کاتەیشدا جۆری سزاکە و هاتنیشی بۆ دیاری کردوون بەرلەپەیدابوونیان لەدووایدا هەربەوشێوەیە پێغەمەرەکان فەرموبویان ئەو ڕووداوە پەیدا ئەبو بەبێ پاش و پێش. کەواتە فەرمودەی پێغەمەران بەسروش بوە .

﴿ ذٰلِكَ يَوْمٌ مَجْمُوعٌ لَهُ النّاسُ وَذٰلِكَ يَوْمٌ مَشْهُودٌ ﴾ ئەو ڕۆژەی دوایی ڕۆژێکە کۆئەکرێتەوە بۆ ئەو ڕۆژە هەموو ئادەمیزاد، بۆ ئەوەی پرسیاربکرێ لەهەموویان لەسەر

ئەوشتانەی پێشیان خستوە بـۆ خۆیـان لـەچاکـە لەخراپـە. وەئـەو ڕۆژە ڕۆژێکـە هـەموو دانیشتوانەکانی ئاسمانەکان و زەوی تێدا ئەبینرێ و ئامادە ئەکرێن.

﴿ وَمانُؤَخِرَهُ إلا لأجَـلٍ مَعْـدُودٍ ﴾ وەئێمـە ئـەو ڕۆرژەمـان دوا نەخستوە مەگـەر بـۆ ماوەیەکی دیاریکراو لـەلایەن خوای مەزنـەوە، بـۆ هەموشـتێ لای خـوا ماوەیـەکی هەیـە کۆتایی پێ دێ بەبێ پاش و پێش ئەو ماوەیبە کۆتایی پێ هاتنی جیهان و هەمو بونەوەرانـەو کەس بەماوەی ئەو ڕۆژە نازانێ جگەی خوا .

﴿ يَوْمَ لاتَكَلَّمُ نَفسٌ إلا بِإذْنِهِ ﴾ کاتێ ئەورۆژە هات هیچ کەسێ گفتوگۆ ناکـا مەگـەر بەدەستوری خوا، کەواتە دەستور ئەدرێ بەوکەسە خـوا بیـەوێ لـەهـەندێ جێگـەدا بـۆ ئەوەی بەرگری بکا لـەخۆی لەبەردەم دادگایەکی دادپەروەردا یا بۆ کەسێ تـر بپاڕێتـەوە بۆ کەسێ خواد ئارەزووی هەبێ .

﴿ فِمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَ سَعِيْدٌ ﴾ دوای دانیشتوان لـەوجێگەیە وەستانەدا ئەبن بـە دووبـەش : هەندێکیان بەدبەخت و بێچارە سزایان ئەدرێ، هەندێ تریان نوسراوە بۆیان بـەختیاری و ئەخرێنە بەهەشتەوە. بەبێ گومان بەدبەختی و بەختیاری بەهۆی کردەوەی خۆیانەوەیە .

﴿ فَأما الَّذِيْنَ شَـقُوا فَفِـي النّـار لَـهُمْ فِيْـها زَفْـيرٌ وَشَـهِيْقٌ ﴾ دوایـی کەسـانێکی ئـەوتۆ بەدبەختِ بوون لـەنێو ئاگردان بۆ ئەوکەسانە هەیە لـەنێو ئـاگری دۆزەخـدا هـاتوچۆی هەناسە لـەنێو سێکیانا هەتا بەرز ئەبێتـەوە پەراسـوەکانیان، وەبۆیشـیان هەیـە گەڕانـەوەی هەناسەیان بۆ سنگیان، هەندێ لـەزانایان ئەڵێن: شەهیق هەناسەی سەختە زەفیر هەناسـەی سوکە، زوحاك وموقاتیل ئەڵێن: زەفیر دەنگی کۆدرێژە لـەسەرتاوە شـەهیق دەنگـی گـوێ درێژە لـەکۆتاییدا کاتێ ئەی گێرێتەوە بۆ لای سـنگی. ئەبوالعالیـە ئـەڵێ: زەفـیر دەنگـی قورِگە، شەهیق لـەنێو زکدایە .

﴿ خالِدِيْنَ فِيْها مـادامَتْ السّماواتُ وَالأَرْضُ ﴾ بـەردەوامن لـەنێو ئـاگری دۆزەخـدا بەبەردەوامی ئاسمانەکانی و زەوی دۆزەخ . بێگومان دانیشتوانی دۆزەخ و بەهەشت ئاسمان وزەویان هەیە ئەوەی لـەسەرەوەیە ئاسمانە وئەوەی لـەخوارەوەیە زەویە .

هەر کەسێ خراپە نێو ئاگر دۆزەخەوە بەهۆی هەرگەناهێکەوە بێ توانـای دەرچوونـی نیە نەبەهۆی خۆیەوە وەنەبەهۆی پاڕانەوەیە کەسێ ترە. کەواتە بەردەوامە لەناو، ئـاگردا. بەلاّم کاتێ خوا ئارەزووی کرد ئەی هێنێتە دەرەوە و بەردەوام نـابێ لـەنێو ئـاگردا، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ إلا ماشاءَ رَبُّكَ فَعالٌ لّما يُرِيْدُ ﴾ مەگەر شتێ خـوای پـەروەردگاری تـۆ ئـارەزووی کردبـێ لـە دەرهێنـانی کەسـێك لـەناو، ئـاگردا کەبـەگوناهی زۆرەوە مـــردوە بـــەلاّم باوەڕداربوە. بەڕاسـتی پـەروەردگاری تـۆ شـتێ بیـەوێ ئـەیکاو هـەمو شـتێ لەئـەنجامدا ئەگەڕێتەوە بۆلای ویستی خوا لـــەدەرچونی هەرکەسـێ ئـارەزووی هـەبێ لـەنێو ئـاگداە بەمانەوەی هەرکەسێ ئارەزووی هەبێ .

﴿ وَأَمّا الَّذِيْنَ سُعِدُوا فَفِي الْجَنَّةِ خـالِدِيْنَ فِيْـها مـادامَتْ السَّـماواتِ وَالأَرْضُ إلا ماشـاءَ رَبُّكَ عَطاءً غَـيْرَ مَجْـذُوذٍ﴾ وەکەسـانێکی ئـەوتۆ بـەختیاریان دراوەتـێ لـەنێو بەهەشـتان بەردەوامن لەنێو ئەودا بەئەندازەی بەردەوامی ئاسمانـەکان و زەوی، مەگـەر شـتێ خـوای پەروەردگار ئارەزووی کردبێ، ئەبەخشرێ بەوان شتێ نابڕێتەوەو کۆتـایی پـێ نایـە، ئـەو کەسانەیش بریتین لـە پێغەمەران وڕاست گۆیان وشەهیدان و پیاو چاکان.

پرسیار/ کەسێ چوە بەهەشت نایەتە دەرەوە کەواتە مەبەست لەئارەزوکردنی خـوا چ شتێکە ؟

وەلاّم/ مەبەست ئەوەیە خوا دەریان ئەکا بۆ لای چاکە بەوێنەی ئەو پاداشـتە باچاکـتر لەوێدان، ئاماژەیشە بۆلای توانای خـوا، هەرشـتێ دژی کـرداری خـوا نـەبێ پرسـیاری لێناکرێ وخوا هەمو شتێ ئەکا باوەکو لای ئێمە بەگوێرەی سروشـت نـەبێ، ئـاگر شـت ئەسوتێنێ بەلاّم کە خوا فەرموی سارد بەرەوە سارد ئەبێ .

﴿ فَلاتَكُ فِي مِرْيَةٍ مِمّا يَعْبُدُ هؤُلاءِ مايَعْبُدُونَ إلا كَما يَعْبُدُ آباءَهُمْ مِنْ قَبْلُ ﴾ دوایی لـەگوماندا مەبە لـەشتێك ئەو تاقمە ئەیپەرستن، ئەوتاقمانە ئەوشتانە ناپەرستن مەگەر بـەوجۆرەی لەمەوبـەر باو باپیرانیان ئەیان ئەپەرستن لـەو کاتەدا بەناڕەوایی و بەپوچی، ئەو جۆرە ڕەوشتانە تازە نیە، ئەو تاقمـــەی ئێسـتا لاســـایی پێشـــوەکانیان ئەکەنـــەوە، هـــەروابوەو هـــەر وائـــەبێ

بێباوەڕان لەناو ئەچن و باوەڕداران ڕزگاریان ئەبێ. ڕستەی ( فَلَاتَكُ فِي مِرْيَةٍ ) هەرچەندە ڕوی پێکراوە بۆلای پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەلام لەناوەڕۆکدا هەرگەلەکەی ئەگرێتەوە، چونکە پێغەمەر هەرگیز ناکەوێتە گومانەوە .

﴿ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنْقُوصٍ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە بەتەواوی ئەدەین بەوبت پەرستانە لەگەڵ ئەوەیشدا بێ فەرمانی ئێمە ئەکەن بەشی خۆیان لەو ڕۆژیە بۆیان دیاری کراوە بێ ئەوەی هیچ شتێکی لێ کەم بکرێەوە، پاداشتی چاکەی جیهان یان ئەدرێتەوە بەتەندروستی و هەرزانی و خێزانی زۆرو پلەوپایە. لەڕۆژی دوایشدا بەشی خۆیان وەرئەگرن لەسزا بەتەواوی .

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١١٠﴾ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١١﴾ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا۟ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ وَلَا تَرْكَنُوٓا۟ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَىِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٥﴾

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنا مُوسى الْكِتابَ فَأخْتَلَفَ فِيْهِ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە بەخشیومانە بەموسا نامەیە کەتەوراتە، دوایی ناکۆکی لەونامەیەدا پەیدابو، هەندێ کەس باوەڕیـان پێ‌هێنـاو وتـاقمێ تریان بێباوەڕبوون. بێگومان هەمو نەتەوەیە لەکۆن وە لەتازەدا پێك نـەهاتوون لـە سـەر فـەرموودەی پێغـەمەرەکانیان وئامۆژگـاری کـەرەکانیان بـەنیازی پاکیانـەوە. ئـەوەبو بەنوئیسرائیلی پێغەمەرەکانی خۆیانیان کوشت، بگرە ئەوانەیشیان باوەڕیان بەموسـا هێنـاو دووای موسـا تـەوراتیان سـوتان وجۆرەهـا خراپـەیان زینـدو کـردەوە. کەواتـە جێـی سەرسوڕمان نیە کە تاقمێ باوەڕ بەتۆ بهێنن و تاقمێ تر لەخزمەکان ونەتەوەکەت بـاوەڕت پێ‌نەهێنن .

﴿ وَلَوْلا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِنْ رَبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَـهُمْ ﴾ وەئەگـەر فـەرمودەو فـەرمانی خـوای پەروەردگاری تۆ پێش نەکەوتایە بۆ دوواخستنی سزادانی ئەو کەسانە ئاژاوەیان پەیدا کرد لەو نامەیەدا بەڕاستی فەرمان ئەدرا لەنێوانیا بە ناردنە خوارەوەی سزا بۆ سەریان و چـاك و خراپیان لەیەك جوێ ئەکرایەوە. بەلاّم کـاری شایسـتەی خـوا ولەوەدایـە بنـە بڕنـەبن بەناردنی سزا بۆ سەریان .

﴿ وَإنَهُمْ لَفِي شَكٍ مِنّهُ مُرِيْبٍ ﴾ وەبەڕاستی دانیشتوانی مەککە لـەگوماندان لەڕاسـتی قورئان و هاتنە خو ارەوەی قورئان بۆ سەر تۆ بەگومانێکی ئاشکراو زۆر بەهێز .

بەڕاستی خوای مـەزن هـەتا ڕۆژی دوایـی سـزادانی کەسـێکی دوواخسـتوە بـاوەڕی بەتەورات نەهێناوە لەتاقمەکەی خۆی و دووایشی خستوە بـۆ کەسـێ بـاوەڕی بـەقورئان نەهێناوە لەگەڵ مەحەمەد، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَإنَّ كُلاًّ لَمّا لَيُوفِيَنَّهُمْ رَبُّكَ أعْمالَهُمْ إنَّهُ بِما يَعْمَلُونَ خَبِيْرٌ ﴾ وەبەڕاستی هەمو کەسێ لەباوەڕداران و لەبێ‌باوەڕان سوێند بەخوای پەروەردگاری تۆ بەتەواوی ئەیانداتێ پاداشتی کردەوەکانیان. بەڕاسـتی پـەروەردگاری تـۆ ئاگـاداری شـتێکە ئـەوان ئەیکـەن لـەچاك ولەخراپ ولەپاداشت و لەسزا .

﴿ فَاسْتَقِيْم كما أمَرْتَ وَمَنْ تابَ مَعَكَ ﴾ دووایی تۆ ڕاوەستە لەسەر ئایینی خۆت و کارکردن بەو ئایینەو بانگ کردن بۆلای ئە وئایینە بەو جۆرەی فەرمان بەتۆ دراوەو، با لەسەر ئەو ئایینە ڕاوەستێ کەسێ پەشیمان بۆتەوە لەبێباوەڕی وگەڕاوەتەوە بۆ لای خوا بەنیازی پاکەوە بەوجۆرەی فەرمانی پێدراوە .

﴿ وَلاتَطغوا إنَهُ بِما تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ وەئێوە دەرمەچن لەوشتەی بۆتان دیاری کراوەو بی فەرمانی من مەکەن. بەڕاستی پەروەردگاری تۆ ئەبینێ شتێ ئێوە ئەیکەن. کەواتە ئێوە لەخوا بترسن و بێ فەرمانی خوا مەکەن .

﴿ وَلا تَرْكَنُوا إلى الَّذِيْنَ ظَلَمُوا فَتَمَسَكُمْ النّارُ ﴾ وەئێوە مەیلتان نەبێ بۆلای کەسانێکی ئەوتۆ ستەمیان لەخۆیان کردوە، بەهیچ جۆرێ خۆشتان نەوێن یەدڵ بەگوێرەی توانا بێ دەنگ مەبن لەکردەوەی خراپیان، دوایی تووشی ئێوە ئەبێ ئاگری دۆزەخ بەو بۆنەوە .

﴿ وَمالَكُمْ مِنْ دُونِ اللهِ مِنْ اَوْلِياءَ ثُمَّ لاتَنْصُرُونَ ﴾ وەنیە بۆ ئێوە لەجگەی خوا هیچ دۆستێك لەبتەکان وجگەی بتەکان بتانپارێزن لەسزای خوا، لەپاشا ئێوە یاریدەتان نادرێ، ئەگەر ئێوە بەردەوامبن لەخۆشەویستی ستەمکاران .

بۆ زانین: زانایان ئەڵێن: جەنگ کردن پێویستە لەڕێی خوادا وبۆ بڵاو کردنەوەی ئایینی ئیسلام وبەرگری لەئیسلام و لەنیشتمانی موسڵمانان و بەرگری لەخۆت و لەدارایی و لەناموس. بەڵکو بەرگری لەوانە پێویستە ئیتر پەیوەندییان بەخۆتەوە هەبێ یابەجگەی خۆتەوە. خاوەنی تەفسیری ( ئەلجەواهیری ) ئەڵێ: هەرکاتێ دوژمن لەبێ باوەڕان پەلاماری موسڵمانانیانداو ترسی ئەوە ئەکرا شکۆی ئیسلام نەمێنێ، یا ئەیان ویست شارەکانی ئیسلام داگیر بکەن و دیلیان بکەن و بیانکەن بەبەندەو داراییان داگیر بکەن، ئەوکاتە پێویستە بەرگری لەسەر پیاوانی سەربەست وبەندەو ساغ ونەخۆش و کوێر و شەل و جگەی ئەوانیش ئەگەر پێویست بوو، مەرج نیە حازربوونی پێشەوانی موسڵمانان و دەستوردانی، بەتایبەتی پێویست نیە لەسەر ئەوکەسانەی دەست درێژی ئەکرێتە سەریان. بەڵکو پێویستە هەموو موسڵمانان ڕاپەڕن بۆئەو بەرگریە ئەگەر

ئاگاداری ئەو دەست درێژیە بون ونەزانن ئەتوانن بـەرگری بکـەن لـەخۆیان، هەرکەسێ لەوانەوە نزیکبێ ئەو بەرگرییە پێویستە لەسەریان، هـەمو ئـامادەمیزاد بێبـەرگری کـردن لـەخۆی پێویستـە باگومـانی وانـەبێ ڕزگـاری نـابێ، چونکـە ئەوکەسـانە نیشـانەن بـۆ لەناوچوون بەهەموو جۆرێ. بەڵام بەرگری ناموس ودارایی خـۆی کـاتێ پێویستـە بزانـێ خۆی و ناموس و دارایی بەیەکەوە لـەناوئـەچن، هـەروەها پێویستـە بـەرگری لـەمانـەوەی ژیانی جگەی خۆی و دارایی وناموسی ئەگەر ئەیزانی خۆی لـەناوئەچێ .

زانایان ئەڵێن: پێویستە ڕزگارکردنی خنکاو کوژانەوەی ئاگرێ بەربوەتە دارایی جگەی خۆی، هەروەها پێویستە لـەسەر نوێژکەر نوێژەکەی ببڕێ بـۆ لابردنـی زیـان لـەکەسێکی بێتاوان و لـەدارییە پێویستبێ پاراستنی ئیـتر هـی خۆتبـێ یاجگـەی خـۆت، وەهەرکەسـێ منالێکی چاو پێکەوت لـەچۆڵاییدا و نەی ئەتوانی خۆی بەخێوبکا پێویستە لـەسەری هەڵی بگرێ وبیپارێزێ، بۆ پاراستنی کارێکی گرنگ پێویستە یارمەتی برای خۆت بدەی .

﴿ وَأَقِمْ الْصَلاة طَرَفِي النَهار وَزُلفاً مِنَ الْلَيْلِ ﴾ وەتۆ لـەهـەردوو لای ڕۆژدا نوێژەکـان بەجێ بهێنە، لای یەکـەمیان بەیانیـە، لای دووهـەمیان عەسـرە، وەبەجێبهێنـە نوێژەکـان لەکاتەکانی شەویشدا کە نوێژی مەغریب و عیشایان تێدا ئـەکرێ، درێـژەی باسـەکەیان لەنامەی تایبەتی خۆیاناهەیە .

﴿ إنَّ الْحَسَناتِ يَذْهَبْنَ الْسَيْئاتِ ﴾ بەڕاستی چاکەکان تۆڵـەی خراپەکان لائەبا. خـوای مەزن ڕونی نەکردوەتەوە ئەو چاکانەو ئەو خراپانە کامانەن ؟ هەندێ لەزانایان ئەڵێن: ئەو چاکانە بریتین لـە پێنج نوێژەکانو خراپەکان بریتین لـەگوناهە بچوکـەکان، هـەندێ تریـان ئەڵێ: چاکەکان بریتیـن لـەهـەمو کردەوەیـەکی چـاك. ئـەوەی شـایانی باسـبێ گوناهـە بچوکەکان بەنوێژ وبەکردەوەی چاك لائەچن. بەڵام گوناهە گەورەکان هیـچ شـتێ لایـان نابا جگەی پەشیمان بونەوە لـەو گوناهانە. بەم مەرجانــە: وازهێنـان لـەگوناە بەتـەواوی. پەشیمان بونەوە لـەسەر کردنی گوناە. نیازی تەواوبێ ولابێ لەمەودوا نەگەڕێتەوە بـۆلای کردنی گوناە. ئەو کاتە پەشیمان بونەوەی لێ وەرئەگیرێ ئەگەر خوا ئارەزووی کردبێ .

﴿ ذٰلِكَ ذِكْرىٰ لِلذّاكِرِيْنَ ﴾ فەرماندان بەڕاوەستان و بەكردنی نوێـژ وقەدەغـەكردنی خۆشەویستی ستەمكاران بیرخسـتنەوەو ئامۆژگـاری كردنـە بـۆ ئەوكەسـانە ئامۆژگـاری وەرئەگرن وبیر لـەتوانای خوا ئەكەنەوە .

بۆ زانین: ستەم كردن سیٚجۆرە :

١- ستەمی وا هەیە لیٚ خۆشبوونی بۆ نیە لـەلایەن خواوە كە بریتیە لـە هاوبەشدانان بـۆ خوا .

٢- ستەمی مرۆڤ لـەخۆی بەكردنی گوناهی بچووك یاگـەورە گوناهـە بچووكـەكان كردەوەی چاك لایان. گوناهە گەورەكان هەواڵەی ویستی خوایە بۆ لیٚخۆشبون یاسـزدانی خاوەنەكانیان .

٣- ستەمكردن لـەجگەی خۆت ئەو ستەمە لیٚبوردنی بۆ نیە وتۆڵـەی لیٚئەسنریٚ ئەگەر ستەم لیٚكراو واز لـەمافی خۆی نەهێنیٚ .

﴿ وَأَصْبِرْ فَإِنَّ اللّٰهَ لايُضِيْعُ اَجْرَ الْمُحْسِنِيْنَ ﴾ وەتـۆ ئـارام بگـرە لـەسـەر بـەجیٚهێنانی فەرمانەكانی خوا دووركەوتنەوە لـەقەدەغەكراوەكان و خۆتیـان بـۆ مـاندو بكـە، دوایـی بەڕاستی خوا لـەناو نابا پاداشتی چاكەكەران بەهەمو جـۆریٚ بـە ومەرجـەی لـەبەرسـودی ئایین بوبیٚ، ئەبیٚبزانین ئەو كەسانە لـەسەر ڕێگەی ڕاستن توشی دەردی سـەری زۆر ئـەبن لـەسەر ڕاستی لـەلایەن ستەمكارانەوە، بۆیە خوای مەزن فەرمانی داوە بەئارام گرتن لـەسەر بەجیٚ هێنانی فەرمانی خوا، ئارام گرتن گەورەترین پەرستنی خوایە .

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی ئەو شتانەی كرد تووشی گەلی نوح و عادو سـەمود و جگـەی ئـەوان بـو لـەسـزادان ۆ لـەناوبردنیان بـەهۆی خراپـەكردنیان لـەزەویدا باسـی ئەوەیشمان بۆ ئەكا ئەو گەلانە زۆربەیان خاوەنی ستەم و تاوان بـوون و كـەمێكیان چـاك بوون ورزگاریان بوە. ئەوەیە خوا ئەفەرمویٚ:

فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُو۟لُوا۟ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ

فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ ۗ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَآ أُتْرِفُوا۟ فِيهِ وَكَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ۗ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾

﴿ فَلَوْلا كانَ مِنَ القُرُونِ مِنْ قَبْلَكُمْ اُلو بَقِيّةٍ يَنْهَوْنَ عَنْ الْفَسادْ فِي الآرْضِ ﴾ دوایـی بـۆ پەیدا نەبوو لـەدانیشتوانی چاخەکان کە ئێمە لــەناومان بـردون هەواڵـەکانیانمان بـۆ ئێـوە گێڕایەوە لـەپێش ئەوەی نەتەوەی موحەمـەدەوە بـوون بەچـەند کەسـێ خـاوەنی ئـەقڵ و فەرمانبەرداری و چاکەبن هەڵسانایە بەقەدەغەکردنی خراپە لـەنێو زەویدا. یانێ نەبو لـەنێو ئەواندا کەسێ رێگە بگرێ لـەخراپە لـەنێو زەویدا بۆیە لـەناومان بردن، سـامانداره‌کانیان و خاوەن پلـەکانیان ستەمیان ئەکرد لـەدانیشتوان وئەوانی تریان بێ دەنــگ دائەنیشـتن، بـەو بۆنەوە هەردوولایان بون بەجێگەی خەشمی خوا .

﴿ إلا قَلْيْلاً مِمَّنْ اَنْجَيْناهُمْ ﴾ مەگەر کەمێك لـەدانیشتوانی ئــەو چاخانـە لـەوانـە ئێمـە رزگارمان کردوە و بیاوەڕیان هێنابو بەووشەی ڕاست وفەرمانیان ئـەدا بەچاکـە ڕێگـەیان ئەگرت لـەخراپە وەك پێغەمەران و پیاوچکان وژمارەیان کەم بون ئەوکەسانە ئەچونە ژێـر فەرمانیان.. ووشەی ( قرن ) بەدانیشتوانی هەموو کاتێ دائەنرێ وزۆرتر بـۆ سـەد سـاڵ بەکارئەهێنرێ .

﴿ وَاتَّبَعَ الذِيْنَ ظَلَمُوا ماأتْرِفُوا فِيْهِ وَكـانُوا مَجْرِمِيْـنَ ﴾ وەکەسـانێکی ئـەوتۆ سـتەمیان کردبو لـەخۆیان بەبێ‌باوەڕی و بەبێ فەرمانی خوا دووای شتێ کـەوتبوون ڕایـان ئـەبوارد لەنێویدا لـەئارەزوواتی خۆیان و گرنگیان ئەدا بەپەیدا کردنی و وازیان لـە چاکە هێنـابوو سەری لێ شێوابوو، ئەو کەسانە تاوانباربن، یانێ پیاوچاکان ڕێگەیان لـە پیاوخراپان ئەگرت هەتا خراپە بلاّونەکەنەوە، بەلاّم ئەوکەسانە زەبونی ڕابوواردن و خۆشی بون بـەردەوامبون لـەسەر خراپە بلاّوکردنەوە هەر لـەبەرئەوەی ساماندراربوون .

﴿ وَماكانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرى يُظْلِمُ وَأهْلِها مَصْلِحُونَ ﴾ وەپـەروەردگاری تـۆ نایـەوێ لەناو ببا دانیشتوانی گوندەکان بەهۆی ستەم کردن و لادانیان لـەسنوری خـوا، لـەکاتێکا لەدانیشتوانی ئەو گوندانە هەبن پیاوچاکان و چاکەخوازن رلـەگەڵ یەکتری و کردەوەیـان ڕاست و دروستبێ و نەخەنە سەر یبێ‌باوەڕی وخراپەکردنیان لـەیەکتری ئیتر بابێ‌باوەڕیش بن. یانێ بەتەنها بێ‌باوەڕی خوا دانیشتوان بنـەبڕ ناکـا هـەتا جگـە لـەبێ‌باوەڕی دەسـت نەکەن بەستەم کردنی لـەیەکتری، لــەکاتی سـتەمیانا خـوا لـەناویان ئـەبا، بۆیـە بێـژراوە ئاسایش و ئاشتی و سامان پایەدارئەبێ لـەگەڵ بێ بـاوەڕیدا و بـەردەم نـابن لـەگـەڵ سـتەم کردن لـە هاونیشــتمانان. لـەخزمـەت خـوادا چاکەکـەر و خراپەکـەر وەك یـەك تەماشـا ناکرێن. خوا سزایان نادا ئەگەر سوپاسی خوا بکەین لـەسەر چاکەی خوا.

﴿ وَلَوْ شاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النّاسَ أمَّةً واحِدَةً ﴾ وەئەگــەر پـەروەردگاری تـۆ ئـارەزووی بکردایە هەمو ئادەمیزادێ ئەگێرا بەیەك نەتەوەو لـەسەر یەك ئایینی ڕاست ئەبون و ڕێگەی چاك و خراپی بۆ دیاری ئەکردن. بەلاّم کاری شایستەی خوا وای پێویست کردوە لـەیـەك جوێ بن بەگوێرەی سروشت هەیانبێ باوەڕدار و بێ‌باوەڕ، هەیانبێ زاناو هــەیانبێ نـەزان، هەیانبێ هەژارو ساماندار. هەیانبێ باوەڕدار وبێ‌باوەڕ، هەیانبێ شاری ولادێی، وەك خـوا ئەفەرموێ :

﴿ وَلايَزالُـونَ مُخْتَلِفِيْـنَ إلا مَـنْ رَحِـمَ رَبُّـكَ ﴾ وەئـادەمیزاد لانـاچن جیاوازئــەبن و لـەسەرئایینی جیاواز ئەبن: هەندێکیان لـەسەر ڕاستی ئەبن و هەندێکیان لـەسەر کاری پـوچ

ونزیکە دووکەسیان وەك یەك نەبن ، بەوشێوەیە بەردەوام ئەبن مەگەر کەسێ پەروەردگاری تۆ میهرەبانی لەگلە کردبێ بەهۆی گەورەیی خۆیەوەو پاراستبێتی لەناکۆکی و جیاوازی بنچینەی ئایین و پێك هاتین لەسەر ئایینی ڕاستی .

بەکورتی خوای مەزن بەهیچ جۆرێ زۆرناکا لەئادەمیزاد لەسەر باوەڕهێنان. ئەگەر خوای گەورە ئەو ئارەزویە بکا ئەبێ ئادەمیزاد لەسروشتی خۆی بشۆرێتەوە بەوێنەی ئاژاڵ وجانەوەرانی تریان پیێبکا و بەرپرسیارنەبن بۆ هیچ شتێ. بەلاَم خوای مەزن ئارەزووی وایە ئادەمیزاد جویێ بکاتەوە لەئاژاڵ و بونەوەرانی تر وپلەوپایەی وایان بداتێ لەوپلەو پایە بەرزتر نەبێ و بەوپلەیە ناگەن بەبێ کۆشش و سەربەستی هەر لەبەرئەوەیشە سەربەستی بەخشیوە بەئادەمیزاد و کردونی بەخاوەنی ئەقڵ هەتا پاداشتی هەر شتی خۆیان هەڵی بژێرن بیانداتێ و مرۆڤایەتی خۆیان بخەنەکار. ئەوەی باسمان کرد وەلاَمی ئەوکەسانەیە ئەڵێ: بۆچی خوا ئارەزوو ناکا و خۆزگایە ئارەزوی بکردایە هەتا هەمو بەندەکانی خۆی ڕزگاربکردایە لەجەنگ و ڕق وکینە و ڕەگەزپەرستی وبێباوەڕی و ستەم کردن .

﴿ وَكَذٰلِكَ خَلَقَهُمْ ﴾ وەهەر بۆ ئەو جیاوازیە ئادەمیزاد لەسەرینی پەروەردگاری تۆ دروستی کردوون. هەندێکیان بەزاناو هەندێ تریان بەنەزان، هەندێکیان بەباوەڕدارو هەندێکیان بەبێباوەڕ. بەلاَم ئەوشتانەی لەتواناى خۆیانایە و بۆخۆیانیان هەڵبژارد ئەبێتە حجەی پاداشت و تۆڵە. هەندێ لەزانایان مانای ئەوڕستەیان بەم جۆرە کردووە پەروەردگاری تۆ ئادەمیزادی دروست کردوە بۆ ئەو میهرەبانی وبەزەییە لەگەڵ کردوون هەتا ئەوانیش میهرەبانی لەگەڵ یەکتری بکەن. بێگومان میهرەبانی و بەزەیی خوا هەموشتێ ئەگرێتەوە هەتا دوای ئایینی ڕاست بکەون و بەوڕاستیە هەڵسن .

﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لأَمْلِئَنَ جَهَنَّمَ مِنَ الْجَنَّةِ وَ لنّاسِ أجْمَعِيْنَ ﴾ وەفەرمودەی پەروەردگاری تۆ کۆتایی پێهاتووە کەبەڕاستی من دۆزەخ پڕئەکەم لەجنۆکەو ئادنەمیزاد بەگشتی، چونکە ئەزانم زۆریان باوەڕیان نەهێناوە .

وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَۚ وَجَآءَكَ فِي هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَٰمِلُونَ ﴿١٢١﴾ وَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾

﴿ وَكُلاً نَقُصَ عَلَيْكَ مِنْ اَنْباءِ الرُّسُلِ ﴾ وەئێمە هەمو هەواڵێکمان لەهەواڵی پێغەمەران ئەخوێنینەوە بەسەر تۆدا و بۆت ڕون ئەکەینەوە.

﴿ مانُثَبِتُ بِهِ فُؤادِكَ ﴾ شتێ ڕابگرین و دڵی تۆی پێ بەهێزبکەین بەوشتە، هەتا دڵی تۆ نەکەوێتە جم و جۆڵ و بەو شادمان ببی و ئازارت نەمێنێ و بتوانی پەیامی ئێمە بگەیەنی بەئادەمیزاد.

ئەوەی شایانی باسبێ مێژوو نووسانی پێشوو گرنگیان داوە بەباسی ڕوداوی ڕامیاری بەتەنها. ئەوانەی ئێستا گرنگی ئەدەن بەباسی ئابووری و زانیاری و هونەری و جگەی ئەوانیش بۆ زانینیان. بەڵام قورئانی پیرۆز گرنگی داوە بەو ڕوداوانە بۆ ئەوەی دانیشتوانی پێ ئامۆژگاری بکاو ئەوانیش تەمێ خواربن وڕێگەی بۆ بدۆزنەوە وەك خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿ وَجاءَكَ فِي هَذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكرى لِلْمُؤْمِنِيْنَ ﴾ وەهاتوە بۆلای تۆ لەنێو ئەو هەواڵانەدا ئەوەی ڕاست بێ و ئامۆژگاری کردن و یادکردنەوەیە بۆ باوەڕداران .

﴿ وَقُلْ لِلّذِيْنَ لايُؤمِنُونَ اعْمِلُوا عَلى مَكانَتِكُمْ إنا عـامِلُونَ ﴾ وەتـۆ بلـێ بەكەسـانێكی ئەوتۆ باوەڕناهێنن لەدانیشتوانی مەكەو جگەی مەكە: ئێوە كاربكەن لەسەر ئـەو شـێوەیە وئەو ڕێگەیە ئێوە لەسـەرین لـەبێباوەڕی و ئـازاردانی مـن و هاوڕێكـانم. بەڕاسـتی مـن كارئەكەم و ناوەستم لەسەر گەیاندنی پەیامی خوا بەكردەوەی ئێوە ناخەڵەتێم .

﴿ وَانْتَظِرُوا وَإنّا مُنْتَظِرُونَ ﴾ وەئێوە چاوەڕوان بكەن بـۆ گـۆڕانـێ ئەوكاتـەی شـەیتان بەڵێنی پێداون كە ئێمە بنەبڕ ئەبین. بەڕاستی ئێمە چاوەڕوان ئەكەین بۆ هاتنە خـوارەوەی سزا بۆ سەرتان، هەردوولامان چاوەڕوانی بەسەرهاتی خۆمان ئەكەین. بەیاریدەی خوا ئێمە بەرەو بەهەشت ئەڕۆین و ئێوەیش بۆلای دۆزەخ و سزادانتان .

﴿ وَلِلهِ غَيْـبُ السَّـماواتِ وَالآرْضِ وَإلَيْـهِ يُرْجِـعُ الآمْـرَ كَلّـهُ ﴾ وەبـۆ خوایـە بەتەنـها شاراوەی ئاسمانەكان وزەوی وخـوا ئـەیانزانێ و ئێمـە نایـانزانین، خـوا ئـەزانێ بەوشـتانە لەواندان لەمەوبەر و لەمەوپاش وبۆلای خوا نەگێڕرێنەوە كارەكانی هەردوو جیهان، هیچ شتێ توانای ئەوەنیە لەدەستی خوا دەربچێ .

﴿ فَأعْبُده وَتَوَكَّلْ عَلَيْـهِ وَمـا رَبُّـكَ بِغـافِلٍ عَمـذأ تَعْمَلُـونَ ﴾ دوای تـۆ خـوا بپەرسـتە كەجێگەی گەڕانەوەی هەمو شتێكە تۆ هەرپشت بەخوا ببەستەو هەموو كـارێ هەواڵـەی ئەو بكە هەرخوا بەسە بۆ هەموشتێ، پەروەردگاری تۆ بێ ئاگانیە لەشـتێ ئێـوە ئەیكـەن. كەواتە تۆڵەئەسـێنێ لـەخراپ كـاران و پاداشـتی چاكەكـەران ئەداتـەوە، هـەردوولایان بەگوێرەی كردەوەی خۆیان، دوایی هاوار بۆ ئەوكەسانە بێئاگـان و تـەمێ خـوار نـابن و كاتی خۆیان بەفیڕۆ ئەدەن، لەخوا داوائەكەین بمان پارێزێ لەخەفەت و پەشـیمان بونـەوە بكا بەبەشمان .

خوایە لەگوناهی خۆم و باوك و دایكم خۆشببی و ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانم
لێوەربگری و یاریدەم بدەی لەسەر وەرگرتنی ئایینی ئیسلام و
هاوڕێی دڵسۆزم فاتمەی خێزانم ڕزگاربكەی لەنەخۆشی .
(٦) مانگی ڕەمەزان ساڵی ١٤٢٠ بەرانبەر ١٤/ ١٢/ ١٩٩٩ زایینی .

# ﴿ سورەتی یوسوف ﴾

ئەو سورەتە لەمەکە هاتوەتە خوارەوە. ژمـارەی ئایەتـەکانی (١١١) ئایـەتن. هـەندێ لەزانایان ئەلێن: جگە لەئایەتی ( ١-٢-٣-١١ ) لـە مەدینـە هاتونەتـە خـوارەوە. دوای ئەوەی خوای مەزن کۆتایی بە سورەتی هود هێنـا بەباسـی پێغەمـەران. لـەم سورەتەیشـدا باسی هەواڵ و بەسەرهاتی یوسوف وبراکانی ئەکا بە شیرینترین هەواڵ و ئەفەرموێ:




( بسم الله الرحمن الرحيم )

## به ناوی خوای گەورەو میهرەبان

﴿ الرا﴾ مانای ئەو پیتانە لەسورەتە پێشوەکاندا وەك سورەتی ئەلبەقەرەو سـورەتەکانی تر باسیان کراوە .

﴿ تِلْكَ آياتُ الْكِتابِ الْمُبِيْنِ﴾ ئەوئایەتانەی پێك هـاتوون لـەو پیتانـە و پـەك خـەری ئەوکەسانەن دژی تۆن، ئایەتـەکانی نامەیـەکن مانایـەکی ڕونیـان هەیـەو ماناکانیـان لای عەرەبـەکان ئاشـکرایەو پـەکیان ئـەخا و نـاتوانن وێنـەی دابنێـن و کـەچی لـەو پیتانـە دروستبوون هۆنراوە و پەخشانی خۆیانیان پێ دائەنێن، ئەونامەیەش بریتیە لە قورئانی پیرۆز هەموو گیروگرفتێ لەناو ئەباو هەموو دەستوری ئادەمیزادی تیا ڕون کراوەتەوە .

﴿ إنا أنْزَلْنا قُرآناً عَرَبِيّاً لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ بەڕاستی ئەونامەیەمان ناردوەتـە خـوارەوە بـۆ لای تۆ لـەکاتێکا قورئانێکە بەزمانی عەرەبیە بۆ ئەوەی ئێوە گەورەیی قورئان بزانـن و لـە ماناکەی بگەن و کاری پێ بکەن. کەواتە بڕو بیانووتان نامێنێ.

پرسیار/ بەڕاستی موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ نێرراوە بۆ هەموو ئادەمیزاد وەك لەئایەتی (٢٨) ی سورەتی سەبەئدا زانراوە، ناردنەخوارەوەی قورئان بەزمانی عەرەبی وانیشان ئەدا موحەمەد بەتایبەتی بۆ عەرەب نێرراوە. نەك بۆ جگەی عەرەب، دوایـی ڕێگەیـە بـۆ کۆکردنـەوەی ئایەتەکان چ شتێکە ؟

وەڵام/ ١- بەراستی ناردنە خوارەوەی قورئان بەزمانی عەرەبی ئەوە ناگەیەنێ عـەرەب بەتەنها داوای فەرمان و وانەکانی قورئانیان لێ داوا بکرێ، چونکە باوەڕداران بەو قورئانە بڕوایان بە تەورات و ئینجیل هەیە کەچی زمانەکانیان جگەی زمـانی قورئـانن و پێویستە باوەڕیان پێبکەین .

٢- زمان ڕێگەیە بۆلای مەبەست، مانا و ناوەڕۆك مەبەستە نەك ڕێگە، ناگونجێ مانـاو ناوەڕۆك وەك زمان هەربۆ گەلێ بێ نەك بۆگەلێ تر، ئەوەی ئـادەمیزاد نرخـی بـۆ دابنـێ چ هەموو ئادەمیزاد باوەڕی پێ ئەهێنی، هەمووگەلێ ژمارەیان زۆرئەبێ بەزۆری ژمارەی زمان. بەڵام ماناو ناوەڕۆکی زمان بۆ هەمویانە. نەك بەتەنها بۆ گەلێك و بۆ ڕەگەزێ .

٣- ئەگەر پێغەمەر ڕەوانە نەکرێ بەزمانی گەلـەکەی خۆی ئەی بەچ زمانێ گفوگۆیان لەگەڵ بکا؟ چونکە زمانێ دەست ناکەوێ هەمووگەلێ ئەوزمانە بزانێ .

﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أحْسَـنَ الْقِصَـصِ بِمـا أوْحَيْنـا إلَيْـكَ هَـذا الْقُـرآنَ ﴾ ئێمـە ڕوون ئەکەینەوە و ئەی خوێنینەوە بەسەر تۆدا چاکترین وشیرین تریـن هـەواڵ و چـیرۆك لـەنێو ئەوهەوالآنەدا لەنێو قورئانی پیرۆزدان، چونکە لەوچیرۆکەدا هەیە تـەمێ کـردن و باسـی کاری شایستەو شیاوی زۆر: وێنەی بێ بەزەیی براکانی یوسف وداوێن پاکی ومانـاکردنی خەوەکان وشتی تریش بە هۆی ئەم قورئانەوە ئێمە بەسروش ناردومانە بۆلای تۆ.

﴿ وَإِنْ كُنتَ مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الْغافِلِيْنَ ﴾ وەبەڕاستی بەرلەهاتنە خوارەوەی ئەوسروشە و ئەم سورەتە تۆ لەکەسانە بوی بێ ئاگابوون لەوهەوالانە ; چونکە ئەو هەوالانە پەیدابوون بەرلە هاتنەخوارەوەی ئەم سورەتە بە چەندین چاخێك . زانین و زانیاری پێغەمەران لەپێش بوونیان بەپێغەمەر و دووای بونیان بەپێغەمەر بەراوردناکرێن لەگەڵ یەکتری . زۆر ڕونە زانیاری پێغەمەر یەك جار زۆرترە لە ماوەی بەرلە پێغەمەرایەتی زانیوەتی .

إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾ قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا۟ لَكَ كَيْدًا ۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦﴾

﴿إِذْ قالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ ياأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَعَشَرَ كَوْكَباً وَ الْشَمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي ساجِدِيْنَ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە کە یوسف بەباوکی خۆی ووت: ئەی باوکی مـن: لەخەوما بینیم یازدە ئەستێرە و، بینیم مانگ و خۆر سوژدەیان برد بـۆ مـن و ڕێزیـان لێ ئەگرتم زۆر بەشەرمەوە .

زانایان بۆ تەمەنی یوسف و لەکاتی بینینی ئەوخەوەدا بیریـان جیـاوازە ئـەوەی شـایانی باسبێ تەمەنی هەر چەندە بوبێ گرنگ نیە. بەڵام تازەپێگەیشتووی ژیـرو ڕێـك وپێـك و

شۆخ و دەم وچاوشیرین و هەڵکەوتوو بوە. زنایان مانای ئەو خەوەیان داوەتەوە بەوەی یازدە ئەستێرەکە بریتین لە یازدە براکانی و خۆر بریتیە لەدایکی ومانگ بریتیە لە باوکی . هەندێ لەزانایان لایان وایە دایکی بوسوف بەرلەبینینی ئەوخەوەکۆچی دوایی کردووە، لەپاشا باوکی خوشکی دایکی یوسفی هێناوە، کەواتە دایك بریتیە لە پوری یوسف .

باوکی یوسوف بەهۆی ئەوخەوەوە زانی کە یوسوف پاشەڕۆژێکی گەورەی هەیە و ترسا براکانی پیلانێکی بۆ دروست بکەن و لەناوی ببەن، بۆیە خوا لە زمانی باوکییەوە ئەفەرموێ :

﴿ قالَ یابُنَیَّ لاتَقْصص رُؤیاكَ عَلَی إِخْوَتِكَ فَیَكِیْدُوا لَكَ كَیْداً إنَ الْشَیْطانَ لِلاْنْسانِ عَدُوٌّ مُبِیْنٌ ﴾ باوکی ووتی: ئەی کوڕی من: ئەو خەوەی خۆت مەگێڕەوە بەسەر براکانتا و ماناکەی بزانن، دوایی ئەوان پیلانێ بۆ تۆ بخەنەکار بە پیلانێکی زۆر گەورە و تۆی تیدا بچیێ، من وائەزانم تۆیان خۆشناوێ لەبەی جۆرێ ئەوەدان داوێکت بۆ دابنێن و فێڵت لێ بکەن. بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئادەمیزاد، هەرلەکۆنەوە و لەکاتی ئادەمدا، ئەخاتە دڵی براکانتەوە و هانیان ئەدا بۆ لەناوبردنت .

﴿ وَكَذَلِكَ یجْتَبِیكَ رَبُّكَ وَیُعَلِمُكَ مِنْ تَأوِیلِ الأَحادِیْثَ ﴾ وەهەر بەوجۆرەی خوا تۆی هەڵبژارد بۆ بینینی ئەو خەوە پەروەردگاری تۆ هەڵت ئەبژێرێ بۆ پێغەمەرایەتی و پاشایەتی و فێری تۆی ئەکا مانا لێ دانەوەی چەندین خەو کەکەس نایانزانێ و یوسوف زاناترین کەس بووە بۆ ماناکردنی خەو.

﴿ وَیُتِّمُ نِعْمَتِهِ عَلَیْكَ وَعلی آلِ یَعْقُوبَ ﴾ وە پەروەردگار چاکەی خۆی تەواو ئەکا بەسەر تۆدا بە پێغەمەرایەتی و بەسەر خێزانەکانی یەعقوبا بەبراکانیشتەوە و بەنەوەی خێزانەکانیانەوە .

﴿ كَمّا أتَمَّها عَلَی أبَوَیْكَ مِن قَبْلُ إِبْراهیْمَ وَإِسْحاقَ ﴾ هەروەك تەواوی کرد چاکەی خۆی بەسەر باوکەکانتا بەرلە تۆ ئیبراهیم و ئیسحاق، چاکە خوا نایەنە ژمارەوە لە هەموویان گەورەتر پێغەمەرایەتیە .

﴿ إنَ رَبَّكَ عَلَیْمٌ حَكِیْمٌ ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری تۆ ئەزانێ چ کەسێ هەڵئەبژێرێ لە نێو ئادەمیزادا بۆ فروستادەی هەمو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ و هەر شتێ ئارەزووی بکا ئەیکا .

ئـادەمیزاد وەك بۆمـان ڕوون ئەبێتـەوە خزمـەتکارو سەرشـۆڕی ئـەم سـێ شـتانەی خوارەوەیە، هەموو تواناو کۆششی خۆیان بەکاردێنن بۆ پەیداکردنی ئەوسێشتە :

١- هەوڵ ئەدەن بۆ بەدەست هێنانی خۆشی تایبەتی خۆیان و بۆ دوورخستنەوەی ئازار لەخۆیان. ئەم بەشەیان بەرزترینی ئاواتی ئادەمیزادە، لەپێناوی ئەم بەشەدا دەست لەکـەس و کارو هەموشتێ هەڵئەگرێ هەر بۆخۆی .

٢- خزمایەتیە: ئادەمیزاد هەوڵئەدەن بـۆ پاراسـتنی خزمایـەتی و بەرزبزنـەوەی پلـەو پایەیان. بەلاّم ئەگەر خزمایەتی خۆشـی و سـوودی تایبـەتی خۆیانیـان بـۆ نەڕەخسـێنێ و ئازاریان لێ دوور نەخاتـەوە ڕێـزی خزمایـەتی لایـان کـەم ئەبێتـەوە، کەواتـە پاراسـتن و خۆشەویستی خزمایەتی بە ئەندازەی زۆری و کەمی پاراسـتنی خزمایەتیـە بۆیـان، ئەگـەر کەسێ خزمێکی لـە دەست دەرچێ خەفەت و ئازاری ئەوکەسە بە ئەندازەی چاکەی ئـەو خزمەیە بۆ ئەوکەسە، ئەگەر ئەوخزمە چاکـەی لـەگـەڵ ئەوکەسـە نـەکردبێ وەك بێگانـە تەماشای ئەکا ، ئادەمیزاد واز لـە نزیکترین کـەس ئـەهێنێ بـۆ سـوودی تایبـەتی خۆیـان، دوورترین بێگانە لای ئادەمیزاد لـە نزیکترین خزم بەڕێزترە بەو مەرجەی چاکـەی جیـهانی ئەو بێگانە لـەگەڵیان زۆرتر بێ. کەواتە خزم کاتێ بەڕێزە واز لـە چاکەی خۆی بهێنێ. بـۆ نموونە قابیل هابیلی برای دایك و باوکی خۆی کوشت. کوڕانی یەعقوب یوسـوفی بـرای خۆیانینا فڕێ دایە قولاّیی وتاریکی چاڵەوە. زۆرجاران دایك کوری منالّی جگەرگۆشەی خۆی کوشتوە لەبەرئەوەی لـەگەڵ دۆستەکەی ڕابوێرێ. وایش بووە کـوڕ بـاوکی خـۆی کوشتوە لـە بەرئەوەی دارایی باوکەکـەی بخوا، چـەندترین کـاری ناهـەمواری وەك ئـەو پێشووانەی ڕووی داوە .

٣- ئادەمیزاد هەوڵ ئەدەن بۆ خۆشی وسوودی کۆمەڵ و هاونیشـتیمان و مرۆڤایـەتی بەبێ جیاوازی، بۆ بەدەست هێنانی ئەم بەشەیان لـەیەکێکەوە پەیدا ئەبێ ئاین پەروەر ولـە خوا ترس بێ یا خاوەنی هەستی نیشتمان پەروەری بن. بەئەندازەیە هۆشیارو پاك و خـاوێن و دڵپاکن کە سوودی گشتی لایان بەڕێزترە لـە سوودی خۆیان و ئازاری گشتی بەئازاری

خۆی ئەزانیٚ، دادپەروەری لایان لە هەمووشتیٚ چاکترە. بەلاٚم مەردمانی ناپاك و لـە خـوا نەترس هەر سوودو ژیانی خۆی لا مەبەستە، ئیتر هـەموو دانیشـتوان بـۆ مەبەسـتی خـۆی بکوژیٚ لای گرنگ نیە، چاکترین بەڵگە کردەوەی نـاڕەوای براکـانی یوسـوفە لـە گـەڵ یوسوف هەر لـەبەرئەوەی باوکیان ئەوانی خۆشبویٚ، بەلاٚم بـەئاواتی خۆیـان نەگەیشـتن و بون بەجیٚگەی خەشمی خواو باوکیان، یوسوف ڕیٚز و گەورەیی دەست کەوت وبراکانی بە سەرشۆڕی لە بەردەمیا ڕاوەستان و دانیان بەتاوانی خۆیانا و داوای لیٚ بوردنیان کرد .

براکانی یوسوف کەوتنە دڵ پیسی و پـیلان سـازان بـۆ یوسـوف لەبـەر چـاوچنۆکی خۆیان، بۆ ئەو مەبەستە کەوتنە داو دانان بۆی. نەیان ئەزانیٚ یوسوف چۆن لـەناو بـەن و لەبەرچاوی باوکیان نەمیٚنیٚ، هەندیٚکیان ئەیان ووت: بـا بیکوژیـن، هـەندیٚ تریـان ئـەیان ووت: لـە شوێنیٚکی چۆلاٚ بەڕەلاٚی بکەین و سەر بۆ هیچ جیٚگەیە دەرنەکا، هەندیٚ تریـان بەشیٚوەیە تر، هەتا ئەوکاتە بردیانــە دەرەوە لـە ئـەنجامدا هـەموویان بڕیـاندا بیخەنـە نیٚـو چاڵەوە، خوای گەورە بەجۆریٚکی کورت ئەوباسەمان بۆ ئەکا، ئەفەرمویٚ :

لَّقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿٧﴾ إِذْ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ ٱقْتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَٰلِحِينَ ﴿٩﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿١٠﴾ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۫نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ

لَنَٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ قَالَ إِنِّي لَيَحۡزُنُنِيٓ أَن تَذۡهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأۡكُلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَأَنتُمۡ عَنۡهُ غَٰفِلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ لَئِنۡ أَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّآ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ﴿١٤﴾ فَلَمَّا ذَهَبُواْ بِهِۦ وَأَجۡمَعُوٓاْ أَن يَجۡعَلُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمۡرِهِمۡ هَٰذَا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١٥﴾

﴿ لَقَدْ كانَ في يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِ آياتٍ لِلْسائِلِيْنَ ﴾ بەڕاستی هەیە لە چیرۆك و هەواڵی بەسەرهاتی یوسوف و براكانی چەندین بەڵگە لەسەر توانا و زانیاری و كاری شایستەی خوا بۆ ئەو كەسانە پرسیاربكەن وبیانەوێ لە ناوەڕۆكی ڕاستەقینەی باسەكە بگەن و تەماشای چۆنیەتی دارِژاندنی باسەكە بكەن و تەمێ خوار بن. زانایان ئەڵێن: ئەوكەسانەی پرسیاریان كرد جووەكان بوون .ووتیان بەعەرەبەكان پرسیاربكەن لە موحەمەد: هۆی گواستنەوەی یەعقوب و منداڵەكانی چ شتی بو لە زەوی كەنعانەوە بۆ شاری میسر؟ كاتێ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ باسەكەی بۆ هاتە خوارەوە هەموو لایەكیان سەریان سوڕما چۆن موحەمەد ئەوباسەی زانی، چونكە ئەو جۆرە كارانە لەتوانای ئادەمیزادا نیە كەئەو مرۆڤە نە نامەیەكی خوێندوەتەوە و نە هاوڕێیەتی زانایانی كردووە .

بۆ زانین: كوڕانی یەعقوب یوسفی برای خۆیانیان خستە نێو قوڵایی و تاریكی چاڵەوە هەر لەبەرئەوەی باوكی خۆشی ئەوی، قورەیشیەكانیش جەنگیان كرد لەگەڵ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لەبەرئەوەی خوا ڕێزی لێگرت و كردی بەپێغەمەر، ڕێزی دا بەسەر ئەواناو هەمو ئادەمیزادا لەگەڵ ئەوەیشدا پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ برای ئەوان بو، خوای مەزن یوسوفیشی

سەرخست بەسەر براکانیدا، هەروایش پێغەمەری سەرخست بەسەر قورەیشیەکاندا، لەوکارانەدایە ئامۆژگاری و تەمێ کردن بۆ ئەوکەسانە لە ڕاستی بگەن.

﴿ إِذْ قَالُوا لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَى أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ ﴾ تۆ بیری ئەوکاتە بکەرەوە کەکوڕانی یەعقوب ووتیان کە بەڕاستی یوسوف و براکەی کە بینامینە خۆشەویست ترن لە ئێمە لای باوکمان و، ئێمە کۆمەڵێکی بەتوانا و ئیشکەرین و لە ئەمەنیشسا لەوان گەورەترین و سوودمان زۆرترە لەوان، ئەوان منالّ و بێدەسەڵاتن و بێ هێزن، کەواتە پێویستە باوکمان ڕێزی ئێمە بدا بەسەر ئەواندا.

﴿ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ ﴾ بەڕاستی باوکی ئێمە لە نێو ستەم و گومڕایی دایە بەئاشکرا کە ئەوانی لە ئێمە خۆشتر بوێ، بەو جۆرەی پێویستە باوکمان مافی باوکایەتی خۆی بەڕێوە نابا لە نێو خێزانەکانیدا. یوسوف و بینامینی برای لە ژنی دووهەم بوە ناوی ڕاحیل بوە، زۆر جاران دایك جیاوازی ئەبێتە هۆی ڕق و کینە لە نێو خێزانێکا. لە ئەنجامدا براکانی یوسوف پێك هاتن و ووتیان:

﴿ اقْتُلُوا يُوسُفَ أَوِ اطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ ﴾ ئێوە یوسوف بکوژن یا فڕەی بدەنە زەوییەکی چۆڵی و لە ئاوەدانیەوە دووربێ و چۆڵ و بێخواردەمەنی بێت و نەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ لای ئاوەدانی، ئەوکاتە پوختە ئەبێت ڕوی باوکتان بۆ ئێوە بە تەنها و مەیل بەلای جگەی ئێوە ناکاو واز لە خۆشەویستی یوسوف ئەهێنێ و لە بیری نامێنێ.

﴿ وَتَكُونُوا مِنْ بَعْدِهِ قَوْمًا صَالِحِينَ ﴾ وە ئێوە لە دوای کردنی ئەوکارە و دوای نەمانی یوسوف ببن بەتاقمێ پەشیمان ببنەوە لەو تاوانە و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، باوکتان ئاشت بکەنەوە بەهەر بیانوێ بۆتان ئامادە ئەکرێ و کاری جیهانتان بە باشی ئەڕوا بەڕێوە.

﴿ قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ لَا تَقْتُلُوا يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَابَتِ الْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ السَّيَّارَةِ ﴾ ووتە بێژێ لەبراکانی یوسوف ووتی: ئێوە یوسوف مەکوژن، چونکە کوشتنی بێ گوناهان تاوانێکی گەورەیە و فڕەی بدەنە نێو قولایی خوارەوە و تاریکی ئەوبیرە و ئەوچاڵەوە هەڵی ئەگرن هەندێ لە هاتوچۆکەران و ڕێبواران کە ئەگەنە لای ئەوبیرە و ئەو چاڵە، ئەی بەن بۆ ووڵاتی خۆیان و ئێوەیش بەئاواتی خۆتان ئەگەن.

﴿ إنْ كُنتُمْ فـاعِلِينَ ﴾ ئەگـەر ئەتانـەوێ ئـەوكارە بكـەن لـەگـەڵ یوسـوف و دووری ئەخەنەوە لەباوكی .

زانایان ئەڵێن: ئەوكەسەی ئەو ئامۆژگاری‌یەی كردن كە یوسوف نەكوژن بەهوزا بـو، هەندێ‌تریان ئەڵێن ڕۆبیلی پورزای یوسوف بو كـە تەمـەنی لـە هـەموویان گـەورەتر بـو مرۆڤێكی ژیربوو.

دوایی براكانی پێك هاتن بچن بۆلای باوكیان بەهەر فێڵ و تەڵەكەیە بێ بۆیـان بلـوێ یوسوفیان لەگەڵ بنێرێ بۆ سەیران و لە دەرەوە لەناوی ببەن و چونە لای .

﴿ قَالُوا يأبَانا مالَكَ لاُتَأمَنَّا عَلى يُوسُفَ وَإنا لَهُ لَناصِحُونَ ﴾ براكانی یوسوف ووتیان : ئەی باوكی ئێمە چ شتێكە بۆ تۆ ترست لە ئێمە هەیە لەسەر پاراسـتنی یوسـوف و ،ئێمـە دڵسۆزی یوسوفین وئەیپارێزین .

﴿ أرْسِلْهُ مَعَنا غَدَاً يُرتَعْ وَيَلْعَبْ وَإنا لَهُ لَحـافِظُونَ ﴾ تـۆ بـەیانی یوسـوف ڕەوانـە بكـە لەگەڵ ئێمە بەخۆشی ڕابوێرێ‌و میوەجـاتی دەرەوە بخـوا و یـاری بكـا وەك منـاڵانی تـر و پێشبڕكێ بكاو، ئێمە بەڕاستی ئەیپارێزین لـــە ئـازارو كارەسـاتی تـر، ئـەو هـەموو درۆ و دەلەسەیان دروست كرد لەبەرئەوەی ئەیانزانی باوكیان یوسوفی خۆش ئەوێ .

﴿ قالَ لَيُحزِنُنِيْ أنْ تَذهَبُوا بِهِ ﴾ یەعقوب ووتی: بەڕاستی من خەفەتبار ئـەكا كـە ئێـوە یوسوف ببەن و لـەبەرچاوم نەمێنێ و ئارامم لێ ببڕێ .

﴿ وَأخافُ أنْ تَأكُلَهُ الذِئْبُ وَأنْتُمْ عَنْهُ غافِلُونَ ﴾ وە من ئەترسم كـە گـورگ یوسـوف بخوا و ئێوە لەوكاتەدا بـێ ئاگـابن بـەهۆی یـاری كردنتانـەوە و سـەرقاڵی بـەخێوكردنی ئاژاڵەكانتان بن و جگەی ئەوانەیش .

﴿ قَالُوا لَئِنْ أكَلَهُ الْذِئْبُ وَنَحنُ عُصْبَةٌ إنَا إذَاً لَخاسِرُونَ ﴾ كوڕانی یـەعقوب ووتیـان : ئەگەر گورگ بیخوا وە ئێمە كۆمەڵێكی زۆر بەهێزین لەبەردەم شێردا ئەوەستین بەڕاسـتی لەوكاتەدا ئێمە زۆر لاوازو زیانۆمەندین و توانای پاراستنی خۆمانمان نابێ و شایانی ئەوەین لەناوبچین و نرخێكمان بۆ دانەنرێ .

﴿ فَلَمَّا ذَهَبُوا بِهِ ﴾ دوایی کاتێ براکانی یوسوفیان برد بۆ دەرەوە، یوسوفیان لەسەر زەوی ڕاکێشاو دەستیان کرد بەلێدانی، پەند و ئامۆژگاری باوکیان فڕەدایە پشتیان. یوسوفیش لەوان ئەپاڕایەوە، سەرزەنشتی یوسوفیان ئەکرد وئەیان ووت: درۆزن یازدە ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ سوژدەت بۆ ئەبەن، چەندین گفتوگۆی دڵ تەزێنی تریشیان پێ ئەووت. لاڵانەوەی یوسوف کاری تێ نەئەکردن .

﴿ وَأَجْمَعُوا أَنْ يَجْعَلُوهُ فِي غَيَابَةِ الْجُبِّ ﴾ وە براکانی یوسوف پێك هاتن بەگشتی کە یوسوف بخەنە نێو تارکی بیرەکەوە کە لە کەنعانەوە ئەندازەی کات ژمێرێ دووربو، کاری خۆیان بەجێ هێناو یوسوفیان خستە نێو چاڵەوە، وایان ئەزانی بەئاواتی خۆیان ئەگەن، بەڵام یوسوف لەنێو ئەوچاڵەدا خۆی دایە دەست خوا، خوایش ئارامی خستە نێو دەروونی و لە هەموو ئازارو ناخۆشە پاراستی .

﴿ وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُمْ بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾ وەئێمە نیگاو سروشمان نارد بۆ لای یوسوف بەهۆی جبرەئیلەوە بەڕاستی تۆ هەواڵ ئەدەی بەبراکانت بەم کارەی ئەوان لەگەڵ تۆی ئەکەن و ئازاری تۆ ئەدەن، ئەوان تۆ ئەبینن ئەبی بەخاوەنی پلەو پایەی بەرز لەپاش ڕزگار بونت لەم چاڵە وترس و خەفەتت نامێنێ و براکانت هەستی پێ ناکەن کە ئێمە سروش ونیگا ئەنێرین بۆلای تۆو نازانن پلەو پایەی بەرز ئەدەین بە تۆ و براکانت بەسەرشۆڕی لەمەوپاش لە بەردەم تۆدا ئەوەستن .

بۆ ئاگاداری: بەبۆنەی باس کردنی کوڕانی یەعقوبەوە بەراووردێ باس ئەکەین دەربارەی کوڕانی ئەم سەردەمە بەم جۆرە: کوڕانی یەعقوب ئەیان ووت: باوکمان ستەم کارو گومڕایە، خێزان و منداڵی ئەم سەردەمەیش دەقی گفتوگۆی کوڕانی یەعقوب لەگەڵ باوکیانا بەکار ئەهێنن ئەڵێن: باوکمان خەڵەفاوە، هەر لەبەرئەوەی ئامۆژگارییان ئەکا بەجۆرێ لەگەڵ ویست و ئارەزووی ئەوان نەبێ، چونکە مامۆستا درۆزنەکانیان ئەو کارەی بردوەتە مێشکیانەوە. کوڕانی یەعقوب ئەیان ووت: یوسوف بکوژن یا بەرەڵای بکەن لەزەوی چۆڵ و بێ ئاوا. کوڕانی ئەم سەردەمەیش درۆو دەلەسە ئەسازێنن بۆ باوك

ماممۆستا دڵسۆزەکانیان و بەدەیان بوختانیان ئەدەنە پاڵیان و ئەڵێن: باوك و مامۆستاکانمان سەربەستیمان لێ زەوت ئەکەن، هەر لەبەرئەوەی هاورێ شەیتانەکانیان ڕویان بۆلایان بێو کردەوەی خراپ و بێ ڕەوشتیان پێبکەن. کورانی یەعقوب بەکراسی خوێناوی یوسوفەوە چونەوە بۆ لای باوکیان، کوڕانی ئەم سەردەمەیش بەیێووچان پڕوپاگەندەو ووتەی هەڵبەستراو ئاراستەی باوکیان ئەکەن وئەڵێن: باووکمان بەکرێگیراو کۆ نەپەرستە، هەر لەبەرئەوەی بۆیان بلوێ کەمێك ئاگری ئاژاڵی خۆیان سارد بکەنەوە. کوڕانی یەعقوب شەوێ بەگریانەوە هاتنەوە بۆ لای باوکیان بە فرمێسکی دەست کردەوەو بە گفتوگۆی درۆی هەڵبەستراو، ئەوەی ئازار لەدڵی باوکیان دەربکەن و بڕوایان پێبکا کوڕانی ئەم سەردەمەیش لە بەردەم باوکییانا درۆ بەکار دێنن و بەدەیان سوێندی درۆینەی بۆ ئەخۆن هەتا سەر لە باوکیان تێك بدەن لەبەرئەوەی ئارەزووی خراپی خۆیان بەدەست بهێنن و وایش ئەبێ دەست نوێژو نوێژ ئەکەن لەبەردەم باوکیانا. لە دوای فڕەدانی یوسوف بۆ قولایی و تاریکی ئەوچاڵە بەو هەمو ئازارو بێبەزەییە کردیان لەگەڵ یوسوف خوا ئەفەرموێ :

وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ عِشَآءٗ يَبۡكُونَ ﴿١٦﴾ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبۡنَا نَسۡتَبِقُ وَتَرَكۡنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٖ كَذِبٖۚ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ فَأَرۡسَلُواْ

وَارِدَهُمْ فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُۥ قَالَ يَٰبُشْرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٌ وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةً وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾

﴿ وَجاءُوا إلى أبيهِمْ عِشاءً يَبْكُونَ قالُوا ياأبانا إنّا ذَهَبْنا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنا يُوسُفَ عِنْدَ مَتاعِنا فَأَكَلَهُ الْذِئْبُ ﴾ وە کورانی یەعقوب شەوێ هاتنەوە بۆ لای باوکیان بـەدرۆ ئـەگریان بـۆ داپۆشینی تاوانەکەیان ووتیان: ئەی باوکی ئێمە: ئێمە ڕۆیشتین بۆ دەشت یـاری بکـەین و یوسوفمان بەجێ هێشت لای کـەل وپـەل وخواردەمەنیـەکانمان دوایـی گـورگ یوسـوفی خواردبو .

﴿ وَماأنْتَ بِمُؤمِنٍ وَلَوْكُنّا صادِقِيْنَ ﴾ وەتـۆ بـاوەڕ بەئێمـە ناکـەی و ، بـاوەکو ئێمـە ڕاست بکەین و جێگەی بـاوەڕ بـین لـەبەرئـەوەی تـۆ یوسـوفت زۆر خـۆش ئـەوێ بـڕوا بەگفتوگۆی ئێمە ناکــەی. ئێمـە بەڵگـەمان بەدەسـتەوەیە کەڕاسـت ئەکـەین، وەك ئـەم کراسەی یوسوف .

﴿ وَجاءُوا عَلَى قَمِيْصِهِ بِدَمٍ كَذِبٍ ﴾ وەچونـەوە بـۆلای باوکیـان و دابویـان بەسـەر کراسەکەیا خوێنێکی درۆینەی جگەی خوێنی یوسوف، یەعقوب کراسەکەی بینی نەدڕابو دڵی کەوتە خورپە ووتی: زۆر جێگەی سەرسوڕمانە چۆن ئەو گورگە یوسوفی خواردووە وکراسەکەی نەدڕاندوە، بۆیە .

﴿ قالَ سَوَّلَتْ لَكُمْ أنْفُسَكُمْ أمْراً فَصَبْرٌ جَميلٌ ﴾ یەعقوب ووتی : بەڵکو ئێوە خۆتان بۆ خۆتان کارێکتان ڕازاندوەتەوە و درۆئەکەن ، دوایی ئارام گرتن چاکترە و جوانترە هانـای خۆم نابەم بۆلای جگەی خوا .

﴿ وَاللهُ الْمُستَعانُ عَلَى ماتَصِفُونَ ﴾ وەخوا کۆمەکی پیٚکراوە و داوای یارمەتی لەو ئەکەم لەسەر شتیٚ ئێوە باسی ئەکەن، ئەوبارە ئێوە داوتانە بەسەر مندا زۆرگرانە خوا نەبیٚ کەس لای نابا لەسەر من .

﴿ وجاءَتْ سَيّارَةٌ فَأرْسَلُوا وارِدَهُمْ ﴾ وە تاقمیٚ لە ڕێبواران و هاتوچۆکەران لە مەدینە وە ئەچوون بۆ میسر دوایی سەرگەردان بوون وڕێگەیان لیٚ تێک چوو ئەگەڕان بەزەویدا هەتا کەوتنە جێگەیە نزیکی ئەو بیرە بوو کە یوسوفی تێدا بو دابەزین، دوایی ئاوکێشەکەیان بۆ پەیداکردنی ئاو توشی بو بەو بیرەوە کە یوسوفی تێدابوو، ئاوکێشەکە ڕۆیشت .

﴿ فَأدْلَى دَلْوَهُ ﴾ دوایی ڕەوانەی کرد بۆ نێو بیرەکە دۆڵچەکەی هەتا ئاوی لیٚ هەڵگۆزیٚ کەدۆڵچەکە گەیشتە لای یوسوف خۆی هەڵواسی بەدۆڵچەکەدا ئەویش ڕای کێشاو نەی ئەتوانی بیباتە سەرەوە چاوی کەوت بەکوڕێکی تازە پیٚگەیشتوی زۆر شۆخ و جوان دەستی گرتووە بەگوریسی دۆڵچەکە .

﴿ وقالَ يابُشرى هذا غُلامٌ ﴾ وەئاوکێشەکە ووتی بەهاوڕێکانی: ئێوە موژدە بدەن ئەمە کوڕێکە زۆر جوانە هەمویان شادمانیان دەربڕشی بۆ دۆزینەوەی ئەو کوڕە .

﴿ وَ اسَرّوه بِضاعَةً وَ اللهُ عَلِيمٌ بِما يَعْمَلُونَ ﴾ وە کاروانەکە یوسوفیان شاردەوە لەبەرئەوەی کەس و کاری پیٚ نەزانن و داوای بکەن، کردیان بەبەندە و دەست مایە لە نێو کالاٚی بازرگانیدا و خستیانە نێو کەل وپەلی بازرگانیەوە هەتا لە دواییدا بیفرۆشن و قازانجی لیٚ بکەن و، خوا ئەزانیٚ بەشتیٚ براکانی یوسوف کردیان بە یوسوف و بەو شتەیش ئەو کاروانیان لەگەڵ یوسوفیان کردو شاردیانەوە و کردیان بەبەندە و کەچی سەربەست بووەوە .

﴿ وَشَرَوهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَراهِمَ مَعْدُودةٍ وَكانُوا فِيهِ مِنَ الزاهدِينَ ﴾ وەکاروانیەکانیان یوسوفیان فرۆشت بە عەزیزی میسر بە نرخێکی کەم کە چەند دراوێکی کەم و دیاری کراوبوو، ئەو کەسانە یوسوفیان فرۆشت لە فرۆشتنیا خۆیان نەگرت بەو نرخەکەمە

شادمان بون و پەلەیان کرد لە فرۆشتنیا نەوەك توشی چەرمەسەری ببن و گومانیان لێ پەیدا بکرێ، بۆیە چاوەڕوانیان نەکرد هەتا بەنرخی زۆر بیفرۆشن، لە کاتی ڕاگرتنی یوسوف لە مەزات خانەی میسردا عەزیزی میسر کڕی. ئەو ووشەیە نازناوی شالیاری دارایی و بڕوا پێکراوی پاشای میسر بوو .

وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشۡتَرَىٰهُ مِن مِّصۡرَ لِٱمۡرَأَتِهِۦٓ أَكۡرِمِى مَثۡوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗاۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلۡأَرۡضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِى ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٢٢﴾

﴿ وَقالَ الّذي اشتَراهُ مِنْ مَصْرِ لِاَمرأتِهِ أكْرِمـي مَثْـواهُ ﴾ وەکەسێکی ئەوتۆ یوسوفی کڕیبوو لەمیسر ووتی بەژنەکەی خۆی تۆ ڕێزی دانیشتنی یوسوف بگرە، بەشیرینی لەگەڵیا هەڵسەو جێگەیەکی بەرێزی بۆ تەرخان بکە .

﴿ عَسى أنْ يَنْفَعْنا أو نَتخذ لَهُ وَلَداً﴾ هیوامان وایەکە ئەو کوڕە سوود بگەیەنێ بەئێمە ئەگەر بمانەوێ بیفرۆشین یا بەکاری بهێنین لە ڕاپەڕاندنی کارەکانمان لە پاشەڕۆژدا و کارە پێویستیەکانمان جێ بە جێ بکا، یا ئێمە بیکەین بەکوڕی خۆمان، چونکە ئەوان منداڵیان نەئەبوو، خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَكَذَلَكَ مُكّنا لِيُسُوفَ في الآرْضِ ﴾ وەهەر بەو جۆرەی رزگارمان کرد لەکوشتن و ئێمە دەرمان هێنا لەنێو بیرەکەدا و دڵی عەزیزمان بۆ نەرم کرد ئێمە گێڕامان بۆ یوسوف

پلەو پایەی بەرز لە زەوی میسردا و کردمان بەبروا پێکراوی پاشای میسر لەسەر دارایی و سامانی میسر بەفراوانی خۆشی ڕای ئەبوارد. مەبەستی ئێمە لە ڕزگاری کردنی یوسوف ئەوەبوو کارو فرمانی میسر ببا بەڕێوە بەجۆرێکی داد پەروەری .

﴿ وَلِنُعَلِّمَهُ مِنْ تَأْوِيلِ الآحَادِيثِ ﴾ وەبۆ ئەوەیش ئێمە فێربونی یوسوفی بکەین ڕاستی هەمو کارێ لەمانا لێکدانەوە خەووزانینی فەرمودەکانی خواو پەرەپێدانی ئایینی خواو فەرمانی خوا ببا بەڕێوە بە دادپەروەرانەیی .

﴿ وَاللهُ غالِبُ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَر النّاسِ لايَعْلَمُونَ ﴾ وە خوا خاوەنی توانایە بەسەر جێ بەجێکردنی فەرمانی خۆی و بەکردنی هەمووشتێ و کەس ناتوانێ ڕێگە بگرێ لە ویستی خۆی. ئەوەبوو براکانی یوسوف ئەیان ویست خراپەی لەگەڵدا بکەن، خوا ئەیویست چاکەی لەگەڵ بکا و، بەڵام زۆرتری ئادەمیزاد نازانن خوا توانای هەیە بۆ کردنی هەمووشتێ ویستی هەرشتێ بکا ئەیکا .

﴿ وَلَمّا بَلَغَ أَشُدَّهُ آتَيْناهُ حُكماً وَ عِلْماً ﴾ وە کاتێ یوسوف گەیشت بەتوانای خۆی وئەقڵ و لەشی تەواو بوو تەمەنی لەنێوان سی و چل ساڵدا بوکە ئەو ماوەیە شایستەیە بۆ پێغەمەرایەتی وەرگرتنی سروش ئێمە بەخشیمان بەیوسوف زانستی و دانایی هەمووشتێ لە شوێنی شیاوی خۆیا و زانینی مانای خەوبینین.

زانایان ئەڵێن: حوکم زانینی هەمووشتێکە بەڕاستی و کردنی هەمو شتێ بەو جۆرەی پێویستە بکرێ.

﴿ وَكَذٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴾ وە هەر بەو جۆرەی پاداشتی یوسوفمان دایەوە ئێمە پاداشتی هەموو چاکەکەران ئەدەینەوە .

وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ

إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾

﴿ وَراوَدَتْهُ الّتِي هُوَ فِي بَيْتِها عَنْ نَفْسِهِ ﴾ وە ئەو ژنەی ئەوتۆ یوسوف لــە خانوەکـەیدا بوو داوای کارێکی خراپی لە یوسوف کرد بـانگی یوسـوفی کـرد بچێتـە لای دەرون و لەشی خۆی بداتێ، بە نەرم و نیانی و بەخەمزە و نازەوە گفتوگـۆی لەگـەڵ ئـەکرد هـەتا بیخەڵەتێنێ .

﴿ وَغَلَّقَتْ الآبْوابَ وَقالَتْ هَيتَ لَـكَ ﴾ وە ئـەو ژنـە دەرگـای هۆدەکـانی داخسـت لەسەر خۆی و یوسوف و، ووتی بە یوسف: تۆ وەرە بۆلای من و بۆلای ئەوشتەی من بۆم ئامادەکردوی بەگورجی و بەپەلە .

﴿ قالَ مَعاذَ اللهِ إِنَهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثوايَ ﴾ یوسوف ووتی: من پـەنا ئـەگرم بـە خـوا بـە پەناگرتن لەو شتەی تۆ لە منی داوائەکەی. بەڕاسـتی خـوای پـەروەردگار مـن جێگـەی داومەتێ و کاری شیرینی لەگەڵ من کردووە، ڕزگاریشی کردم لە کوشـتن و ئـازاردانی براکانم و لە قولایی چاڵی تاریك، دڵی عەزیزی بۆ نەرم کردم، ئیتر من چۆن بێ فەرمانی پەروەردگاری خۆم ئەکەم و ستەم لە خۆم ئەکەم بەکردنی گوناە و ناپاکی لەگەڵ مـێردی تۆ کەمنی بــەکوڕی خـۆی و بـەکوڕی تـۆ دانـاوە و زۆری چـاودێری کـردووم و منـی پەروەردە کردوە .

هەندێ لەزانیان مانای ڕستەی ( إِنَهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثوايَ ) بەم جۆرە کردوە: بەڕاسـتی عـەزیز گەورەی منە و جێگەی پێ بەخشیوم، ڕێزی پلە و شوێنی منـی گرتـوە چـۆن ناپـاکی و داوێـن پیسی لەگەڵ تۆ ئەکەم کەژنی عەزیزی .

﴿ إِنَهُ لايُفْلِحُ الظالِمُونَ ﴾ بەڕاستی سەرناکەون ستەم کاران، بێگومان ئەگەر من ئـەو کارە خراپە بکەم ستەم کارم. بەتایبەتی داوێن پیسی خراپترین ستەمە .

وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا
لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَٰنَ رَبِّهِۦ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ

وَٱلْفَحْشَآءَ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾ وَٱسْتَبَقَا ٱلْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٍ وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلْبَابِ قَالَتْ مَا جَزَآءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٥﴾ قَالَ هِىَ رَٰوَدَتْنِى عَن نَّفْسِى وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا وَٱسْتَغْفِرِى لِذَنۢبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلْخَاطِـِٔينَ ﴿٢٩﴾

﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَهَمَّ بِهَا لَـولا أنْ رَّأى بُرْهَـانَ رَبّـهِ ﴾ وە بەڕاستی ئـەو ژنـە نیـازی تێکەڵاو بون و نزیك بونەوەی یوسوفی ئەکرد بۆلای خۆی و ئەگەر نەی‌کا ئەیخاتە گێچ و داوێکەوە، یوسوفیش نیازی خراپەکردنی ئەکرد لەگەڵ ئەو ژنە ئەگەر بەڵگـەو نیشـانەی پەروەردگاری خۆی نەبینیایە کە داوێن پیسـی زۆر خراپـە و ئـەنجامی تێکـەڵاوی پیس و دژوارە، دڵی بـەزائیاری وخـوا پەرسـتیەوە بەسـترابوو، بێگومـان یوسـوف ئـەو نیازەی نەکردووە .

زانایان مانای ئەو ڕستانەیان بەزۆر ماناکردوە ، هەندێ لەومانایانە لەگەڵ پلەو پایەی پێغەمەراندا ناگونجێ کە ئەوان هەرگیز بیریان لە گوناه نەکردوەتەوە چ جای نیازی گوناه.

ووشەی ( هَمَّ ) بەزۆر مانا هاتوە: هاتوە بە مانا نیازکردن. بە مانا هاتوچۆی شتێ بەدڵدا بە بێ نیازکردنی بە مانا ئارەزوو کردن.

بۆ زانین: نزیکترین وەڵامێ شایستەی ڕیزو پلەی پێغەمەران بێ مانای ئەو ڕستانەی پێ بکەین بەم جۆرەیە: کە ئەو ڕستانە پاش و پێشن واتە (لَهَمتُ بِهِ وَلَولا أنْ رَّأى بُرْهانَ رَبّهِ لَهُمْ بِها ) بەڕاستی ئەو ژنە نیازی خراپەی کرد لەگەڵ یوسوف، ئەگەر یوسوف بەڵگەی خوای خۆی نەبینایە و نەیزانیبایە نیازی خراپە ئەکرد لەگەڵ ئەو ژنەدا. لە نامەی (لسان العربدا) ئەبو حاتم ئەڵێ: غەریبولقورئانم خوێندەوە بەسەر ئەبو عوبەیدەدا کە گەیشتمە ئەو ڕستانە فەرموی: ئەوانە پاش و پێشن .

پرسیار کرا لەسەعلەب لەمانای ئە وڕستانە ووتی: بەڕاستی زولەیخا نیازی گوناهی کردو بەردەوام بو لەسەری و یوسوف نیازی گوناهی کردوە و نەی کردوە بەردەوام نەبوە لەسەر نیازی خۆی، ئەو دوو نیازانە جیاوازن .

جەلالەدینی سیوطی لەنامەی خۆیا (الكنز المدفون و الفلك المشحون ) زۆر مانای گێڕاوەتەوە لەبارەی مانای ئە وڕستانە ئەمەیش ئەو مانایەن: ئەو ژنە نیازی کاری قەدەغەکراوی کردو، یوسوف داوای کاری ڕەوای کرد وئەو ژنەنیازی داوێن پیسی کردو، یوسوف نیازی نیکاحی کرد. ئەو ژنە نیازی وەستانی کردو و یوسوف نیازی ڕاکردنی کرد. ئەو ژنە نیازی بەیەکەوە ڕاکشانی کرد. یوسوف نیازی بەرگری کرد ئەو ژنە نیازی ئارەزووی خۆی کرد، وە یوسوف نیازی ئامۆژگاری کردنی کرد لەو ژنەدا .

ئەوەی شایانی باسبێ بۆ پلەی پێغەمەران: یوسوف گوناه کردن بەدڵیا نەهاتووە ; چونکە هەمو فرمانە چاکەکان و خراپەکانی لای ڕون بوە. بەو بۆنەوە شەرمی زۆری لە خوا کردوە، ئەیزانی خوا ئاگای لە هەموو شتێ هەیە، ئیتر چۆن نیازی خراپەکردن ئەوەشێتەوە لە یوسوف پێغەمەر، خوا ئەفەرموێ:

﴿ كَذلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ والفَحْشاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبادِنا الْمُخْلَصِيْنَ ﴾ هەر بەو جـۆرەی ئێمە یوسوفمان ڕاگرت لـەسەر ڕاستی لەبەرئەوە بـۆ ئێمـە لابدەیـن لـە یوسـوف ناپـاكی لـەگەڵ گەورەی خاوەن ماڵی و لای بدەین لـەو داوێـن پیسـی و ئەوشـتە بـێز لێكـراوە. بەڕاستی یوسوف لـە بەندە هەڵبژێرراوە پاك و خاوێنەكانی ئێمیە و ئێمە ئەو جۆرە پیاوانـە ئەپارێزین لـە نیازی خراپەو نایان خەینە نێو ڕێگەی خوار و خێچ .

﴿ وَاسْتَبَقا الْبابَ وَ قَدَّتْ قَمِيْصَهُ مِنْ دُبُرٍ﴾ وە یوسوف و ژنەكەی عـەزیز پێشبڕكێیان ئەكرد بۆ لای دەرگای هۆدەكە، یوسوف ئەیەویست ڕابكا لە دەسـتی ئـەو ژنـە ئـەویش ئەیەویست نەیەڵێ بڕواتە دەرەوە. ئەو ژنە كراسەكەی یوسوفی ڕاكێشا لە پشـتەوە و لـە سەرەوە بۆ خوارەوەی دای قڵیشان و لەوكاتەدا بە ڕێكەوت و كـوت و پـڕ مێردەكـەی ڕوبەڕویان هات، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَاَلْفَيا سَيِّدَها لَدَى الْبابِ ﴾ وە هەردووكیان توشیان بو بە توشی مێردی ژنەكـە لـە نزیك دەرگاكەوە، ژنانی میسر لـەو سـەردەمەدا بـەمێردی خۆیانیـان دەووت: گـەورەم، ئێستاش لە هەندێ هەرێم ئەو ووشـەیە بـەكاردێت لەلایـەن ژنانـەوە. عـەزیز كـە چـوە ژوورەوە یوسوفی بینـی وەسـتاوە و كراسـەكەی لـە پشـتەوە دڕاوە، بەرلـەوەی عـەزیز پرسیاربكا لـەو ڕوداوە .

﴿ قالَتْ ماجَزاءُ مَنْ أرادَ بِأهْلِكَ سُوءً إلاّ أنْ يُسْجِنَ أوْ عَذابٌ أَلِيْـمٌ ﴾ ژنەكـەی عـەزیز ووتی: بەبێ تێك چون و لـەسەرخۆ: پاداشتی كەسێ بیەوێ خراپە بكا لـەگەڵ خـێزانی تـۆ نیە مەگەر بەند بكرێ یاسزایەكی خاوەن ئازاری بدرێ بە لـێدان وتەمێ كـردن، یوسـوف هیچ شتێكی بۆ نەمایەوە جگە لـەوەی بەهەر جۆرێ بێ خراپە لـە خـۆی دوور بخاتـەوە و بەعەزیزی ووت و ڕوداوەكەوی یە تەواوی بۆ گێڕایەوە .

﴿ قالَ هِيَ راوَدَتْنِيْ عَنْ نَفْسِيْ ﴾ یوسوف ووتی: ئەو ژنە داوای كـاری خراپـی لـەمن كردوە كەدەرونی خۆمی بدەمێ، ویستم ڕابكەم لـەدەستی و ئەویش ڕای كرد بەدوای منا، لـەپاشەوە كراسەكەی ڕاكێشام و سەیر كە چـۆن دڕاوە، ئەگـەر ئـەو ژنـە منـی تاوانبـار نەكردایە و داوای بەندكردن و ئازاردانی منی نەكردایە من دەنگم نەدەكرد .

﴿ وَشَهِدَ شاهِدٌ مِنْ أهْلِها إنْ كانَ قَمِيْصُهُ قُدَّ مِنْ قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ الْكاذِبِيْنَ ﴾ وە شایەتی دا شایەتیٚ لەخێزان و خزمی ژنەکەی عەزیز: ئەگەر کراسەکەی یوسوف لە پێشەوە دڕاوە، دوایی ئەو ژنە ڕاست ئەکاو یوسوف لەوکەسانە دائەنرێ درۆزن بن.

﴿ وَإنْ كانَ قَمِيْصِهِ قُدَّ مِنْ دُبُرٍ وَهُوَ مِنَ الْصادِقِيْنَ ﴾ وەئەگەر کراسەکەی یوسوف لەپشتەوە دڕاوە دوایی ئەو ژنە درۆئەکا و یوسوف لەڕیزی ئەو کەوسانە دائەنرێ ڕاست بکەن و ڕاست وێژن .

زانایان لەبارەی دیاری کردنی ئە وشایەتە درێژەیانداوە بەدیاری‌کردنی: هەندێکیان ئەڵێن: ئامۆزای زولەیخا بوە، هەندێ تریان لایان وایە یەکێ بووە لە هاوڕێکانی مێردی زولەیخا ، هەندێ‌تریان ئەڵێن منالێك بوە لە بێشکەدا. بەلاّم ئێمە لە بەردەم سروشتێ ئەوەستین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی یەکێ بوە لە خزمانی ئەوژنە و پیاوی باڵغ ئاقڵ و بوە و ئەمەیە کەسروش ئەیفەرموێ. بەلاّم ئەو شایەتە لەچ جێگەیە بوە؟ چ کاتێ شایەتیەکەی داوە ؟ ئایا بەڕیکەوت هاتوە ؟ یا بەداواکردنی ئەو ژنە یا بە داواکردنی مێردەکەی ؟ ئەوانە هەموویان خوا بێ‌دەنگە لە باسیانا. ئێمە بەگوێرەی فەرموودەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ داوای ئەوانەمان لێ ناکرێ .

﴿ فَلَما رَأى قَمِيْصَهُ قُدَّ مِنْ دُبُرٍ ﴾ دوایی کاتێ عەزیز بینی کراسەکەی یوسوف لە پشتەوە دڕاوە بۆی دەرکەوت ژنەکەی درۆئەکا و یوسوف ڕاست ئەکا. بەلاّم لەبەرئەوەی ئابڕوی نەچێ و ئەو ڕوداوە بلاّو نەبێتەوە، وای بەچاك زانی بیرێکی قوڵی لێ بکاتەوە.

﴿ قْلَ إنَهُ مِنْ كَيْدِكُنَّ إنَ كَيْدَكُنّ عَظِيْمٌ ﴾ عەزیز ووتی: بەڕاستی ئەو کارە لە فێڵ و پیلانی ژنانە، بەڕاستی فێڵی ژنان زۆر گەورەیە، لە توانای پیاواندا نیە بەرگریان لێ‌بکا . عەزیز ویستی دڵی یوسوف ڕابگرێ ووتی :

﴿ يُوسُفُ أعْرِضْ عَنْ هذا وَأسْتَغْفِرْي لِذَنْبِكِ إنَكِ مِنَ الْخاطِئِيْنَ ﴾ ئەی یوسوف: تۆ واز لەو ڕوداوە بهێنە، هەواڵبەکەس مەدەولە بیری خۆتی بەرەوە، بەژنەکەی خۆیشی

ووت، تۆیش ئەی زولەیخا داوای لێ خۆشبوون بکە لەخوا بۆ گوناهەکانت و پەشیمان ببەرەوە. بەڕاستی تۆ لەوکەسانەی گوناهباری وبەهەڵەدا چووی لەوکارەدا کردوتە لەگەڵ یوسوف. ئەو گفتوگۆی عەزیزە بەڵگەی بێگومانە لەسەر ئەوەی ئەیزانی یوسوف پاکەو ژنەکەی درۆزن و بوختان کەرە .

پرسیار/ ئەو ئایەتە وای دەرئەخا فێڵی ژنان لە فێڵی هەموو کەسانێ گەورەترە بگرە لە فێڵی شەیتانیش، وەك خوا لە ئایەتی

( ٧٥ ) ی سورەتی ئالی عیمراندا ئەفەرموێ: بەڕاستی فێڵی شەیتان لاوازە ،ئایا فێڵی ژنان گەورەترە لە فێڵی شەیتان ؟

وەلام/ مەبەست لەوە کە فێڵی شەیتان لاوازە، یانێ دەستەلاتی بەسەر بەندە پوختەکانی خوادا نیە و مەبەست لە گەورەیی فێڵی ژنان ئەمەیە: گەورەترین سەربازی شەیتانن بۆ خەڵەتاندنی پیاوان .

ڕووداوی نێوان یوسوف و زولەیخا بلاوبویەوە بە نێو شاردا، ژنان و پیاوانی میسر بەو ڕووداوەیان زانی، بوبە گفتوگۆی کۆڕو کۆمەڵ. خوای مەزن لەو باسەوە ئەفەرموێ :

﴿ وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَن نَّفْسِهِ ۖ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا ۖ إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَأً وَآتَتْ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ۖ فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَا إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴿٣١﴾ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ ۖ وَلَقَدْ رَاوَدتُّهُ عَن

نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُا۟ ٱلْءَايَٰتِ لَيَسْجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٣٥﴾

﴿ وَقالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِيْنَةِ إِمْرَأَةُ الْعَزِيْزِ تُراوِدُ فَتاها عَنْ نَفْسِهِ ﴾ وە کۆمەڵێ لە ژنانی دانیشتوانیشاری میسر ووتیان ژنی عەزیز داوای کردوە لەکوڕە تازە پێ گەیشتوەکەی خۆی کارێکی لێبێزراو لەوەوە پەیدابێ، بانگی کرد بڕوا بۆ لای بۆ ئەوەی بگا بە ئاواتی خۆی .

﴿ قَدْ شَغَفَها حُبَّاً ﴾ بەراستی دڵی ئەو ژنەی عەزیزی داگیرکردوە خۆشەویستی ئەو کوڕە بۆیە هۆشی بەخۆیەوە نەماوە و گیرۆدەی ئەو کوڕە بووە. ئەوینی ئەو لاوە چوەتە ناو جەرگ و دڵی .

﴿ إنا لَنَراها فِي ضِلالٍ مُبِيْنٍ ﴾ بەڕاستی ئێمە ئەو ژنەی عەزیز ئەبینین لە هەڵەیەکی ئاشکردایە و لە ڕاستی دورە، زۆر شورەییە و بێ ئابڕوییە شێتی بەندەی خۆی بوەو ئەو کوڕە گوێ نەداوەتێ و لە دەستی ڕای کردوە، ئەو کارەی ئەو گوناهێکە چاوپۆشی لێ ناکرێ .

﴿ فَلَّما سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَ أرْسَلَتْ إلَيْهِنَّ ﴾ دوایی کاتێ ژنەکەی عەزیز بەگفتوگۆی نهێنی ئەو ژنانەی بیست بڵاویان کردوەتەوەو تانەیان لێ داوە و ویستوویانە ئابڕوی ببەن، ژنەکەی عەزیز بۆ تۆڵەکردنەوە لەوژنانەو ئابڕویان ببا ناردی بۆلایان و بانگی کردن بۆ نان خواردن.

﴿ وَاعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَاءً وَآتَتْ كُـلّ واحِـدَة مِنـهُنَّ سِكِيْناً ﴾ وە ئەوژنـەی عـەزیز لـە کۆشکی خۆیا کۆرێکی بۆ ئامادەکردن وکورسی و پاڵپشتی بۆ دانان، خـواردن و میـوەی ڕەنگا ورەنگی بۆ ڕازاندنەوە، ئەو ژنانەیش هاتن و دانیشتن و هاتن بۆ میوانداریەکە و دای بەدەستی هەریەکێکیانەوە کاردێك هەتا گۆشت و میوەی پیّبڕن و بیخـۆن، بـەکارهێنانی چەقۆ لـەو سەردەمەدا نمونەی شارستانیەتی بوە .

﴿ وَقالَتْ اُخْرُجْ عَلَيْهُنَّ ﴾ وە ژنەکەی عەزیز ووتی: یوسوف تـۆ وەرە دەرەوە بەسـەر ئەم ژنانەدا، یوسوف بیّفەرمانی نەکرد و هاتە دەرەوە بەسەریان، ئـەو ژنـە ئارایشـتی زۆر جوانی یوسوفی کردبو لـە جێگەیەکی نهێنی دایناب‌و .

﴿ فَلَّما رَأَيْنَهُ أكْبَرْنَهُ وَقَطَعِنَّ أيْدِيَهِنَّ ﴾ دوایی کاتیّ ژنەکان یوسوفیان بینی بەگـەورەیان داناو لـە جوانی یوسوف سەریان سوڕما و هۆشیان بەخواردن و خۆیانەوە نـەما و دەسـتی خۆیانیان بە وچەقۆیانە بڕی و هەستیان بەئازاری خۆیان نەکرد بەهۆی شـۆخی یوسـوفەوە هەتا خوێن هاتە خوارەوە بەدەستیانا.

﴿ وَقُلْنَ حاشَ للهِ ماهٰذا بَشَراً إنّ هذا إلا مَلَـكٌ كَرِيـمٌ ﴾ وە ژنـەکان ووتیـان: پـاك و خاوێنی بۆ ئەو خوایە کە وێنەی ئەم کوڕەی دروست کردووەو ئەم شۆخیەتەی پـیّ داوە، ئەم کوڕە ئادەمیزاد نیە مەگەر یەکێکە لـەفریشتە گەورە بەڕێزەکانی خوا کە ئـەم جوانیـە بیّ هاوتایەی داوەتیّ، بێگومان خۆپاراستن لـە خراپـە کـاری فریشـتەیەو ئـەم جوانیـە بـیّ وێنەیە هەر بۆ فریشتەیە .

﴿ قْالَتْ فَذلِكُنَ الَّذي لُمْتُنَنّي فِيهِ وَلَقَدْ راوَدْتُهُ عَنْ نَفْسِهِ فَاسْـتَعْصَمَ ﴾ ژنەکـەی عـەزیز بەسەربەستیەوە ووتی: ئەمەیە ئەوکەسەی ئەوتۆ ئێوە لۆمەی منتان ئەکرد لـەخۆشەویسـتی ئەودا و بەڕاستی من داوام لـەو کوڕەکرد بۆ هاتنی خۆی بۆلام و ئـەوکارەم لـەگـەڵ بکـا، دوایی ئەوکوڕە خۆی لیّ قەدەغەکردم و خۆی لـەوکارە پاراست. ژنەکەی عەزیز کـەزانی بیانوی لیّ وەرئەگرن داوای لیّ بکەن بیّ فەرمانی نەکا، ئەوانیش ووتیان: بەدڵی گـەورەی خۆت بکە و چیت لیّ داوا ئەکا بیکـە لـەگـەڵی، ئـەوەی ژنـی عـەزیز ووتـی لـە بـارەی یوسوفەوە بەڵگەی ڕوونە لـەسەر داوێن پاکی یوسوف، دوایی ژنەکەی عەزیز ووتی:

﴿ وَلَئِنْ لَمْ يَفْعَلْ ماآمُرُهُ يُسجَنَنَّ وَلَيَكُونا مِنَ الْصاغِرِيْنَ ﴾ وەئەگەر بەڕاستی ئەو کوڕە ئەوشتەی من فەرمانی پێ ئەدەم نەیکا بەڕاستی بەفەرمانی من بەند ئەکرێ و ئەبێ بەداما و گاڵتە پێ کراو، ژنەکان وتیان دووبارە پەیڕەوی زولەیخا بکە بۆ ئەوەی داوای ئەکاڵە تۆ، یوسوف بەندکردنی هەڵبژارد بەسەر گوناهدا .

بۆ زانین: ئەو سەربەستیە بێ شەرمانە زولەیخا دەری بڕی لە بارەی دڵداری‌یەوە، بۆ ژنان وکچانی ئەم ڕۆژەیش ئەو سەربەستی و بێ شەرمیە سەری هەڵداوە، هەست بەلێ پرسراوی ناکەن لە بەردەم هیچ کەسداو ئەوپەڕی بەرەڵایی دەستی دراوەتێ وێنەی ئەوکاتەی زولەیخا یاساو دەستوری ئەو کاتە بەرەڵایی پێ بەخشیون، یاسای دەست کردی ئەم سەردەمەیش بەرەڵایی بۆ ڕەواکردن، گوێی نادرێتە فەرموودەی خوا. ئێمەی موسڵمان یاریدەی سەربەستی پیاوان و ژنان ئەدەین. بەڵام لە دەستور و ڕەوشتی ئایین دەرنەچێ و گفتوگۆی خراپ نەبێژرێ و نەیکەن .

کاتێ یوسوف گفتوگۆی ژنی عەزیزی بیست زۆر لای گران بوو،پەنای برد بۆ لای خواو پاڕایەوە :

﴿ قالَ رَبِّ السّجنُ أحَبُّ إلَيَ مِمّا يَدْعُونَنِي إلَيْهِ ﴾ یوسوف ووتی: ئەی پەروەردگاری من: بەند کردن لای من خۆشترە لەشتێ ئەو ژنانە داوای لە من ئەکەن بۆی و هانم ئەدەن ئەو کارە خراپە بکەم .

﴿ وَإلا تَصْرِفَ عَنِي كَيْدُهُنَّ أصْبُ إلَيْهُنَ وَأكُنْ مِنَّ الْجاهِلِيْنَ ﴾ وەئەگەر تۆ پەروەردگار لانەدەی لەمن خراپە وفێڵی ئەو ژنانە بۆ فریودانی من ونەم خەیتە ژێر پاراستنی خۆتەوە من مەیلم ئەڕوا بۆ لای‌وەلامدانەوەیان و گیرۆدەم ئەکەن و ئەبم بەیەکێ لەوکەسانە گێل ونەزانن بە هۆێ خراپەی شتێ ئەو ژنانە داوای ئەکەن .

﴿ فَاسْتَجابَ لَهُ رَبُّهُ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدُهُنَّ إنَّهُ هُوَ الْسَّمِيْعُ الْعَلِيْمُ ﴾ دوایی پەروەردگاری یوسوف وەڵامی دایەوەو نزاکەی لێ وەرگرت، دوایی لایدا لە یوسوف فێڵ فریودانی ئەو ژنانە، هەروەك پێشتر ڕزگاری کرد لە پیلانی براکانی، ئەبێ بزانین ئەگەر بەندەی خوا

نیازی پاکیێ خوای مەزن هەموکاتیێ دەرگای ڕزگاری بـۆ ئەکاتـەوە لـەکاتی تەنگانـەدا. بەڕاستی هەرخوایەئەبیسیێ پاڕانەوەی کەسیێ پەنای بۆ ببا ،ئەزانیێ بەکردەوەو نیازی کەسیێ خۆی لەکردەوەی خراپ بپارێزیێ .

﴿ ثُمَّ بَدَالَهُمْ مِنْ بِعْدِمـا رَأوا الآيـاتِ ﴾ لەپاشا دەرکـەوت بـۆ عـەزیز و ژنەکـەی و دڵسۆزانیان پاکی یوسوف لەدوای ئەوەی بینیان چەندین بەڵگە لەسـەر ڕاستی یوسـوف لەشایەتی دانی ئەو شاهیدە و دڕانی کراسەکەی لەپشتەوەو دەست بڕین وپیلانی ژنـەکان وایان بەپەسەند زانی بۆ لابردن و کۆن کۆدنی ئەوبێئابڕوییـە توشـی ژنـی عـەزیز بـوە و دانیشتوانی شار پێیان زانیوە .

﴿ لَيَسْجُنُهُ إلى حِيْنٍ ﴾ کەیوسوف بەند بکەن هەتا ماوەیە نەك هەتا هەتایـە بـۆ ئـەوەی ئەودەنگ وباسە خراپە لە سەرژنی عەزیز لەبیر بچێتەوە ئەبیێ بزانین یوسوف بیێ تاوان بـو بۆیە بەندکرا، ئەگەر وێنەی خۆیان ناپاك و تاوانبار بوایە پلەی بەرزتریان ئەدایە و بەندیان نەئەکرد .

بۆ زانین: هەموو چاخەکانی مێژوو بۆمانی ڕون ئەکاتەوە هەرکاتێك مرۆڤێکـی پـاك و دڵسۆز تووشی بوبیێ بەتوشی ستەمکارو خراپەکەرانەوە کار بەدەستان وتاوانباران بوختـان ودرۆیان بۆ هەڵئەبەسن بۆ ئەو دڵپاکانە و توشی گیروگرفتیـان بەکوشـتن و بـەندکردن و لێدان ئەکەن، چونکە بەفەرمانیان هەڵناسن و بەریتیلیان بۆ پەیدا ناکەن. بـەلام یـاریدەی خوا لەگەڵ ئەو کەسانەیە ئـارام ئـەگرن هـەر لەبـەر خـوا، ئەگـەر بـۆ ماوەیـە مۆڵـەتی ستەمکاران بدریێ لەئەنجامدا ڕێگەی دەرچوونـی لیێ دائـەخریێ لەجیـهاندا، خـوا یارمـەتی ئارام گران و باوەڕداران ئەدا بەوێنەی یوسوف کەڕزگاری لەپیلانی براکانی و ژنی عەزیز کرد.

یوسوفی دڵپاك وداوێن پاك چوە نێو بەندیخانە، ژنی عەزیزی دڵ پیس لەشـوێنی خۆیـا مایەوە بەبەرەڵایی و سەرشۆڕی، ئەی خوڕی بەسەر دانیشتوانی کۆشکدا. بەلام یوسـوف چوەگرتوخانە بەدڵێکی خۆشەوەو خۆی بەئارەزووی خـۆی ئەوگرتوخانەیـەی هـەڵبژارد

وبوبە خاوەنی ئاسایش و ڕزگاری بو لەکردنی کاری خراپ. ژنـی عـەزیز لەگرتوخانـەی دلّدا ئەژیا و هاتوچۆی ئەکردو بیری لەبێ ئابڕویی خۆی ئەکردەوە .

وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ ۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ أَعْصِرُ خَمْرًا ۖ وَقَالَ ٱلْءَاخَرُ إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِى خُبْزًا تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُ ۖ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓ ۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٦﴾ قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ ۚ إِنِّى تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱتَّبَعْتُ مِلَّةَ ءَابَآءِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشْرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ ذَٰلِكَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٨﴾

﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ السِّجْنَ فَتَيانِ ﴾ وەچونە نێو گرتوخانەوە لەگـەڵ یوسـوف دا دوولاوی بەندەی پاشای میسر یەکێکیان مەی گێڕو ئەوی تریان چێشت دروستکەری پاشـا، پاشـا لەوان ڕەنجابوو فەرمانی دابو بەبەندکردنیان .

﴿ قالَ أحَدُهُما إني أراني أعْصِرُ خَمْراً وَقالَ الآخَرُ إني أراني أحْمِلُ فَوْقَ رَأسي خُبْزاً تأكُلُ مِنْهُ الْطَيْرُ ﴾ یەکێ لەوبەندکراوانە کەمەی گێڕی پاشا بوو ووتی: من بینـم لەخـەوما

ترێم ئەگوشی بۆ ئەوەی بکرێ بەمەی و، ئەوی ترلەودووبەند کراوانە کە چێشت دروست کەری پاشا بوو ووتی من لەخەوما بینیم لەسەر سەرم هەڵم کرتبو نان لەونانەیان ئەخوارد تاقمێ باڵندە .

﴿ نَبِّئْنا بِتَأوِيْلِهِ إنّا نَراكَ مِنَ الْمُحْسِنِيْنَ ﴾ تۆ هەواڵ بدە بەئێمە بەمانای ئەو خەوە بەڕاستی ئێمە تۆ وا ئەبینین لەوکەسانەی چاکەکەرن و ڕەوشتیان چاکە لەگەڵ دانیشتوانی گرتوخانەداو ڕێك و پێکی .

﴿ قْلَ لايَأتِيَكُما طَعامٌ تُرْزَقانِهِ إلاّ نَبَأتُكُمْا بِتأوِيْلِهِ قَبْلَ أنْ يَأتِيَكُما ﴾ یوسوف ووتی نایە بۆلای ئێوە خواردەمەنییە دەرخوارتان بدرێ مەگەر من هەواڵ ئەدەم بە ماناو ناوەڕۆکی ئەو خواردەمەنیە بەرلەوەی ئەو خوادرەمەنیە بگاتە لای ئێوە کە لەدەرەوە دێت بۆ لاتان و هەواڵتان ئەدەمێ چ خواردەمەنیەکە و ڕەنگی چۆنە و ئەندازەی چەندە ؟ قازانج و زیانی بۆ تەندروستی ئێوە ڕون ئەکەمەوە لەگەڵ ئەوەیشدا من و ئێوە بەیەکەوە لەم گرتوخانەیەداین و پەیوەندیمان بەکەسەوە نەکردوە. کەواتە ئێوە بزانن من ئەو هەواڵانەم بە سروش بۆ هاتوە لەلایەن خواوە، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ ذلِكُما مِمّا عَلَمَني رَبّي إني تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لايُؤمِنُونَ بِاللهِ ﴾ ئەوشتەی من هەواڵی ئەدەم بەئێوە کەلەبەر چاو نین و نهێنین لەوشتەیە پەروەردگاری من فێری منی کردوە بەسروش بەوجۆرەی نێرراوە بۆلای پێغەمەرەکانی تر، من لەو کسانە نیم هەواڵ بدەم بەشتێ ڕابوردووە و بەشتێ لەمەوداو پەیدا ببێ بەگۆترە وجادوگەریش نیم. بەڕاستی من وازم هێناوە لەئایینی کۆمەڵێ باوەڕ بەخوا نایەرن و بێزارم لەوان. ئایینی دانیشتوانی ئەو ڕۆژە خۆر پەرستی و گوێرەکە پەرستی بوە، ئەو گوێرەکەیان ناونابوو (أبيس) .

﴿ وَهُمْ بِالآخِرَةِ هُمْ كافِرُونَ ﴾ ئەو تاقمە ئەوانەن باوەڕیان بەڕۆژی دوایی نیە بۆیە وازم لێ هێناون و دوای ئەوان نەکەوتووم. لەپاشا یوسوف ڕونی ئەکاتەوە لەسەرچ ئایینێکە و ئەفەرموێ :

﴿ وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ أبائي إبْراهِيْمَ وَإسْحاقَ وَيَعْقُوبَ ﴾ وە من دوای ئایینی باو و باپیری خۆم کەوتووم کە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبن، من لەوان کەوتومەتەوە و کوڕی یەعقوبم، ئەو پێغەمەرانە بەناوبانگ بوون لای هەمو کەسێ. بەتایبەتی ئیبراهیم .

﴿ وَمالَنا أنْ نَشْرِكَ بِاللهِ مِنْ شَيءٍ ﴾ شایستە نیە بۆ ئێمە کەئێمە هاوبەش دابنێین هیچ شتێ جگەی خوا پەرستین. لەپاشا یوسوف فەرموی :

﴿ ذلِكَ مِنْ فَضْلِ اللهِ عَلَيْنا وَعَلَى الْنّاسِ ﴾ ئەو پەرستنەی خوا و هاوبەش دانانەنان بۆ خوا و کردنی ئێمە بە پێغەمەر لە گەورەیی خوایە بەسەر ئێمەدا و بەسەر هەموو ئادەمیزادا بەناردنی ئێمە بۆ شارەزایی کردنیان و ڕێگەی راستیان پیشان بدەین.

﴿ وَلَكِنْ أكْثَر النّاسِ لايَشْكُرُونَ ﴾ وە بەلاّم زۆرترین لە ئادەمیزاد سوپاسی ئەوگەورەییەی خوا ناکەن کە بەوانی بەخشیوە، بگرە هەتا سامانی زۆرترو تەندروستیان بداتێ بێسوپاس تر ئەبن .

لەپاشا خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە کە یوسوف بەردەوامبو لەسەر ئامۆژگاری کردنی هاوڕێکانی لەگرتوخانەداو ئەفەرموێ:

يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾

﴿ یاصاحِبَیِ الْسجْنَ أأرْبابٌ مُتَفَرّقُونَ خَیرٌ أمْ اللهُ الْواحِدُ القَهارُ ﴾ ئەی دوو هاورێکانم لە گرتوخانەدا و دانیشتوون لە گرتوخانەدا: ئایا چەند خوایە دژی یەکتربن و لەیەك جیاوازبن چاکترن بۆ ئێوە و هەموو ئادەمیزاد یا خوایەکی تەنهای خاوەن دەستەلاّتی بێ وێنە ؟ ئەویتانە کە ئێوە بەدەستی خۆتان لە بەرد و درەخت دروستیان ئەکەن شایانی پەرستن نین و توانای هیچ شتێکیان نیە .

﴿ ماتَعْبِدُونَ مِنْ دُونِهِ إلاّ اسْماءً سَمّیْتُمُوها أنْتُمْ وَآباؤکُمْ ماأنْزَلَ اللهِ بِها مِنْ سُلْطان ﴾ ئێوەی دانیشتوانی گرتوخانە و دانیشتوانی شاری میسر ناپەرستن لە جگەی خوا مەگەر چەند ناوێکن بێ ناوەڕۆك ئێوە و باو و باپیرتان ناوتان ناون بەخوا، خوا نەی ناردوەتە خوارەوە بۆ ئەوناوانە ئێوە ناوتان ناوە لەو بتانە هیچ بەڵگە و ناونیشانێ لەسەر ڕاستی ئەو ناوانە. کەواتە ئێوە ناو پەرستن و ناوەڕۆك پەرست نین .

﴿ إنَ الْحُکْمَ إلا للهِ أمَرَ ألاّ تَعْبُدُو إلاّ إیاهُ ﴾ فەرماندان بۆ ڕەواکردن و قەدەغەکردن و پەرستن بۆ هیچ کەسێ نیە مەگەر تەنهاهەر بۆ خوا، خوا فەرمانی داوە بەهۆی پێغەمەرانەوە کە ئێوە هیچ شتێ مەپەرستن مەگەر هەر خوا .

﴿ ذَلِكَ الْدِیْنُ الْقَیّمُ وَلَکِنَ أکْثَرَالنّاسِ لایَعْلَمُونَ ﴾ ئەو پەرستنەی خوا ئایینی ڕاستی بێ خوارو خێچە و، بەڵام زۆرتر لە ئادەمیزاد ئەو ڕاستیە نازانن و بێ ئاگان لە پاداشت و تۆڵە، هیچ کەسێ بۆی نیە داوای پەرستنی خۆی بکا، یا بەبێ فەرمودەی خوا یاسا دروست بکا. ئادەمیزاد هەموویان یەکسانن لە مافدا و هەمویانی بەمرۆڤ دروست کردوە.

یَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ٤١ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ

ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾

دوای ئەوەی یوسف دانیشتوانی گرتوخانەی بانگ کرد بۆلای پەرستنی خوای تاك و تەنها و مانای خەوەکانی بۆ لێ دانەوە و پێویستی سەرشانی خۆی جێ بەجێ کرد، ئەفەرموێ :

﴿ ياصاحِبَي السِّجْنَ أَمّا أحَدُكُما فَيَسْقِي رَبَّهُ ﴾ ئەی دوو هاورێکانی دانیشتوی گرتوخانە: ئەویەکەتان مەی گێڕ و ئاوگێڕی پاشایە و لە خەویا بینی ترێ ئەگوشێ بۆ ئەوەی بکرێ بەمەی، دوای چەند ڕۆژێ ڕزگاری ئەبێ، دوایی ئەچێتەوە بۆلای پاشاو دەرخواردی گەورەی خۆی ئەدا مەی بۆ خواردنەوە .

﴿ وَأما الآخَرُ فَيصْلَبُ فَتَأكُلُ الطَّيْرَ مِنْ رَأسِهِ ﴾ وە ئەوی تریان کە چێشت دروستکەری پاشا بو، دوای هەڵئەواسرێ، دواتر باڵندە لە مۆخی مێشکی ئەخۆن. کاتێ نانکەری پاشا باسی هەڵواسینی خۆی بیست ووتی من هیچ شتێکم لە خەودا نەبینیوە، یوسف بڕوای بە مانا لێك دانەوەی خەوەکان بو، چونکە بە سروش بۆی هاتبو لەلایەن خواوە، فەرمووی:

﴿ قُضِيَ الآمْرُ الّذي فِيْهِ تَسْتَفْتيانِ ﴾ تەواو بو، جێ بەجێ کرا ئەو شتەی ئەوتۆ ئەو دووکەسە داوای ڕونکردنەوەی ماناکردنیان کردبو، خوا فەرمانی پێداوەو بڕاوەتەوە .

﴿ وَقالَ لِلّذي ظَنَّ أنَهُ ناجٍ مِنهما أذْكُرْني عِنْدَ رَبِّكَ ﴾ وەیوسف ووتی بەوکەسەی ئەوتۆ ئەیزانی ڕزگاری ئەبێ لەو دووکەسە: تۆ بیری من بکەرەوە لای گەورەی خۆت، هەتا پاشا بکۆڵێتەوە لە بەندکردنی من و بۆی دەرکەوێ کە من بە ناڕەوایی گیراوم.

﴿ فَأَنْساهُ الْشَيْطانُ ذِكْرَ رَبِّهِ ﴾ دوایی شەیتان لە بیری ئەوکەسەی بردەوە ڕزگاری بو باس کردنی یوسف لای گەورەی خۆی. پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرموێ: میهرەبانی خوا بۆ یوسف بێ ئەگەر نەی ووتایە بیری من بکەرەوە لای گەورەی خۆت دوای پێنج ساڵ یا

حەوت ساڵ لە گرتوخانەدا نەئەمایەوە، داوای کۆمەکی لە بەندەکان هەرچەندە چاکە لە کاتی تەنگانەدا هەندێ جار، شایستەی پلەی پێغەمەران نیە .

﴿ فَلَبِثَ فِي السِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ ﴾ دوایی مایەوە لە نێو بەندیخانەدا چەند ساڵێ لە نێوان سێ ساڵ هەتا نۆ ساڵ. ژمارەی مانەوەی لە گرتوخانە ڕون نەکراوەتەوە. بەلاّم ووشەی ( بِضْعَ ) لە سێ ساڵ کەمتر نیەو لە نۆ ساڵ زیاتر نیە .

وَقَالَ الْمَلِكُ إِنِّي أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنبُلَاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ ۖ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي رُؤْيَايَ إِن كُنتُمْ لِلرُّؤْيَا تَعْبُرُونَ (٤٣) قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ ۖ وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ الْأَحْلَامِ بِعَالِمِينَ (٤٤) وَقَالَ الَّذِي نَجَا مِنْهُمَا وَادَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ أَنَا أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِ فَأَرْسِلُونِ (٤٥) يُوسُفُ أَيُّهَا الصِّدِّيقُ أَفْتِنَا فِي سَبْعِ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنبُلَاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ لَّعَلِّي أَرْجِعُ إِلَى النَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ (٤٦) قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنبُلِهِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ (٤٧) ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ (٤٨) ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ

عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ ﴿٤٩﴾

دوای ماوەیە کە بەسەر چوو لە بەندکردنی یوسوف خوای مەزن ویستی ڕزگاری بکا زۆر بەڕێزەوە. ئەوەبوە پاشای میسر خەوێکی بینی زۆری لا سەیر بوو، بۆ مانا لێکدانەوەی ئەوخەوە پاشا جادوگەران وئەستێرەناسان و خەوناسانی کۆکردەوە ،ئەوخەوەی بۆ گێڕانەوە، داوای لێ کردن مانای ئەو خەوەی بۆ بکەن. ئەفەرموێ :

﴿ وَقَالَ الْمَلِكُ إِنِّي أَرَى سَبْعَ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ ﴾ وەپاشا ووتی :بەڕاستی من بینیومە لەخەوما حەوت گای قەڵەو، حەوت گای لەڕ ئەو قەڵەوانە ئەخۆن. زۆرم لاسەیرە ئەو حەوت گا لەڕانە پەلاماری ئەو حەوت قەڵەوەیان ئەداو ئەیان خواردن .

﴿ وَسَبْعَ سُنْبُلَاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ ﴾ وەبینیم حەوت گوڵ دانەوێڵەی سەوزی پێ نەگەیشتو و حەوت هێشوی ترێی پێگەیشتوی ووشك. پاشا ویستی مانای ئەو خەوە بزانێ، دوای زاناکانی کۆکردەوە بۆ ئەو مەبەستە ووتی :

﴿ يَاأَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي رُؤْيَايَ إِنْ كُنْتُمْ لِلرُّؤْيَا تَعْبُرُونَ ﴾ ئەی پیاوە زاناو بەڕێزەکان: ئێوە هەواڵ بدەن بەمن لەماناکردنی ئەو خەوەی من ئەگەر ئێوە ئەزانن مانای خەو بکەن.

﴿ قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ الْأَحْلَامِ بِعَالِمِينَ ﴾ وە زاناکان هیچیان بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ ووتیان: ئەو خەوانە کۆمەڵە خەوێکن تێکەلاوی یەکتربوون و لەیەك ئەچن و تەڕ و ووشك تێکەلاو کراون و پروپوچن و، ئێمە مانای ئەوجۆرە خەوانە نازانین بەگفتوگۆی ئێمە بڕوات بێ .

بۆ زانین: (الآحلام ) دەرکەوتویەکی دەرونیە. زانایانی دەروونناسی و زانایانی تر لەهەموو خاوەن بیرو بۆچوەکان خۆیانیان ماندوکردوە لەڕاستی چۆنیەتی خەودا. بەڵام کەسیان نەیانتوانیوە بگەنە مانایە بڕوای پێ بکرێ. بەڕاستی زانایان ڕاغوییان وەرنەگرتوە بۆلای سەرچاوەی کەمی لە هەندێ خەو مانای ڕاستیان بۆی کردوە، هەر لەبارەی خەوەوە

ڕونیان کردوەتەوە هەندێ نەخۆشی. بەڵام هەندێ خەو هەن گفتوگۆ ئەکەن بە زمانی جگەی ئەو کەسەی خەوەکە ئەبینێ و بەجگەی دەرون و ژیانی ئەوکەسە. زانایان ڕێگەیان نەبردوە بەمانای ئەوجۆرە خەوانە .

خاوەنی نامەی (لسان العرب ) لەونامەیەدا ئەڵێ: پێغەمەر ئەفەرموێ: (الرؤيا) لەخواوەیە (الحُلم ) لەشەیتانەوەیە. ئەیش لێ هەردوکیان بەمانایەکن. بەڵام (الرؤيا) بەزۆری بریتیەلە شتی چاك. (الحُلم ) بەزۆری بەشتێ ئەبێژرێ لەکاری خراپ و ناشیرین. بەکورتی خوای مەزن ئەو خەوەی پاشای کرد بەهۆی ڕزگاربوونی یوسوف، پاشا لای خۆشبو مانای ئەو خەوەی بۆ بکرێ .

﴿ وَقالَ الَّذي نَجْا مِنهما وَاْذكَرَ بَعْدَ اُمَةٍ ﴾ وەکەسێکی ئەوتۆ لەو دووکەسە ڕزگاری بوو لەگرتوخانە و، بیری ڕاسپاردەی یوسوفی کردەوە لە پاش ماوەیە کەزانی پاشا زۆر سەرگەردانەو ئەیەوێ مانای خەوەکەی بزانێ، ئەو ڕزگاربووە ووتی:

﴿ أنأ اُنبئكُمْ بِتأويْلِهِ فَاْرسِلُونِ ﴾ من هەواڵدەدەم بە ئێوە بە کەسێ مانای ئەو خەوەی پاشا بداتەوە. دوایی ئێوە من ڕەوانە بکەن بۆلای ئەو کەسەو ئێستا لەگرتوخانەیە. دوایی پاشا ئەو کەسە نارد بۆلای یوسوف ووتی:

﴿ يُوسُفُ أيُها الْصّديْقُ اَفْتِنا في سَبْعِ بَقَراتٍ يَأكُلُهُنّ سَبْعُ عِجافٍ ﴾ ئەی یوسوف: ئەی کەسێ کەڕاست وێژی لە هەمو گوفتارێ لە مەوبەر لە گەڵ ئێمە ئەت کرد لە گرتوخانەدا وەڵامی مانای خەوەکانی ئێمەت لێك دایەوە، تۆ هەواڵ بدە بە ئێمە بۆ خەوێ پاشا بینیویەتی لەبارەی حەوت گای قەڵەو حەوت گای لەڕ ئەیان خواردن .

﴿ وَسَبْعُ سُنْبُلاتٍ خُضْرٍ وَأخَرَ يابِساتٍ لَعلي اَرْجَعُ إلى الناسِ لَعَلَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾ وەلەبارەی بینینی حەوت گوڵی سەوز و حەوت گوڵی ووشك، بۆ ئەوەی من بگەڕێمەوە بۆلای ئادەمیزادی لای پاشا بۆلای پاشا بە تایبەتی، بۆئەوەی ئەوان بزانن بەزانیساری تۆ لەدوای ئەوەی تۆ مانای ئەو خەوەت لێك دایەوە، تۆیش لەئەنجامدا ببی بەخاوەنی پلەو پایەی بەرز لەدوای دەرهێنانت لەگرتوخانە .

﴿ قَالَ تَزْرَعُونَ سبع سِنِين دَأبا ﴾ یوسوف ووتی مانای ئەو خەوە ئەوەیە بچێنن دانەوێڵە حەوت ساڵ لەسەریەك بەبێ بچڕان، ئامۆژگاریتان ئەكەم بەردەوامبن لەسەری بەوجۆرەیٚ خۆتان لەمەوبەر بەرهەمتان ئەهێنا هەتا بەروبوم و دانەوێڵەتان زۆر ببێ .

﴿ فَما حَصَدْتُمْ فَذَروها في سُنْبُلِهِ إلا قَلِيْلاً مِمّا تَأكُلُونَ ﴾ دوای ئەوەی دروێنەی بەروبوم و دانەوێڵەكەتان كرد لەپاشا ئیوە پێویستە لەسەرتان وازی لێ بهێنن و ئاگاداری بكەن لە نێو گوڵەكەیدا مەگەر كەمێكی نەبێ كەئێوە ئەی خۆن، هیچ شتێكی لێ وەرمەگرن مەگەر بە ئەندازەی پێویستی خۆتان كە بیكوتن و پاكی بكەن بۆ خواردن .

﴿ ثُمَّ يأتي بَعْدَ ذَلِكْ سَبْعٌ شَداذٌ يَأكُلْنَ ماقَدمتُمْ إلا قَلِيْلاً مِمّا تُحْصِنُونَ ﴾ لەپاش ئەو حەوت ساڵە زۆرتان لەواندا هەڵ گرتوە حەوت ساڵی سەخت وگرانی پەیدا ئەبێ یەهۆی كەم ئاوی نیل و كەم بارانیەوە، دانیشتوانی شار لەوحەوت ساڵە گرانیەدا ئەی خۆن ئەو دانەویلەیە ئێوە پاشەكەوتتان كردوە هەڵتان گرتوە لەو حەوت ساڵە هەرزانیەدا مەگەر كەمێ لەودانەوێڵە نەبێ كەهەلتان گرتوە مەی خۆن هەتا هەڵی بگرن و بیكەن بەتۆو بیچێنن هەتا ڕەگەزی ئەو دانەوێلانە بنەبڕ نەبن پاش كۆتایی ساڵە گرانیەكان .

﴿ يأتي مِنْ بَعْدَ ذَلِكْ عامٌ فِيهِ بغاث النّاسِ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ ﴾ لە پاش ئەو حەوت ساڵە گرانیە ساڵێك دێت ئادەمیزاد لەو ساڵەدا یاریدەیان ئەدرێ لەلایەن خواوە بارانی زۆریان بۆ دەبارێ و خۆش حاڵ ئەبن، هەر لەو ساڵەیشدا دانیشتوان دەرئەهێنن پیت و پێویستی خۆیان لە باخ و بۆلاخیان ،وەك ڕۆنی زەیتون و دۆشاو و مەی و شتی تر بۆ خواردن و خواردنەوەیان .

ئاوگێڕ و ئارەق گێڕی پاشا مانای خەوەكەی بردەوە بۆ پاشا و دانیشتوان لە مانا دانەوەی خەوەكە گەیشتن .پاشا ویستی بە تەواوی ڕاستی ئاو گێرەكەی بۆ دەربكەوێ و خۆی لە دەمی یوسوفەوە ببیستێ و شتی تریشی پێ ڕون بكاتەوە ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى

بِهِۦ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسْـَٔلْهُ مَا بَالُ

ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ﴿٥٠﴾ قَالَ مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ قُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٥١﴾ ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٣﴾

﴿ وَقالَ الْمَلِكَ اءْتُوني بِهِ فَلَّما جاءَ الرَّسُولُ قالَ ارْجَعْ إلى رَبِّكَ ﴾ وە پاشا ووتی: ئێـوە یوسوف بهێنن بۆلای من، ئاو گێڕەکەی پاشایان نـاردەوە بـۆ لای یوسـوف و پێـی ووت: وەرە بۆ لای پاشا، دوایی ئەو نێرراوە چو بۆ لای یوسوف، یوسوف ووتی: تۆ بگەڕێوە بـۆ لای گەورەی خۆت کە پاشایە .

﴿ فَاسأَلْهُ مابالُ النِّسْوَةَ اللاَّئي قَطّعْنَ أيْدِيَهُنَّ ﴾ دوایی تۆ پرسیاربکە لە پاشا کاری ئەو ژنانەی ئەوتۆ چ شتێ بو دەستی خۆیاننیان بڕی، داوا بکە لە پاشا لەوکارە بکۆڵێتەوە هەتا بۆی دەربکەوێ من پـاکم، ئەوکاتـە مـن دێمـە دەرەوە لـە گرتوخانـە بـە سەربەسـتی و ڕوسوری .

﴿ إنَ رَبّي بِكَيْدِهنّ عَلَيْمٌ ﴾ بەڕاستی پـەروەردگاری مـن بـەفێڵ و پیلانـی ئـەو ژنانـە ئەزانێ و منیشی پاراستوە لـە گوناە. بەڵام پاشا نازانێ بەو شتە ئـەو ژنانـە کردویانـە، بـۆ ئەوەی پاشا من بناسێ و بزانێ من کێم. نێرراوەکەی پاشا گەڕایەوە بۆلای پاشا و هەواڵی

دایە کە یوسوف نایەتە دەرەوە لەگرتوخانە هەتا پاشا نەکۆڵێتەوە هۆی بەند کردنی من چ شتێ بوە ؟ پاشا بەبێ وەستان فەرمانی دا بەئامادەکردنی ئەو ژنانەو ژنەکانیان هێنا بۆلای پاشا .

﴿ قالَ ما خَطْبُكُنَّ إذا راوَدْتُنَّ يُسُوفَ عَنْ نَفْسِهِ ﴾ پاشا ووتی: ئەو ڕوداوە گرنگ و دڵتەزێنە چ شتێبو کاتێ ئێوە داواتان کرد لەیوسوف کەلەشی خۆیتان بداتێ وئاواتی خراپتان بهێنێتە دی ؟

﴿ قلنْ حاشَ للهِ ماعَلِمْنا عَلَيْهِ مِنْ سُوءٍ ﴾ ژنەکانیان ووتیان: پاکی وخاوێنی بۆخوایە و داوێن پاکی یوسوف جێگەی سەرسوڕمانە، ئێمە هیچ خراپەیەکمان نەزانیوە بەسەر یوسوفەوە بێ کە نیازی خراپەی کردبێ و گوناهی گەورە و بچوکمان لێ نەدیوە .

﴿ وَقالَتْ إمْرَأةُ العَزيْزَ ألآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ أنا راوَدْتُهُ عَنْ نَفْسِهِ ﴾ ژنەکەی عەزیز ووتی: ئێستا ڕاستی یوسوف دەرکەوت، دوای ئەوەی ئەو ڕاستیە داپۆشرا بو، من داوای کاری خراپم کرد لە یوسوف و خۆی لەگەڵم ڕاکشێ. بەبێ شەرمانەوە دەری ئەبڕم یوسوف هەرگیز نیازی خراپەی لەگەڵ من نەکردوە، من برواتان پێ ئەدەم هەرشتێ یوسوف ئەیڵێ ڕاستە .

﴿ وَإنَهُ لَمِنَ الْصادِقِيْنَ ﴾ وە بەڕاستی یوسوف لەوکەسانەیە ڕاست وێژن و ڕاستە لەو گفتوگۆیەی لەگەڵ عەزیزی کردوە کە زولەیخا داوای کاری خراپی لەو کردوە .

﴿ ذِلِكَ لِيَعْلَمَ أني لَمْ أخُنْهُ بِالغَيبِ ﴾ ئەو داوایەی من و نەهاتنەدەرەوەی من لەگرتوخانە، لەبەرئەوەیە عەزیز بزانێ کە بەڕاستی من لە نهێنیدا ناپاکیم نەکردوە لەگەڵ ئەو، چونکە ڕێزە منی داوەتە دەست خێزانی خۆی، ئەبێ من چۆن ناپاکی بکەم لەگەڵ خێزانی کەسێ منێ بەکوڕی خۆی دانابێ.

﴿ وَأنَ اللهَ لايُهدي كَيْدَ الْخائِبِيْنَ ﴾ وەبەڕاستی خوا سەرناخاو یارمەتی پیلانی ناپاکان نادا، ئەوەبوو خوا پیلانی ژنی عەزیزی پوچ کردەوە. لە پاشا یوسوف ئەیەوێ بچوکی خۆی بۆ خوا دەربخا و خۆی بشکێنێ ووتی :

﴿ وَما أبري نَفْسي إنَ النَفّسَ لآمارَةٌ بِالسُوءِ ﴾ وە من خۆم پاك ناكەمەوە لــە خراپـە . بەڕاستی دەرونی مرۆڤ بە زۆری مەیل ئەكا بۆلای خراپە ؟.

﴿ إلآ ما رَحِمَ رَبّي إنَ رَبّي غَفُورٌ رَحيمٌ ﴾ مەگەر كەسێ پەروەردگاری مـن میـهرەبانی لەگەل بكاو بیپارێزێ لە خراپە و گوناه وەك پێغەمــەران و دۆسـتنای خـوا ، بەڕاسـتی پەروەردگاری من خــۆش ئـەبێ لــەگوناهی بـەندەكانی خـۆی ، میهرەبانـە بـۆ پاراسـتنی دەروونی بەندەكانی خۆی .

ئەی پەروەردگار : یاریدەی خۆم وخێزانم بدە لەسەر

بەرپاكردنی ئایینی خۆت و ڕۆژوی

مانگی ڕەمەزانم لێوەربگرە

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سوپاسی بیٚ پایان بۆ پەروەردگاری هەمو بونەوەران، درودی زۆر لەسەر پێشەوای مەزن و ڕابەری هەمو ئادەمیزاد و لەسەر هاوڕیٚو یاوەرانی بیٚ .

پاش ئەوەی ژنەکەی عەزیز وژنەکانی تر شایەتیان دا لەسەر خۆیان، دانیشتوان بۆیان دەرکەوت یوسوف پاك و بیٚشورەییە، لەدوای ئەوەی پاشا فەرمانی دەرکرد ئێوە یوسوفم بۆ بهێنن، یوسوف لەگرتوخانە هاتە دەرەوە. پاشا داوای لەیوسوف کرد ببیٚ بەگەورەی‌شاری میسر و یاریدەی بدا لە هەڵسوڕاندنی کاروباری نیشتمانا. پاشا کەکۆبویەوە لەگەڵ یوسوفدا خۆشەویستی یوسوف لە دڵیدا چەقی، بۆڕون کردنەوەی ئەو مەبەستە خوا ئەفەرمویٚ :

وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِي بِهِۦٓ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴿٥٤﴾ قَالَ ٱجْعَلْنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴿٥٥﴾ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَلَأَجْرُ ٱلْأٓخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٧﴾

﴿ وَقالَ الْمَلِكُ ائْتُوني بِهِ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِيْ ﴾ پاشا ووتی بەپیاوەکانی: ئێوە یوسوف بهێنن بۆلای من ئەیکەم بەفەرمانبەرداری پوختەی خۆم وهاوکارم بیٚ لە هەڵسوڕاندنی کاروباری نیشتمانا، پیاوەکانی چوون و یوسوفیان هێنا بۆلای پاشا .

﴿ فَلَمّا كَلَّمَهُ قالَ إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴾ دوایی کاتێ پاشا گفتوگۆی کرد لەگەڵ یوسوفا. مانای لێکدانەوەی خەوەکەی لێ پرسی و لێی تێگەیشت، ووتی بەیوسوف: بەڕاستی تۆ جێگەی بەڕێزت هەیە ئەمڕۆ لەلای ئێمەو بڕوا پێکردوو دەست پاکی ئێمەی لەسەر کاروباری پاشایەتی مندا دات ئەنێم .

دوای ئەوەی پاشا یوسوفی سەربەست کرد بۆ هەرپلەو پایەیە خۆی ئارەزووی لێی بێ، یوسوف بۆ خۆی هەڵبژارد سەرپەرشتی گەنج و ئابوری نیشتمان، یانی بوبە شالیاری ئابووری ودارایی .

بەڕاستی یوسوف ئەیزانی نیشتمان بەرە و گرانی و پەشێوی ئەڕوا ، ئەگەر بێتو سەرپەرشتی‌کەری دارایی مرۆڤێکی زاناو پسپۆرت نەبێ بۆ هەڵسوڕاندنی بەروبومی نیشتمان مافی دانیشتوان پێشێل ئەکرێ بە تایبەتی هەژاران و ژێردەستەکان. ئەوە لەلایە، لەلایەترەوە دارایی ژیان و مانەوەی ئادەمیزاد ئەگەر بەدەستی مرۆڤێکی ژیرو زاناو دەست پاکەوە نەبێ پاشەڕۆژی دانیشتوان بەرەونەمان ئەچێ بگرە لە سالانی هەرزانیشدا. بەلام هەرکاتێ بەدەست مرۆڤێکی داناو دەست پاکەوە بێ دانیشتوان بەرەوخۆشی و ئاسایش ئەڕۆن، بۆیە یوسوف ووتی: لەبەرسودی گشتی نەك بۆ سودی خۆی و خۆی بەچاك بزانێ .

﴿ قالَ اجعَلْنِي عَلَى خَزائِنَ الآرْضِ ﴾ یوسوف ووتی بەپاشا: تۆ من دابنی لەسەر گەنج وبەروبوم و دارایی و ئابوری و خواردەمەنی زەوی میسر و هەمو ئەو شتانەی دانیشتوانی پێ ئەژین .

﴿ إني حَفِيْظٌ عَلِيْمُ ﴾ بەڕاستی من مرۆڤێکی ئاگادارم بۆ پاراستنی ئابووری زەوی و نایەڵم بەفیڕۆ بچێ لە سالانی گرانیدا، ئەزانم بەچۆنیەتی بەشکردنی بەروبوم بەشێوەیەکی دادپەروری و ئەزانم چ کەسێ شایانی ئەوەیە خواردەمەنی بدرێتێ، هەمو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێم لەسالانی گرانیدا. دانیشتوان کەبەدادپەروەری و چاکی وپسپۆری و زانایەتی یوسوفیان زانی و بۆیان دەرکەوت کە ئابوری دانیشتوان ئەپارێزێو نایەڵێ

مافی هیچ کەسێ ژێر پێ‌بکرێ. پاشا و زۆربەی دانیشتوان باوەڕیان بەخوای تاك و تەنها هێنا، بە پێغەمەرایەتی یوسوف باوەڕیان زۆرتر بو .

﴿ وَكَذَلِكَ مَكَّنَا لِيُوسُفَ فِي الآرْضِ ﴾ وەهەر بەوجۆرەی یوسوفمان ڕزگارکرد لەخراپەی براكانی و لەفریودانی زولەیخاو ژنانی میسر و لەگرتوخانە، ئێمە جێگەی بەرزمان بەخشی بەیوسوف و پلەو پایەی بەرزمان دایە و بەهێزمان کرد لەزەوی میسردا، خۆشەویستی یوسوفمان لەدڵی پاشادا چەسپاند .

﴿ يَتَبوأ مِنْها حَيْثُ يَشاءُ ﴾ جێگەی خۆی بگرێ لەزەوی میسردا لەهەرشوێنێ خۆی ئارەزووی هەبێ لەوێدا نیشتەجێ بێ فەرمان ڕەوای خۆی بکا .

﴿ وَلانُضِيْعُ أجْرَ الْمُحْسِنِيْنَ ﴾ وە ئێمە لەناو نادەین وپوچی ناکەینەوە پاداشتی چاکەکەران لە جیهاندا بەگورجی بێ یا لە پاش ماوەیەبێ، هەریەکە بە گوێرەی کردەوەی خۆیان پاداشتیان ئەدەمەوە .

﴿ وَلَأَجْرُ ألآخِرَةُ خيرٌ لِلَّذِيْنَ آمَنُوا وَكانُوا يَتَقُونَ ﴾ وە پاداشتی ڕۆژی دواویی کەبەهەشتە چاکترە لەپاداشتی جیهان بۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوەو خۆیانیان پاراستوە لە گوناەکردن بە تایبەتی داوێن پیسی و پەرستنی جگەی خوا .

گرانی لەو حەوت ساڵانەی دواییدا درێژەی سەندو پەرەی سەند بۆ شارەکانی دراوسێی میسر بەزۆری لە کەنعان کە ئەو جێگەیە یەعقوبی باوکی یووسفی تێدایە، لە دەرەوەی میسر بڵاوبویەوە کە عەزیزی میسر پێویستی ژیانی ئادەمیزادی ئامادەکردوە بەتایبەتی بۆ هەژاران. یەعقوب بەوبۆنەوە فەرمانی دا بەکوڕەکانی بڕۆن بۆ میسر و خواردەمەنی بکڕن، ئەوانیش کەوتنە ڕێ و بەرەو میسر چون، وەك خوا ئەفەرموێ :

وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَمَّا

جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ قَالَ ٱئْتُونِي بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ ۚ أَلَا تَرَوْنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٥٩﴾ فَإِن لَّمْ تَأْتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِندِي وَلَا تَقْرَبُونِ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ سَنُرَٰوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ﴿٦١﴾ وَقَالَ لِفِتْيَٰنِهِ ٱجْعَلُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ فِي رِحَالِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٦٢﴾

﴿ وَجاءَ إِخْوَةُ يُسُوفَ فَدَخَلُوا عَلَيْهِ ﴾ وەبراكانی یوسوف چونە بۆ لای یوسوف، دوایی براكانی چونە لای یوسوف لەوجێگەیە كەشالیاری ئابووری سەرپەرشتی كەری خوادرەمەنی تێدا دائەنیشێ .

﴿ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُ مُنْكِرُونَ ﴾ دوایی كە یوسوف چاوی بە براكانی كەوت ناسینیەوە، ئەوان یوسوفیان نەناسیەوە، چونكە ئەوان یوسوفیان بەمناڵی دیبو، گومانیان نەئەبرد بەپلەو پایە گەیشتبێ .

﴿ وَلَمّا جَهَزَهُمْ بِجِهازِهِمْ ﴾ وەكاتی یوسوف ئامادەی كرد بۆ براكانی خواردەمەنی و هەمووشتێ پێویستیان پێی هەبو كەبۆی هاتون، میوانداریەكی زۆر بەنرخی بۆ ڕازاندنەوە. كەوتە گفتوگۆ لەگەڵیان، براكانی باسی ژیانی خۆیان و باوكیانی بۆ كردن. ووتیان برایەكی باوكی مناڵمان هەیە، یوسوف ڕێزی زۆری لێ گرتن هەتا بكەوێتە دڵیان جارێ تر بگەڕێنەوە بۆلای، بۆیە .

﴿ قالَ ائْتوني بِأخٍ لَكُمْ مِنْ أبِيكُمْ ﴾ یوسوف ووتی: پێویستە ئێوە بێنەوە بۆلای من بەو برایەتانەوە باوكیتانەو بەجێتان هێشتوە لای باوكتان .

﴿ أَلا تَرَوْنَ إِني أُوفي الْكَيْلَ ﴾ ئایا ئێوە نابینن کەبەڕاستی من ئەپێوم ئەو شتەی ئەپێورێ بۆ ئێوە بەتەواوی بەبێ کەم و کوڕی، مافی هیچ کەسێ ناگێڕمەوە و نای گرمەوە. باری هوشترێ تر ئەنێرم بۆ ئەو برایەتان .

﴿ وَأَنا خَيْرُ الْمُنْزِلِيْنَ ﴾ وەمن چاکترین کەسێکم بۆ میوانداری مەردمان. ئەوەتە ئەبینن من بەڕێزەوە میوانداری ئێوە ئەکەم، دوایی ئێوە ئەگەر بیچنەوە بەو برا باوکیەتانەوە خواردەمەنیش ئەدەم بەو بەبێ‌کەم وکوڕی جگەی بارەکانی خۆتان و ڕێزیشی لێ‌دەگرم وەك ڕێزی ئێوە .

﴿ فَإِنْ لَمْ تَأْتُونِي بِهِ فَلاكَيْلَ لَكُمْ عِنْدي وَلاتَقْرَبُونَ ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە نەیەنەوە بۆ لای من بەو برایەتانەوە، دوایی خواردەمەنی بۆ ئێوە ناپێوم لەلای خۆمەوە نزیکی من مەکەونەوە و میوانداریتان ناکەم وەك ئێستا .

﴿ قالُوا سَنُراوِدُ عَنْهُ أَباهُ ﴾ براکانی یوسوف ووتیان: ئێمە داوائەکەین لەباوکی چاوپۆشی لەهاتنی لەگەڵ ئێمەدا بکا بۆلای تۆ هەرچەندە لای باوکی گرانە .

﴿ وَإِنا لَفاعِلُونَ ﴾ وەئێمە ئەوکارە ئەکەین و سستی تێداناکەین و هەمو توانای خۆمان ئەخەینە کارەوە بۆ هاتنی ئە وبرایەمان بۆلای تۆ، چونکەئەیانزانی باوکیان باوەڕیان پێ‌ناکا لەوکاتەوە ئەوکارەی پێشویان لەگەڵ یوسوف کردوە.

﴿ وَقالَ لِفِتْيانِهِ اجْعَلُوا بِضاعَتِهِمْ فِي رِحالِهِمْ ﴾ وە یوسوف ووتی بەخزمەت گوزارەکانی خۆی و یاریدەدەرانی لەپێوانەدا: ئێوە ئەوشتانە هێناویانە لە کەوش و میوە و کاغەزو خواردەمەنی پێ بکڕن بیخەنە نێو بارەکانیانەوە .

﴿ لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَها إِذا انْقَلَبُوا إِلى أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ بۆئەوەی مافی گەڕانەوەکەی ومافی ڕێزگرتن بناسن کاتێ گەڕانەوە بۆ لای خێزانەکانیان و بارەکانیان خاڵی کرد، لەبەرئەوەی بەو چاکە بزانن و بگەڕێنەوە بۆ ئێرە بەو برای منەوە، مەبەستی یوسوف لەو کارە ئەوە بوو هانیانبدا بۆ گەڕانەوە و باوکیشی لای گران نەبێ براکەی بنێرێ لە گەڵیان .

فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمْ قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلْكَيْلُ فَأَرْسِلْ مَعَنَآ أَخَانَا نَكْتَلْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿٦٣﴾ قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَـٰفِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَمَّا فَتَحُواْ مَتَـٰعَهُمْ وَجَدُواْ بِضَـٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا مَا نَبْغِى هَـٰذِهِۦ بِضَـٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴿٦٥﴾ قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأْتُنَّنِى بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٦٦﴾

﴿ فَلَّما رَجَعُوا إلى أبِيهِمْ قالُوا ياأبانا مُنِعَ مِنّا الْكَيْـلُ ﴾ دوایـی کـاتێ براکـانی یوسـوف گەڕانەوە بۆلای باوکیان کە یەعقوبە کوڕەکـانی یـەعقوب ووتیـان: ئـەی بـاوکی ئێمـە: قەدەغەئەکرێ لەئێمـە پێوانـەی خواردەمـەنی ئەگـەر لەمـەودوا بگەڕێینـەوە بـۆ کڕینـی خواردەمەنی بۆلای عەزیز، ئەگەر بینامینی برامان نەنێری لەگەڵمان .

﴿ فَأَرْسِلَ مَعَنْا أخانا فَإنا لَهُ لَحافِظُونَ ﴾ دوایی ئەی بـاوکی ئێمـە: تـۆ ڕەوانـە بکـە لەگەڵ ئێمەدا بینـامینی بـرای ئێمـە هـەتا ئێمـە بتوانـین خوادرەمـەنی بکڕیـن و بـپێوین

خواردەمەنی پێویستی خۆمان لەگەڵ ئەوبرایەماناو، بەڕاستی ئێمە ئاگاداری ئەو ئەکەین، بەڵێنیان دا بە باوکیان ئاگاداری بینامین بکەن بۆ ئەوەی نەبن بەجێگەی گومانی باوکیان.

﴿ قالَ هَلْ آمَنَكُمْ عَلَيْهِ إلا كَما آمَنْتُكُمْ عَلى أخِيكُمْ مِنْ قَبْلُ ﴾ یەعقوب ووتی بەکوڕەکانی: ئایا من چۆن بڕوا بەئێوە بکەم لەسەر ئاگاداری کردنی بینامین مەگەر من بڕوام هەروەك ئەوەبێ بڕوام پێ‌کرد ن لەسەر چاودێری کردنی یوسوف. دوایی یەعقوب ڕوی لەکوڕەکانی وەرگێڕاو پەنای برد بۆلای خوا ووتی:

﴿ فَاللهُ خَيْرٌ الْحافِظاً وَهُوَ أرْحَمُ الْراحِمِيْنَ ﴾ دوایی هەرخوا چاکترە لەهەمو کەسێ لەبارەی پاراستن وئاگاداری‌یەوە. گەواتە من هەرپشت بەخوا ئەبەستم. نەك لەسەر ئاگاداری ئێوە و، خوا میهرەبانترینی هەمو میهرەبانانە. داوا لەخوا ئەکەم بەزەیی بەمنا بێتەوەو کۆنەکاتەوە لەسەر من دووخەفەت و ئاگای لەپیری من بێ.

یەعقوب بەو فەرمودانەی خۆی بیری لەڕەوانەکردنی بینامین ئەکردەوە لەگەڵ براکانی ئایا بینێرێ لەگەڵیان. بەلاّم بۆیە ناردی لەگەڵیان، چونکە ئەی بینی لەنێوان ئەوان و بینامن کینەو دڵ پیسی نیە بەو وێنەیە لەنێوان ئەوان و یوسوفدا هەبو، ئەیشی زانی گرانی زۆری سەندوە وپێویستیان بەوە هەیە جاری تر بگەڕێنەوە بۆ میسرو بۆ هاوردنی خواردەمەنی .

﴿ وَلَمّا فَتَحُوا مَتاعِهِمْ وَجَدوا بِضاعَتِهِمْ رَدَّتْ إلَيْهِمْ ﴾ وە کاتێ بارەکانیان خستو کردنیانەوە دەستیان کەوت لەنێو بارەکانیانا نرخی ئەو خواردەمەنی یە دابویان بەیوسوف گێڕراوەتەوە بۆلایان، دوایی بەپەلە ڕایان کرد بۆلای باوکیان بەدڵشادیەوە وبەخۆشیەوە.

﴿ قالُوا ياأبانا مانَبْغِي ﴾ کوڕەکانی یەعقوب ووتیان: ئەی باوکی ئێمە: زیاتر لەسەر ئەوەی عەزیز ڕێزی ئێمەی گرت و چاکەی لەگەڵ کردین و خواردەمەنی پێ فرۆشتین و ئەو نرخەی داومانەتێ گێڕاویەتیەوە، ئێمە داوای چ شتێ لەو بکەین ئەگەر بینامینی برامان لەگەڵدا نەنێری بۆلای عەزیز و چۆن بیانووی بۆ بهێنینەوە لەگەل ئەو چاکانەدا ؟ ئێمە بەڕاستی دەرناچین و چ شتێ بلّێین ؟

﴿ هذِهِ بِضاعَتُنا رُدَّتْ إلَيْنا ﴾ ئەمەیش ئەونرخەیە ئێمە بردومانە پێویستی خۆمانی پێ‌بکڕین گێراوەتەوە بۆلای ئێمە، خواردەمەنی و پێویستیمانی بەخۆڕایی دراوە پێمان لەلایەن عەزیزەوە ئیتر ئێمە چۆن بەفەرمانی ئەو هەڵنەسین .

﴿ وَنَمِيْرُ أهْلَنـا وَنَحْفَـظُ أخانـا ﴾ وەئێمـە خواردەمـەنی ئـەهێنین بـۆ خێزانـەکانمان و براکگەیشمان ئەپارێزین لـەهەموو ڕوداوێ ڕوی تیٚبکا .

﴿ وَنَزْداد كَيْلَ بَعِيرٍ ﴾ وەئێمە بۆمان زۆرتر ئەبێ باری هوشترێ لـەخواردەمەنی بـەهۆی هاوڕێتی ئەو برایەمانەوە ئەگەر لـەگەڵ مان بێ .

﴿ ذَلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴾ وەئەوبارەی بۆ ئێمە زیادبکرێ لـەخواردەمەنی ئاسانە لای پاشـا، ئەوەی بمان درێتێ زۆر کەمە ئەگەر بینامینمان لـەگەڵ نەبێ وئەوبارەمان لـەکیس ئەچێ.

یەعقوب کەبینی پێویستیان بە خواردەمەنی زۆرتر هەیە، ئەوەی هێناویانە نزیکە کۆتایی پێ بێ لـەبەرئەوە لـە دڵی خۆیا بڕیاری دا بینامینیان لـەگەڵ بنێرێ بۆ لای عەزیز. یەتاییـەتی بڕوای بەعەزیز پەیداکرد بەوبۆنەوە ئەوکارە چاکانـەی لـەگـەڵ کوڕەکـانی کـردوە هـەر لـەبەرئەوەی خواردەمەنیەکەیان کەم بوەتەوە نەك لـەبەر دڵی براکانی یوسوف .

﴿ قَالَ لَنْ أرْسِلَهُ مَعَكُمْ حَتّى تُؤتُوني مَوْثِقاً مِـنَ اللهِ ﴾ یـەعقوب فـەرموی: مـن بینـامین لـەگەڵ ئێوە ڕەوانە ناکەم هەتا ئێوە نـەیدەن بـەمن پـەیمانێ لـەلایـەن خـواوە بـەتوندی بـۆ پاراستنی بینامین و سوێندم بۆ نەخۆن .

﴿ لَتَأتُونَني بِهِ إلاّ أنْ يُحـاطَ بِكُـمْ ﴾ کەبەڕاسـتی ئێـوە بینـامین بەسـاغی وبـەبێ ئـازار بهێننەوە بۆ لای من مەگەر ئێوە زۆرتان لێبکرێ وئێوە چارەتان نەمێنێ و خۆیشتان لـەناو بچن، لـەخزمەت یەعقوبا سوێندیان خوارد کەمتەرخەمی نەکەن لـەپاراستنی بینامیندا.

﴿ فَلَمّا آتُو مُّوثِقُهمْ قالَ اللهُ عَلى مانَقُولُ وَكَيْلٌ ﴾ دوایی کاتێ کوڕانی یەعقوب پـەیمان وسـوێند یـان بـۆ یـەعقوب خـوارد بـەگیانی خۆیـان بینـامین بپـارێزن و خۆیـان بکـەن بەدەردۆ گێڕی بینامین .

لـەوکاتەدا یەعقوب فەرموی: خوا لـەسەر شتێ ئێمە ئـەیڵێین: لـەداواکردنی پـەیمان و هێنانەوەی بینامین چاودێری کەرو ئاگاداربێ لـەنێوان ئێوەدا .

پاش ئەوپەیمان دانە بەیەعقوب و سـوێند خـوادرن بـۆی و ئاگـاداری کردنـی بینـامین دەستوری دا بەچونی بینامین لـەگەڵ براکـانی بـۆ لای عـەزیز بـەم ئامۆژگاریانـەی لای خوارەوە هەڵسن:

وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدْخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدْخُلُواْ مِنْ أَبْوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغْنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍۖ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُۖ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ وَلَمَّا دَخَلُواْ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغْنِي عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ إِلَّا حَاجَةٗ فِي نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَىٰهَاۚ وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٖ لِّمَا عَلَّمْنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾

﴿ وَقالَ يابُنَيَّ لاتَدْخِلوا مِنْ بابٍ واحدٍ ﴾ ویەعقوب فەرموی: ئەی کوڕانی خۆم: ئێوە مەچنە نێو شارەوە لەیەك دەرگاوە، بۆ ئەوەی دانیشتوان بەکۆمەڵ نەتان بینن بەم شۆخی و ڕێك وپێکیەوە هەتانەو دڵتان لێ پیس نەکەن و بین بەچاوەوە.

﴿ وَأدْخُلُوا مِنْ أبْوابٍ مُتَفرِقة ﴾ وەئێوە بچنە نێو شارەوە لەچەند دەرگایەکی جیاوازەوە ،بۆ ئەوەی لەچاوی پیس ودڵی پیسی دانیشتوان خوا بتانپارێزێ. بەووردی هەواڵی شار بزانن بەڵکو هەواڵێکی یوسوف بزانن، هەروەها یەعقوب ڕای سپارد بەکوڕەکانیا سلاوی من بگەیەنن بەعەزیز، بەو ڕابگەیەنن داوای چاکەی بۆ ئەکەم لای خوا، سوپاسی ئەکەم میوانداری ئێوەی کردوە، کاتێ کوڕەکانی ئەو ڕاسپاردەی باوکیان بە یوسوف گەیاند گریا .

﴿ وَماأغْني عَنكُمْ مِنْ شَيءٍ إنَ الْحُكْمُ إلا اللهِ ﴾ ئەگەر خوا ویستبێتی خراپە یە توشی ئێوە بکا ئەوەی من ئاماژەم پێ کرد بۆتان لەوەی بەکۆمەڵ مەچن سودێ بەئێوە نابەخشێ

بێگومان توشتان ئەبێ، هەرشتێ خوا دیاری کردبێ من نای گێڕمەوە، فەرماندان و بەڕێوبردنی کاروباری بونەوەران بۆ کەس نیە مەگەر بۆ خوایە وبەفەرمانی خوایە .

﴿ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ ﴾ من پشت هەربەخوا ئەبەستم و هەرپاڵ بەخواوە ئەدەم، بڕوام بەخوا هەیە یاریدەم بێ کەواتە ئەوکەسانەی خاوەن بڕوان بڕوایان بەخوا هەبێ ودوایی با کاری خۆیان هەواڵەی خوا بکەن .

﴿ وَلَمَّا دَخَلُوا مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُمْ ﴾ وە کاتێ کوڕانی یەعقوب چونە نێو شاری میسر لەو جێگانەوە باوکیان فەرمانی پێ دابو لەچەند دەرگایەکەوە بچنە ژورەوە .

﴿ ماكانَ يُغْني عَنْهُمْ مِنَ اللهِ مِنْ شَيءٍ ﴾ چونە ژورەوەی کوڕانی یەعقوب لە چەند دەرگای جیاوازەوە بەگوێرەی فەرمانی باوکیان هیچ سودێکی بەوان نەبەخشی لەخزمەت خوادا و خراپەی لێ نەگێرانەوە. ئەوە بوو گومانی دزی کردنیان پێ بردن بەهۆی دۆزینەوەی مەنی پاشا لەباری بینامیندا وبینا مینیان گرت، ئەوانیش بە دڵشکاوی و خەفەتەوە چونەوە بۆلای باوکیان و ناخۆشیەکانیان دووپات بویەوە. سوودی ئەو چونە ژورەوەیە لە چەند دەرگایەکەوە هیچ شتێ نەبوو:

﴿إلا حاجةً في نَفْسِ يَعْقُوبَ قضاها ﴾ مەگەر لەبەر پێویستیە بو لە دەروونی یەعقوبا کە خوا فەرمانی جێ بەجێ بکا و دەریبڕێ کە ئەویش بێوەی یوسوف و بینامینی برایەتی و کۆببنەوە بەیەکەوە. بەڕاستی خوا ئەوشتەی یەعقوب مەبەستی بوو بەچاکترین شت بۆی جێبەجێ کرد، مەبەستێ تری یەعقوب ئەوەبوو کوڕەکانی خۆش ئەویست توشی خراپە نەبن و نەبن بەچاوی پیسەوە .

﴿ وَإِنَّهُ لَذُو عِلْمٍ لِمَا عَلَّمْنَاهُ ﴾ وەبەڕاستی یەعقوب خاوەنی دانش و زانیاری و باوەڕبو بۆ شتێ ئێمە فێری یەعقوبمان کردبو، بەهۆی سروشتی پاکی خۆیەوە کەیەعقوب ووتی: شتی خوا فەرمانی پێدابێ گەڕانەوەی بۆ نیە، زۆر ئاشکرایە یەعقوب پێغەمەرە و هەمو پێغەمەرانی خوا پەروەردەکراوی خوان، هەمویان خوایان لەبیر ناچێ و خاوەنی ئارامن و پشت هەر بەخوا ئەبەستن .

﴿ وَلَكِنْ اَكْثَرَ الْنَاسِ لايَعْلَمُونَ ﴾ وەبەلاْم زۆرترین ئادەمیزاد نهێنی و شاراوەکانی نازانن پاراستن بەبێ میهرەبانی خوا سودی نیە، ڕاوێژ و بیری ئادەمیزاد بەبێ یاریدەدانی خوا سودی نابێ .

زانایان ئەڵێن: کاتێ کوڕانی یەعقوب بۆجاری دووهەم گەڕانەوە بۆ میسر یوسوف بانگی کردن بۆ خواردن لەلای خۆی، دووکەس دووکەس دانیان لە لای یەکتری لەلای هۆدەکەیا، بینامین بەتەنها لە هۆدەیەکا مایەوە بەبێ هاوڕێ، یوسوف چو بۆلای ووتی: پێت خۆشە من برای تۆ بم. بینامین ووتی: برای وەك تۆ بۆمن پەیدا نابێ، بەلاْم یەعقوبی باوکم و ڕاحیلی دایکم تۆیان نەبوە، یوسوف ووتی: ئەوان منیان بوە و من برای تۆم، خەفەت مەخۆ بەو شتانە براکانمان لەگەڵ من و تۆیان کردووە، بینامین کوتوپڕ شادمان بو، سوپاسی خوای کرد و وەك خوا ئەفەرموێ:

وَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَخَاهُ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِى رَحْلِ أَخِيهِ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا۟ وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴿٧١﴾ قَالُوا۟ نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا۟ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٧٤﴾ قَالُوا۟ جَزَٰٓؤُهُۥ

مَن وُجِدَ فِي رَحْلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِۚ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلْمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُۗ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴿٧٦﴾

﴿ وَلَمّا دَخَلُوا عَلَى يُوسُفَ آوى إِلَيْهِ أخاهُ قالَ إِني انا أخُوكَ فَلا تَبْتَسَ بِما كانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ وەکاتێ کوڕانی یەعقوب چونە ژورەوە بۆ لای یوسوف باوەشی کرد بە بینامینداو لکاندی بەخۆیەوە و داینا لای خۆی، یوسوف ووتی بە بینامین بە نهێنی: بەڕاستی من برای تۆم، دوایی تۆ خەفەت مەخۆ بەهۆی ئەوشتەوە براکانت کردیان لەگەڵ من و تۆ، بیر لە ڕابووردوو مەکەرەوە هەتا دڵت ئازار پەیدا نەکا. یوسوف ویستی بینامین لە براکانی جوێ بکاتەوە و لای خۆی بیهێڵێتەوە، ئەو کارەی بۆ جوت نەئەبوو بەبێ بەهانەیە، بە گوێرەی یاسای ئایینی یەعقوب هەرکەسێ دزی بکردایە ئەیان کرد بە بەندە، بۆ ئەو مەبەستە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ فَلَمّا جَهَزَهُمْ بِجِهازِهِمْ جَعَلَ السِّقايَة فِي رَحْلِ أخِيْهِ ﴾ دوایی کاتێ یوسوف ئامادەی کرد بۆ براکانی پێویستی خواردەمەنی دا بەبراکانی، باری هوشترێ تری ئامادەکرد بۆ بینامینی برای، یوسوف سەرپەرشتی ئەو ئامادەکردنەی ئەکرد، خستیە نێو باری بینامینەوە کاسەی ئاوخواردنەوەی پاشا کەخواردەمەنیەکەیان پێ ئەپێوا کەیوسوف بارەکانی بۆ براکانی ساختە هێنا، براکانی دەستیان کرد بەبارکردنی بارەکانیان، لەوکاتەدا کارگوزاری یوسوف گەڕان بەم لاولادا کاسەمەنەکەیان دەست نەکەوت، گومانیان لەکوڕانی یەعقوب پەیداکرد کەمەنەکەیان دزی بێ، بەتایبەتی لەبینامینی برایان .

﴿ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُها العِيرُ إِنَّكُمْ لَسارِقُونَ ﴾ لە پاشا بە دەنگی بەرز بانگـەوازی کـرد جارچیەك ،ئەی کاروانی خاوەن هوشـتر: بەڕاسـتی ئێـوە دزیتـان کـردوە، کەواتـە ئێـوە هوشترەکانتان بارمەکەن هەتا تەماشای بارەکانتـان ئەکـەین، کوڕانـی یـەعقوب لـەوجارە سەریان سوڕما بەوکوتوپڕیە .

﴿ قالُوا وَأَقْبَلُوا ماذا تَفْقِدُونَ ﴾ کوڕەکـانی یـەعقوب ووتیـان وڕوویـان کـرد بـۆلای خزمەتکارەکانی یوسوف: چ شتێکتان لێ‌وونبوە؟ ئێوە بەشوێنیا ئەگەڕێن پەیدای بکەن .

﴿ قالُوا نَفْقِدُ صُواعَ الْمَلِكِ ﴾ جارچی وهاوڕێکانی ووتیان: ئێمە ئەگـەڕێین بەشـوێن ئەو مەنەی پاشادا دیاری کراوە بۆ پێوانەی خواردەمەنی و لێمان وونبوە.

﴿ وَلِمَنْ جاءَ حِمْلُ بَعِيرٍ ﴾ وە بـۆ کەسـێ هەیـە ئـەو مەنـە بهێنێتـەوە لـەخۆیـەوە بـە ئەندازەی باری هوشترێ لە خواردەمەنی، وە ئەوکەسەی جارەکەی دا ووتی:

﴿ وَأَنا بِهِ زَعِيمٌ ﴾ وە من بۆدانی ئەوبارە خواردەمەنیە بۆئەوکەسەی ئەی هێنێتەوە تـەن خواو داوالێ‌کراوی ئەو خوادرەمەنیـەم و بـەڵێن ئـەدەم بیدرێتـێ. ئـەو ڕسـتەیە بەڵگەیـە لـەسەرئەوەی ( الجعالە) جەعا لـە دروستەو زەمانەتی کرێکەی دروستە بەرلـەتـەواوکردنی کارەکمە. جەعالـەیش ئەمەیە: مرۆڤێ بڵێ بەکەسـێ تـر: هەرکەسـێ ئـەم کـارەم بۆبکـا ئەوەندە دراوی ئەدەمێ.

﴿ قالُوا تاللهِ لَقَدْ عَلِمْتُمْ ماجِئْنا لِنُفْسِدَ فِي الآرْضِ وَماكُنا سارِقِيْنَ ﴾ کوڕانـی یـەعقوب ووتیان بەڕاستی ئێوە ڕەگەزو ڕەوشتی ئێمەتان زانیوە لـەجاری پێشودا، لـەم جارەیشدابۆتان ڕوون بوەتەوە ئێمە نەهاتووین بۆشاری میسر و زەوی میسر کەئێمە خراپە بلاو بکەینـــەوە لـەم زەویدا، سوێند بەخوا ئەخۆین ئێمە دزنین و دزیمان نەکردوە نەخۆمان و نـەباوباپیرانمان بەگوێرەی خوڕەوشتمان. بەڵگەمان لـەسەر ڕاستی ئەوەیە جاری پێشوو کاتێ ڕۆیشـتینەوە بۆلای خێزانەکانمانتەماشامان کرد کەلو پەل ونرخی خواردەمەنیەکە لـەنێو بارەکانماندایـــە، وامان زانی بەنەزانین خراوەتە تێویان بەناڕاوەمان دانا خواردنیـان، هێنامانـەوە بـۆ عـەزیز. دانیشتوان ئەوکردەوەی ئێمەیان زۆر لابەرێزبوو بۆیان دەرکەوت دەست پاکین .

پرسیار/ یوسوف چۆن بەلایەوە ڕەوابوو ئـەو مەنـە بخاتـە نێـو بـاری براکەیـەوە هـەتا گومانی خراپە ئاراستەی براکانی بکریٚ و بیشزانیٚ پاك وبیٚ تاوانن ؟

وەلاٚم/ یەکـەم ئـەو ڕوداوە ڕووداوێکـی تایبەتیـە و چـەند هۆیـەکی تایبــەتی هەیـە بۆسازاندنی ئە وکارە، دروست نیە بەراوردی کاریٚ تر بکرێتە سەری و کەسیٚ تر وێنـەی ئەوکارەبکا .

دووهەم مەبەست لـەوکارەی یوسوف ئـەوەبوو گومـان بدرێتـە پـاڵ بینـامینی بـرای و بەگوێرەی راوێژ وئارەزووی خۆیان بو کەپێك هاتبوون ئەوکارە بکەن لــەناوەڕۆکا نابێتـە هۆی دژایەتی لـەگەڵ یاسای خوا .

پرسیار/ چۆن رەوایە یوسوف کوڕو باوك جویٚ بکاتەوەو ئازاری دەروونی بـاوکی پـتر بکا بەهۆی دووری بینامینەوە ؟

وەلاٚم/ ئەو کردەوەیە لـە ناوەڕۆکا بۆ سوودی باوك وبراکەی بو، بڕوای وابو بــاوکی بەوکارەی زانی سوپاسی ئەکاو داوای چاکەی بۆ ئەکا لای خوا و هەروایشبوو، تەماشای ئەنجامی هــەمووکاریٚ تەماشـای پاشـەڕۆژی ئـەکریٚ. پێغەمـەران لــەکردنی شـتی ڕاسـتا گومانیان ئاراستە ناکریٚ .

﴿ قَالُوا فَمَا جَزَاؤُهُ إِنْ كُنْتُمْ كَاذِبِينَ ﴾ کارگوزارانی یوسوف ووتیــان: دوایـی تۆڵـەی ئەو کەسەی دزی کردوە چ شتێکە ئەگەر ئێوە درۆتان کرد. مەبەسـتی پیـاوانی یوسـوف ئەوەبو کەبەڵێن لـەبراکانی یوسوف وەرگــرن ئەوکەســەی دزییەکـەی کـردوە بگـیریٚ و بکریٚ بەبەندە یا بەدیل بگیریٚ لـەتۆڵەی ئەو دزی کردنەیدا. بۆئەوەی ئەگـەربینامین گـیرا بیانویان نەمێنیٚ .

﴿ قَالُوا جَزَاؤُهُ مَنْ وُجِدَ فِي رَحْلِهِ فَهُوَ جَزَاؤُهُ ﴾ کوڕەکانی یەعقوب ووتیان: پاداشــت وتۆڵـەی ئەو دزەی ئەو مەنەی دزی بیٚ لـەبارەکەیدا دای نابیٚ، ئــەو کەسـە پاداشـتەکەی خۆیەتی. یانی بکریٚ بەبەندە بەگوێرەی یاسای باوك و باپیری خۆی .

﴿ كَذلِكَ نَجْزِي الْظالِمِيْنَ ﴾ هەر بەوجۆرەیە پاداشتی کەسانێ ستەمیان لەخۆیان کردبێ بەدزی کردن کەبکرێ بەبەندە ئێمە پاداشتیان ئەدەینەوە. ئەورستەیە لەکۆتایی گفتوگۆی پیاوەکانی یوسوفە .

﴿ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعاءِ أخِيهِ ﴾ دوایی جاردەرەکە یەکەم جار دەستی کرد بەپشکنینی باری کوڕانی یەعقوب بەر لەپشکنینی باری براکەی یوسوف هەتا گومان پەیدا نەکەن وئەوانیش بەوکردەوە شەرمەزار بن، بەڵام ئازاری ئەوان بەراوورد ناکرێ لەگەڵ ئازاری دڵی یوسوف لە نێو قولایی چاڵدا بەهۆی براکانیەوە .

﴿ ثُمَّ اسْتَخْرَجَها مِنْ وِعاءِ أخِيْهِ ﴾ لە پاشا مەنەکەی پاشایان دەرهێنا لە باری براکەی یوسوفدا و نیشاندرا بەبراکانی هەتا بیانوویان نەمێنێ، ئەوانیش بەوکردەوەیە شەرمەزاربوون .

﴿ كَذلِكَ كِدْنا لِيُوسُفَ ﴾ هەربەوجۆرەی باسکرائێمە سروشمان نارد ڕێکمان خست و یوسوفمان فێرکرد ئەوکارەبکا لەگەڵ براکانی هەتا بینامینی برای بگرێ و بەگوێرەی ڕووالەت بیکا بە بەندە بەگوێرەی یاسای ئایینی باوکی هەتا بگەن بەئاواتی خۆیان هەواڵی گرتنی بینامین بچێتەوە بۆ لای یەعقوب، براکانی بە باوکیان بڵێن: بەڕاستی عەزیز مافی خۆی بو وبینامین بکا بەبەندە یادیلی بکا .

﴿ ماكانَ لِيَأْخُذَ أخاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ ﴾ شایان وشایستە نەبوو کەیوسوف براکەی خۆی بگرێ بەو جۆرەی یاسای پاشای میسر داوای ئەکا سزای بدرێ و لای یوسوف گرانبو ئەگەر ئەو پیلانەی سازنەکردایە ئەبوایە بەگوێرەی سزای پاشای میسر سزا بدرایە کەبەند کردنە یا ئازاردانە، یوسوفیش ئەوەی لا خراپ بو بکرێ لەگەڵ براکەی، ئەگەر بەوجۆرە سزا بدرایە بەئاواتی خۆی نە دەگەیشت. ئەو یاسای پاشای میسرە بەکار نەئەهێنرا .

﴿ إلا أنْ يَشاءَ اللهُ ﴾ مەگەر خوا ئارەزووی بکردایە و فەرمانی بدایە کە بینامین بەگوێرەی یاسای پاشا میسر بگیرایەو دزراوەکەیان پێ بژێردرایە یا لێیان بدایە لەجیاتی

ئەوە بەند بکرێ یا بە بەندە بەگوێرەی یاسای پاشای میسر. بەلاّم خوای مەزن بەهۆی گەورەیی خۆیەوە ویستی ئەوەی فەرموو ئەوکارانە هەموویان بەگوێرەی یاسای ئایینی یەعقوب بکرێ و خستیە دڵی یوسفەوە بەوشێوەیە بڕوا هەتا بەئاواتی خۆی بگا .

﴿ نَرْفَعُ دَرَجاتٍ مَنْ نَشَاءُ ﴾ ئێمە بەرزئەکەینەوە کەسێ ئێمە ئارەزووی بکەین بەچەندین پلەو پایە لەزانیاری و پێغەمەرایەتی، بەوجۆرەی پلەو پایەی یوسفمان بەرزکردەوە بەسەر براکانیدا و کردمان بەپاشاو بەپێغەمەر .

﴿ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴾ وەلەسەرەوەی هەموو خاوەن زانیاریەکەوە زانایەتر هەیە هەتا کۆتایی بەزانیاری دێت بۆ لای بارەگای زۆر بڵندی خوای مەزن. ئەوڕستەیە هێمایە بۆ لای ئەوەی براکانی یوسف هەمو زانابون بەلاّم یوسف لەوان زاناترو تەواوتر بو .

لەپاشا خوا هەواڵ ئەدا بەهەندێ تر لەگفتوگۆی براکانی یوسف و ئەفورموێ :

قَالُوٓاْ إِن يَسۡرِقۡ فَقَدۡ سَرَقَ أَخٞ لَّهُۥ مِن قَبۡلُۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفۡسِهِۦ وَلَمۡ يُبۡدِهَا لَهُمۡۚ قَالَ أَنتُمۡ شَرّٞ مَّكَانٗاۖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبٗا شَيۡخٗا كَبِيرٗا فَخُذۡ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٧٨﴾ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأۡخُذَ إِلَّا مَن وَجَدۡنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذٗا لَّظَٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا ٱسۡتَيۡـَٔسُواْ مِنۡهُ خَلَصُواْ نَجِيّٗاۖ قَالَ كَبِيرُهُمۡ أَلَمۡ تَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ أَبَاكُمۡ قَدۡ أَخَذَ عَلَيۡكُم

مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِى يُوسُفَ فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِىٓ أَبِىٓ أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِى وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ



﴿ قَالُوا إِنْ يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَهُ مِنْ قَبْلُ ﴾ کوڕانی یەعقوب ووتیان: ئەگەر بینـامین دزی کردبێ جێگەی خۆیەتی و جێگەی سەرسوڕمان نیە کە دزی بکا، دوایـی لـەمەوبـەر براکەیشی دزی کردبو .

زانایان لـەبارەی دزی کردنی یوسوفەوە بیریان جیاوازە: هەریەکەیان بـەجۆرێ باسیان کروە، ئەوەی شایانی باسبێ زوربەی زانیان لـەسەری بـن ئەمەیـە کـە پورێکـی گـەورەی یوسوف کەخوشکی گەورەی یەعقوبی باوکی بو، یوسوفی زۆر خـۆش ئەویست و بـەبێ یوسوف نەئـەژیا، دوایـی یوسـوف گـەورەبوو یـەعقوب ویستی بیباتـەوە بۆلای‌خۆی و لـەخوشکی بسێنێتەوە، خوشکەکەی ووتی: جارێ واز لـەیوسوف بهێنە باچـەند ڕۆژێ تـر لای منبێ، پورەکەی بۆئەوەی یوسوفی لابێ پشتوێنەکەی ئیبراهیمی بەستە پشتی یوسـوف بەنـهێنی بـێ ئـەوەی کـەس بزانـێ لـەدواییدا پورەکـەی یوسـوف بـڵاوی کـردەوە کـە پشتوێنەکەی ئیبراهیم وونبوە بابگـەڕێین بـەنێو هـەمو خزمـەکانمانا بـەڵکو ئـەو پشتوێنە بدۆزینەوە، ئەوانیش گەڕان لـەپشـتی سوسـوفا هێنایانـە دەرەوە. بـەگوێرەی یاسـای‌ئەوان هەرکەسێ دزی بکردایە ئـەکرا بەبـەندە ، لـەوکاتـەدا خوشـکەکەی یـەعقوب سوێندی خوارد یوسـوف لای خۆمـە ونـای دەم بەکـەس و ئـەو پشتوێنە دراوە بـەمن و ئـەیدەم بەهەرکەسـێ ئـارەزووم هـەبێ، هـەواڵی ئـەوڕوداوە گەیشـتە لای یـەعقوب، یـەعقوب فەرمووی: بایوسوف لای پوری خۆی بێ، بەوبۆنەوە یوسوف لای پوری مایەوە هەتا ئـەو ژنەکۆچی دوایی کرد. بەو بۆنەوە براکانی یوسوف تاوانجیان ئەگرتە یوسوف بـەوەی دزی کردوە. ئەگینا یوسوف هرگیز دزی نەکردوە وزانایان ئەبوایە بیریشیان لـەوە بکردایـە وە

کە لـە هەموو یاساو دەستورێکا فـەرماندان بەسـەر منـاڵدا بەجگـەی فەرماندانـە بەسـەر پیاوانی گەورەدا .

﴿ فَأَسَرَّها يُوسُفَ فِيْ نَفْسِهِ وَلَـمْ يُبْدِها لَـهُمْ ﴾ دوایـی یوسـوف گفتوگـۆی براکـانی لـەدەروونی خۆیا پەنـهان دا کـە ووتیـان: یوسـوف دزی کـردوەو گفتوگۆکـانی ئـەوانی ئاشکرا نەکردو وەلأمیشی نەدانەوەو ئارامی گرت .

﴿ قَالَ أَنْتُمْ شَرٌّ مكاناً ﴾ یوسوف لـە دەروونی خۆیا ووتـی: ئێـوە خراپـترن لــە بـارەی جێگەوە، خۆتان ئەزانن بەوکارە خراپانەی خۆتان لـەگەڵ مــن و بینامینتـان کـرد وئێـوە و منتان لـەباوکی خۆم دزی .

﴿ وَاللهُ اَعْلَمُ بِمّا تَصِفُونَ ﴾ وە خوا زاناترە بەو شتەی ئێوە باسی ئەکەن و ئەیدەنە پاڵی من وبینامین کە دزیمان کردوە، ئەو کـارە بوختـان و درۆی ڕووتـە و براکـانی یوسـوف کۆڵیان نەداو، داوای بەزەیی و میهرەبانیان لـە یوسوف کرد.

﴿ قَالُوا ياأَيُّها الْعَزِيْزُ إنّ لَهُ أباً شَيْخاً كَبِيْراً ﴾ ووتیان ئەی عەزیز: بەڕاسـتی ئـەم کـوڕە باوکێکی پیرو بەڕێزی هەیە و تەمەنی زۆرە و لامان گرانە بـەبێ بینـامین بڕۆینـەوە بـۆلای باوکی .

﴿ فَخُذْ أَحَدَنا مَكانَهُ إنا نَراكَ مِنَ الْمُحْسِنِيْنَ ﴾ یەکێ لـەئێمە بەبارمتــە یـا بەبـەندەکردن بگرە لـەجیاتی بینامین بەڕاستی ئێمە تۆ ئەبینین لـەچاکەکەرانی، تۆ لـەمەوبەر لـەکاتی هــاتن ودەرچوونمان لـەمیسر چاکەی زۆرمان لـەتۆ بینیوە ، ئـەم چاکەیشـمان لـەگـەڵ بکـە وەك چاکەکانی تر، ئەم کوڕەمان بۆ بەڕەلأبکە بۆئەوەی لـەبەرئـەو باوکـە پـیرەی نـەك لـەبـەر ئێمە.

﴿ قَالَ مَعاذَ اللهِ أنْ نَأخُذَ إلا مَنْ وَّجَدْنا مَتاعِنا عِنْدَهُ إنَا إذاً لَظـالِمُونَ ﴾ یوسـوف ووتـی من پەنائەگرم بەخوا کە ئێمە کەسێ بگرین و بیکەین بەیەندە مەگەر کەسێ لای ئەو مـەنی پێوانەکەمان دەست کەوتبێ بەڕاستی ئێمە کاتێ بەپێچەوانەوە هەڵسین و ئـازاری یـەکێتر بدەین کەبێتاوانە ئەگەر وابکەین لـەڕیزی ستەمکاراندا ئەژمێرێین .

﴿ فَلَّما اسْتَیْئَسُوا مِنْهُ خَلَصُوا نجِیاً ﴾ دوای کاتێ ئومێدیـان بەیوسـوف نـەما براکـەیان بەرناداو بـەرەلای ناکـا جوێبونـەوە لـەدانیشـتوانی میسـر و کـەناریان گرتـوو کەوتنـە گفتوگۆکردن بەنهێنی لـەگەڵ یەکتری و چۆن بیانو بۆ باوکیان بهێننەوەو چ شتێ بدۆزنەوە بۆ ئەومەبەستە .

﴿ قَالَ كَبِیْرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوا أنَ أبَاكُمْ قَدْ أخَذَ عَلَیْكُمْ مَوْثِقاً مِنَّ اللهِ ﴾ گـەورەی کوڕانـی یەعقوب لـەتەمەنداو لـەژیریدا ووتی: ئایـا ئێـوە نـازانن کـەباوکی ئێـوە بەڕاستی پـەیمانی وەرگرتوە لـەئێوەو سوێندتان خواردوە لـەخزمـەت خـوادا کـەچاودێری بینـامین بکـەین و بەخۆشی وبەساغی بیدەینەوە دەستی مەگەر هیچ چارەتان نەمێنێ و زۆرتان لێ بکرێ .

﴿ وَمِنْ قَبْلُ مافَرَّطْتُمْ مِنْ یُوسُفَ ﴾ وەلـەمەوبەریش ئێوە کەمتەرخەمیتان کردو تاوانتـان کـرد لـەبارەی یوسـوفەوە بـەوتاوان و گوناهـە ئـازاری دڵـی بـاوکی خۆتانتـان دا، خۆشەویسترین کوڕی ئەوتان خستە بیری تاریك و قوڵەوە، ئـەوبرا گـەورەیان بڕیـاری دا لـەبەر شەرمەزاری خۆی نەڕواتەوە بۆلای باوکی و لای بینامین بمێنێتەوەو ووتی:

﴿ فَلَنْ أبْرَحَ الآرْضَ حَتَی یَأذَنَ لِيْ أبِي ﴾ دوایی من لـەزەوی میسر دەرناچم هەتا باوکم دەستورنەدا بەمن کەلە زەوی شاری میسر دەرچم .

﴿ أوْ یَحْكُمَ اللهُ لِي وَهُوَ خَیْرُ الْحاكِمِیْنَ ﴾ یاخوا فەرمان بدا بەدەرچوونی من لـەمیسـر و گەڕانەوە بۆلای باوکم یابینامین ڕزگاربکـا، یـادەرونێکی چـاکم بـۆ بکاتـەوە بـەمردنی خۆیشم بێ، خوا چاکترینی دادوەرانەو لایەنی کـەس نـاگرێ و دادپـەروەرە، ئامۆژگـاری براکانی کرد جگە لـەڕاستی هیچ شتێکی تر نەڵێن لـە خزمەت باوکیاناو ووتی:

ٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ فَقُولُواْ يَـٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ
وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَـٰفِظِينَ

وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا ۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨٣﴾ وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٨٤﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ تَفْتَؤُا۟ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوْ تَكُونَ مِنَ ٱلْهَٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُوا۟ بَثِّى وَحُزْنِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ يَٰبَنِىَّ ٱذْهَبُوا۟ فَتَحَسَّسُوا۟ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَا۟يْـَٔسُوا۟ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ لَا يَا۟يْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾

﴿ إرْجَعُوا إلى أبِيْكُمْ فَقُولُوا ياأبانـا إنَّ ابْنَـكَ سَرَقَ ﴾ ئێوە بگەڕێنەوە بۆلای باوکی خۆتان، دوایی ئێوە بڵێن: ئەی باوکی ئێمە: بەڕاستی کوڕەکەی تۆ دزی کردوە، ئێمە چاومان کەوت بەخزمەتکارەکانی یوسف مەنی پێوانەی پاشایان لەبارەکەی بینامین

دەرهێنا. بەڕاستی عەزیزی میسریش بەردەوامە لەسەر گرتنی بینامین، ئەوەی ئێمە دیمان ئەمەیە کەووتمان و خوا ئاگای لەنیازی ئێمەیە، ئەگەر ئێمە بمانزانیبایە وامان لەتۆ نەدەکرد بینامین لەگەڵ ئێمەدا بنێری. وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَماشَهِدْنا إلاّ بِما عَلِمْنا وَماكُنّا لِلغَيْبِ حافِظِيْنَ ﴾ وەئێمە ئاگاداری هیچ شتێ نەبووین مەگەر بەشتێ ئێمە زانیومانە کەمەنەکەی پاشامان بینی لەبارەکەی بینامین دەریان هێناو، ئێمە ئاگاداری ئەوشتانە نین لەبەرچاونین. یانی ئێمە بەڕووالەت دیمان کەبینامین دزی کردوە، لەناوەڕۆکدا ئاگامان لەهیچ شتێك نیە، ئیتر نازانین ئەومەنەی پاشا پیاوانی پاشا خستویانەتە نێو بارەکەی بینامینەوە یاشتێ تربوە .

﴿ وَاسْأَلِ الْقَرْيَةَ الْتِي كُنّا فِيْها ﴾ وەتۆ پرسیاربکە لەدانیشتوانی ئەو گوندەی ئەوتۆ ئێمە تێیابوین لەشاری میسر کەسێ بنێرە بۆ ئەوێ لەوان بپرسێ، ڕوداوی ئەو دزی کردنە بلاّوبوەتەوە لەمیسردا .

﴿ وَالْعِيرَ الْتِي اَقْبَلْنا فِيْها وَإنا لَصادِقُونَ ﴾ وەپرسیاریش بکە لەوکاروانەی ئەوتۆ ئێمە لەگەڵیان بووین لەمیسرو لەنزیکی کەنعانن بەڕاستی ئەوەی ئێمە دیومانە ئەوانیش چاویان پێی کەوتوەو، ئێمە بەڕاستی ڕاست ئەکەین لەوشتەی ئێمە هەواڵمان بەتۆ داوە. کوڕانی یەعقوب ئەمجارەیان بەسەربەستی وئازادیەوە گفتوگۆئەکەن، چونکە بڕوای تەواویان بەڕاستی خۆیان هەیە بەپێچەوانەی جاری پێشو کاتێ کراسە خوێناویەکەی یوسفیان هێنایەوە بۆلای باوکیان .

﴿ قالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ اَنْفُسَكُمْ اَمْراً فَصَبْرٌ جَمِيْلٌ ﴾ یەعقوب فەرموی: ئەوشتانەی ئێوە ئەیلێن وانیە. بەڵکو خۆتان بۆخۆتان ئەو کارەتان ڕازاندوەتەوە بەگوێرەی ویستی خۆتان. بەوێنەی جاری پێشو ئەو کارەتان ساختە هێنا بۆ لەناوبردنی یوسف، من بڕواناکەم پاشا بەبۆنەی دزیەوە بینامینی گرتبێ. دوایی ئارام گرتن چاکە بۆ من ئەم جارەیش وە کجاری پێشو لەکاتی وونبونی یوسفا. مەبەستی یەعقوب لەو فەرمودەی خۆیا: ئێوە ساختەتان هێناوە ئەوەبو: ئەبوایە ئێوە باوەڕتان وابوایە کەبینامین دزی نەکردوە .

﴿ عَسَى اللهُ اَنْ يأْتِيَنِي بِهِمْ جَمِيْعاً إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيْمُ الْحَكِيْمُ ﴾ داوام لەخوا ئەوەیە کەهەموویان بهێنێتەوە بۆلای من بەیوسوف وبینامینی برایو براگەورەکەیانەوە لەمیسر. بەڕاستی خوا هەرئەوە هەمووشتیێ بزانیێ وبە خەفەتی من ئاگادارە، هەمووشتیێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنیێ و کردەوەکانی خوا بیێسود نیە .

﴿ وَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ أسفاً عَلَى يُوسُفَ ﴾ یەعقوب ڕوی لەکورەکانی وەرگێڕاو ووتی: ئەی خەفەت وەرە بۆلای من لەسەر جویێبونەوەی یوسوف و سەرباری ئەوەیش خەفەتی بینامین .

﴿ وَأبيْضَتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴾ وەهەردووچاوی یەعقوب لەخەفەتا سپی هەڵگەڕابوون و گوێربوبون لەبەرگریانی زۆر بۆ وونبونی یوسوف، لەژێرەوە دڵی لەکردەوەی کوڕەکانی زویر بوبو بەیۆنەی جویێبونەوەی یوسوف، دوایی یەعقوب ڕق وخەشمی خواردو دەری نەبڕی. بەڵام لەسەر چ شتیێ ؟ لەسەر ئازاری لەشی و دەمارەکانی وبۆکەسیێ دەری نەئەبڕی ئەوخەفەتانە .

﴿ قَالُوا تَاللهِ تَفْتَأُ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتى تَكُونَ حَرَضاً ﴾ کوڕانی یەعقوب بە یەعقوبیان ووت: سوێند بیێ بەخوا: تۆ وازنایەری بیری یووسف ئەکەیتەوەو کۆڵنادەی لەخۆشەویستی هەتا نەخۆش ئەکەوی وبەرەو لەوناوچون ئەچی بیێسودە ئەوەندە خەفەت مەخۆ بۆ یوسوف ڕۆیشت و ناگەڕێتەوە بۆلای تۆ .

﴿ أوْ تَكُونَ مِنَ الْهالِكِيْنَ ﴾ یا تۆ ئەچیتە ڕیزی مردووانەوە. کوڕانی یەعقوب هەرچەندە سوێندخوادرنەکەیان بەگوێرەی بڕوای خۆیانە، نەیان ئەزانی پاشەڕۆژ چۆن دێتە پێشەوە، بەڵام بەگوێرەی تاقیکردنەوەی مرۆڤ و گومانی خۆیان خەفەت خوادرن بەوشێوەیە سەرئەکێشیێ بۆلای ئەو دووشتەی باسکران .

﴿ قَالَ إِنَّما أشْكُو بثي وَحُزني إِلى اللهِ ﴾ یەعقوب فەرموی بەکوڕەکانی: بەڕاستی من هاناو سکالای خەفەتی گرانی خۆم وئازاری دڵی خۆم هەر بۆلای خوا بڵاوی ئەکەمەوە نەك بۆلای کەسیتر، خوا چارە سازێنیێ بیێ چارانە .

﴿ وَاَعْلَمْ مِنَ اللهِ مالاتَعْلَمُونَ ﴾ وەمن ئەزانم بەمیهرەبانی خوا شتێ ئێوە نایزانن، یەعقوب هەرچەندە گیرۆدەی خەفەتی جویبونەوەی یوسوف بوو، بەلاّم بڕوای بەخوای خۆی وابو، دەست بەرداری بەزەیی خوانەبوبو، ئەیزانی ئەنجامی ئارامگرتن و ناخۆشی ئاسایش و ئاشتیە، بڕوای بەزیندوی و مانەوەی یوسوف هەبو، بەلاّم نەی ئەزانی لەچ جێگەیەکەو چۆن ڕائەبورێرێ، بەندەیە یاسەربەست وئازادە، بۆیە فەرموی:

﴿ یابُنَيَّ اذْهَبُوا فَتَحَسَسُوا مِنْ یُوسوفَ وَأخِیْهِ وَلاتَیْأسُوا مِنْ رَوحِ اللهِ ﴾ ئەی کوڕانی خۆم: ئێوە بڕۆنەوە بۆ میسر، دوایی ئێوە بکەونە گەڕان بۆ دۆزینەوەی یووسف و براکەی بەهەمو هەستێکتانەوەو کۆلّمەدەن بەئاشکرا و بەنهێنی و و ئێوە نائومێد مەبن لەمیهرەبانی و بەزەیی خوا هەتا ئەنجاکمێکتان دەست ئەکەوێ بەمانیان ونەمانیان .

﴿ إنَّهُ لایَیْأسُ مِنْ رَوْحِ اللهِ إلا الْقَوْمُ الْکافِرُونَ ﴾ بێ ئومێد نابێ لە میهرەبانی و بەزەیی خوا مەگەر کۆمەڵێ باوەڕیان بەخوا نەبێ، بەتوانای نەبێ کەخوا ناخۆشی لەسەر بەندەکانی خۆی لائەبا .

دوای ئەوەی یەعقوب ئامۆژگاری کوڕەکانی خۆی کرد بگەڕێنەوە بۆمیسر، کوڕەکانی بەدڵیان کردو بۆ جاری سێیەم گەڕانەوە بۆ میسر .

فَلَمَّا دَخَلُوا عَلَيْهِ قَالُوا يَا أَيُّهَا الْعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهْلَنَا الضُّرُّ وَجِئْنَا بِبِضَاعَةٍ مُزْجَاةٍ فَأَوْفِ لَنَا الْكَيْلَ وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَا إِنَّ اللَّهَ يَجْزِي الْمُتَصَدِّقِينَ ﴿٨٨﴾ قَالَ هَلْ عَلِمْتُمْ مَا فَعَلْتُمْ بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذْ أَنْتُمْ جَاهِلُونَ ﴿٨٩﴾ قَالُوا أَإِنَّكَ لَأَنْتَ يُوسُفُ قَالَ أَنَا يُوسُفُ وَهَذَا أَخِي قَدْ مَنَّ اللَّهُ

عَلَيْنَاۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدْ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴿٩١﴾ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَۖ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْۖ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾ ٱذْهَبُواْ بِقَمِيصِى هَٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِى يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِى بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٣﴾

﴿ فَلَمّا دَخَلُوا عَلَيْهِ قالُوا ياأَيُـها الْعَزِيْزُ مَسَّنا وَأَهْلَنـا الْضُـرُ ﴾ دوایـی کـاتێ کوڕانـی یەعقوب چونە دەرەوە لـەلای باوکیان بەنیازی چونیان بۆ میسر، دوایی چونە لای یوسوف و بەخزمەتی گەیشتن بۆ جاری سێیەم بەدڵشکاوێکەوە ووتیان: ئەی عەزیز تووشـی ئێمـە وخێزانەکانمان بوە سەختی و برسێتی و نـەدارایی و هـاتووین بـۆلای تـۆ بەدەسـت مایـەو نرخێکی کــەم و بـێ بـەها وکـەس لـەئێمـەی وەرنـاگرێ مەگـەر مرۆڤێکـی وێنـەی تـۆ لـەگەورەیی و لـەبەزەییدا .

﴿ فَأَوفِ لَنا الْكَيْلَ وتَصَدَّقْ عَلَيْنا ﴾ دوایی تۆ خواردەمــەنی پێوە بـۆ ئێمـە بەتـەواوی وتەماشای بێنرخی دەست مایەی ئێمە مەکە، گەورەیی خـۆت بەجێبهێنـەوەو چاوپۆشـی لـەبێنرخی دەست مایەکەمان بکە هەرچەندە شایستەی تۆ نیە. وەرێزی گـەورەیی خـۆت برێژە بەسەر ئێمەدا بەگەڕانەوەی براکەمان و بەچاوپۆشی کردنت بەوەرگرتنی ئەو دەست مایە بێنرخەی ئێمە .

﴿ إِنَّ اللّهَ يُجْزِي الْمُتصَدِّقِيْنَ ﴾ بەڕاستی خـوا پاداشـتی چاکەکـەران وچاکـە خـوازان ئەداتەوە لـەهەردووجیهاندا .

بۆزانین: ئیبنولئەنباری ئـەڵێ داواکردنـی چاوپۆشـی وێنـەی چاکەکردنـە (الصّدَقَة ) لـەبارەی سەدەقە زانایان بیریان جیاوازە ئایا سەدەقە ڕەوابو بۆ پێغەمـەران بەرلەپێغەمـەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾ ؟سوفیانی کوڕی عەینیە ئەڵێ: بۆ پێغەمەرانی پێش پێغەمەر سەدەقە ڕەوابو . زۆربەی زنایان ئەڵێن: پێغەمەران هەمویان وەك یەك وان لـەقـەدەغەکردنی سـەدەقە بۆیـان ونابێ سەرشۆڕی کەسبن و سەدەقە چڵکی ئادەمیزادە بۆ پێغەمەران ڕەوانیە، مەبەست لـە سەدەقە لێرەدا ئەمەبە عەزیز پاداشتیان بداتەوە لـەسەر ڕەوشتی خۆیان بەچاوپۆشـی. دوای ئەوەی یوسف گوێ گرت لـەپارانەوەی براکانی بەزەیی بەوانا هاتـەوە، دڵـی نـەرم بـو خوێنی برایەتی و خزمایەتی پەرەی سەند، بەسەرزەنشتەوە .

﴿ قَالَ هَـلْ عَلِمْتُـمْ مـافَعَلْتُمْ بِيُوسُـوفَ وَأخِيْـهِ إذا أنْتُـمْ جـاهِلُونَ ﴾ یوسـوف ووتـی بەبراکانی: ئایا ئەزانن بەشتێ ئێوە کردتان بەیوسوف وبراکەی بەهۆی وەڵامدانـەوەتان بـۆ فەرمانی شەیتان یوسـوفتان خستە نێـو قولایـی و تـاریکی بـیرەوە، لـەدووایشـدا بینـامین بەدەستی ئێوە ئازاری زۆری چێشت. بەم نزیکانەیش ووتـان. یوسـوف وبراکـەی دزیـان کردوە، ئێوە بۆیە ئەو کارە خراپەتان کرد لـەکاتیکا بـو ئێـوە نـەزان ومنـاڵبیون و نـەتان ئەزانی پاشەڕۆژی یوسوف چۆن ئەبێ، مرۆڤی نەزان کـاری گـەورەتر لـەوکارە خراپـەی ئێوە ناکا .

﴿ قَالُوا إنَّكَ لَأنْتَ يُوسُفَ ﴾ براکانی یوسوف تەماشای یوسـوفیان کـرد و بەنیشـانەو شێواز هات بەدڵیان کەعەزیز یوسوف بێ، ووتیان: ئایا بەڕاستی تۆ یوسـوفی، چـاوەڕوانی وەڵامیانی ئەکرد .

﴿ قالَ أنا يُوسُفَ وَهذا اخي قَد مَنَّ اللهُ عَلَيْنا ﴾ یووسف ووتی من یوسـوفم وئەمـەیش براکەی منە. بەڕاستی خوا میهرەبانی و گەورەیی خۆی ڕژاند بەسەرماناو ڕزگاری کردین لە و ئازاردانەی توشمان بون وبەیەك گەیشتین لـەدوای کزۆڵی سەربەرزی کردین .

﴿ إنَهُ مَنْ يَتَّقِ و يَصْبِر فَأنَ اللهَ لايَضيْعُ أجْرَ الْمُحْسِنِيْنَ ﴾ بەڕاستی هەرکەسـێ لـەخوا بترسێ و ئارام بگرێ لـەسەر پەرستنی خواو خۆ پارێزێ لـەداوێن پیسـی، دوایـی بەڕاسـتی خوا لـەناونابا پاداشتی چاکە کەران .

﴿ قَالُوا تَاللهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللهُ عَلَيْنَا وَإِنْ كُنَّا لَخَاطِئِيْنَ ﴾ براکانی یوسوف ووتیان: سوێندمان بەخوا، خوا تۆی هەڵبژاردوەو رێزی داوی بەسەر ئێمەدا، گەورەتری کردوی لەئێمە بەشۆخی و بەژیری لەپاشا بەپلەی بەرزتر .

بەڕاستی ئێمە لەتاوانباران و گوناهکارانین، داوا لەتۆ ئەکەین چاوپۆشیمان لیٚ بکەی، هیچ بەڵگە وبیانومان نیە جگە لەوەی مافی برایەتیمان هەبیٚ لەلای تۆ .

﴿ قَالَ لاتَثْرِيْبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ ﴾ یوسوف ووتی بەبراکانی: ئەمڕۆ هیچ تاوانج و سەرزەنشتیٚ لەسەرتان نابیٚ لەسەر ئەوکارانەی کردوتانە، لەمەودوا جاریٚ تر بەڕوی ئێوەدا نادرێتەوە .

﴿ يَغْفِرُ اللهُ لَكُمْ وَهُوَ أرحَمُ الّراحِمِيْنَ ﴾ لەخوا ئەپاڕێمەوە خوا لەئێوە خۆشبیٚ کەئێوە لەگوناهی خۆتان پەشیمان ئەبنەوەو خوا میهرەبانترین وبەبەزەیی تری هەموو خاوەن میهرەبانانە بەبۆنەی پەشیمان بونەوە لە گوناهو داوای لیٚ خۆشبونی لیٚ بکریٚ .

﴿ إذْهَبُوا بِقَمِيْصِي هذا فَألْقَوْهُ عَلى وَجْهَ أبَي يَأتِ بَصِيْراً وَأتُوني بِأهْلِكُمْ أجْمَعِيْنَ ﴾ ئێوە بڕۆنەوە بۆ لای باوکمان بەم کراسەی منەوە، دوایی ئێوە ئەو کراسەی من بدەن بەسەر ڕوومەتی باوکما بەو بۆ نەوەئەگەڕێتەوە ڕووناکی چاوەکانی وئەبیٚ بەخاوەن چاوی جاران و، ئێوە بێن بۆلای من بەخۆتان وخێزانەکانتانەوە لەکەنعانەوە بۆ شاری میسر .

بۆ زانین: ئەبیٚ لەبیرمان نەچیٚ گەڕانەوەی بینایی چاوی یەعقوب بەهۆی دانانی کراسی یوسوف لەسەر ڕومەتی یەعقوب یەکێکە لەوکارە پەکخەرانە خوا بەخشیویەتی بەیوسوف، وێنەی ساردبونەوەی ئاگر بۆ ئیبراهیم. داری دەستی موسا. گفتوگۆی عیسا لە بێشکەدا بەمناڵی .

وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلْعِيرُ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلْقَدِيمِ ﴿٩٥﴾

فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلْبَشِيرُ أَلْقَىٰهُ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ فَٱرْتَدَّ بَصِيرًا ۖ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَـٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾ قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾

﴿ وَلَمّا فَصَلَتِ الْعيرُ قالَ أبوهُمْ إني لأَجِدُ ريحَ يُوسُفَ لَوْلا أنْ تُفَنِّدُونَ ﴾ وەكاتیَ کاروان لەشارەوانی شاری میسر دەرچون و بەرەو زەوی کەنعان کەوتنەڕێ باوکی بە براکانی یووسفی ووت: بەڕاستی من بۆم پەیدا بوە بۆنی یوسوف وهەندێ لەنەوەکانی دانیشتبون ئەگەر ئێوە نادەنەپاڵ من کەم ئەقڵی ونالێن پیربوەو هۆشی بەخۆیەوە نەماوە .

﴿ قالُوا تَاللهِ إنّكَ لَفِي ضَلالِكَ الْقَديم ﴾ دانیشتوانی لای یەعقوب ووتیان: سوێندمان بەخوا: بەڕاستی هێشتا تۆ لەنێوسەرگەردانیە کۆنەکەی خۆتا ماویتەوەو کەبەهیوای مانەوەی یوسوفی، یوسوف مردو ڕۆیشت وێنەی مردووانی تر .

﴿ فَلَمّا أنْ جاءَ الْبَشِيْرُ اَلْقاهُ عَلى وَجْهِهِ فَارْتَدَ بَصِيراً ﴾ دوایی کاتیَ موژدە دەر هات بۆلای یەعقوب و کراسەکەی یووسفی دایە دەستی و کراسەکەی یووسفی دا بەسەر ڕوی یەعقوبا، دوایی بینایی چاوی و هێزی چاوی گەڕایەوە بۆلای. بێژراوە ئەوکەسەی ئەم جارە ئەوکراسەی هێنا هەر ئەوکەسەبو لەجاری پێشودا کراسە خوێناویەکەی برد بۆلای یەعقوب، هەتا بەم چاکەیە گوناهی خراپەی پێشوی بشۆرێتەوەکەبەرلەچل ساڵ کردبوی جێگەی سەرسوڕمان نیە کە یەعقوب بەوموژدەدانە بینایی چاوی بگەڕێتەوە، زۆرجاران بەهۆی نەخۆشی و دڵشادیەوە نەخۆش ڕزگاری بوە لەنەخۆشی، تاقی کردنەوەی پزیشکی شایەتی لەسەر ئەوڕاستیە ئەدەن .

﴿ قَالَ اَلَمْ اَقُلْ لَكُمْ إِنِي اَعْلَمُ مِنَ اللهِ مالاتَعْلَمُونَ ﴾ یەعقوب فەرموی: ئایا من بەئێوەم نەووت: بەڕاستی من بەهۆی سرۆشەوە لەلایەن خواوە شتێ ئەزانم ئێوە نایزانن. براکانی یوسف لە کردەوەی خۆیان پەشیمان بونەوە .

﴿ قَالُوا يا أبانا أَسْتَغْفِر لَنا ذُنُوبَنا إنا كُنَا خاطِئِيْنَ ﴾ کوڕانی یەعقوب ووتیان: ئەی باوکی ئێمە: تۆ داوای لێخۆشبونی گوناهی ئێمە بکە لەلای خوا. بەڕاستی ئێمە تاوانبارو گوناهبارین، مەرجبێ جارێ تر نەچین بۆلای گوناه، یەعقوب داواکەی لێوەرگرتن .

﴿ قَالَ سَوْفَ اَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَبّي إِنَهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيْمُ ﴾ یەعقوب فەرموی: من لەمەوداو داوای لێخۆشبونی گوناهەکانتان ئەکەم لەپەروەردەکەری ئێوە لەکاتی گۆشەگیری و پەنهانیدا، ئومێدەوارم لەوکاتەدا خوا پاڕانەوەم لێ وەربگرێ بۆ ئێوە. بەڕاستی هەر پەروەردگارە خۆ شبێ لەوکەسانە پەشیمان ئەبنەوە لە گوناهەکانیان، میهرەبانە بۆ بەندەکانی خۆی بۆ لەناوبردنی خەفەت وناخۆشی.

فَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ وَقَالَ ٱدْخُلُوا۟ مِصْرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّوا۟ لَهُۥ سُجَّدًا ۖ وَقَالَ يَـٰٓأَبَتِ هَـٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَـٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّى حَقًّا ۖ وَقَدْ أَحْسَنَ بِىٓ إِذْ أَخْرَجَنِى مِنَ ٱلسِّجْنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلْبَدْوِ مِنۢ بَعْدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيْطَـٰنُ بَيْنِى وَبَيْنَ إِخْوَتِىٓ ۚ إِنَّ رَبِّى لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾ ۞ رَبِّ

قَدْ ءَاتَيْتَنِى مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِى مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِىِّۦ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِى مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۖ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوٓا۟ أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ ﴿١٠٢﴾

﴿ فَلَمّا دَخَلُوا عَلَى يُوسُفَ آوى إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ ﴾ دوایی کاتیّ یەعقوب وخیّزانەکەی چونە لای یوسوف لە زەوی میسردا و نەچوبونە نیّو شار ولەدەرەوەی شاربون، یوسوف چوبوّ پیّش وازیان لەو جیّگەدا، یوسوف باوەشی کردبەباوك و دایکی خوّیاو لکاندنی بەخوّیەوە. زوّربەی زانایان لایان وایە دایکی یوسوف کوّچی دوایی کردبوو، دوای ئەوە یەعقوب پوریّکی یوسوفی خوا ستبو. کەواتە ئەودایکە پوری یووسفەو خوشکی دای کیەتی.

﴿ وَقالَ ادْخُلُوا مِصْرَ إِنْ شاءَ اللّٰهُ آمِنِيْنَ ﴾ یوسوف ووتی بەباوکی و خیّزانەکەی: ئیّوە بچنە نیّو شاری میسرو لەدەرەوەی شار دامەنیشن و ئیّوە شاربکەن بەجیّگەی خوّتان وئەگەر خوا ئارەزووی هەبیّ بەبیّ ترس لەگرانی و ستەمی پاشایان ودوژمنان .

﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى العَرشِ وَخَرُّوا لَهُ سُجَّداً ﴾ وەیوسوف باوك ودایکی خوّی بەرزکردەوەو دای نان لەسەر ئەوکورسیەی خوّی دائەنیشت بوّ هەڵسوڕاندنی شارەکان لەبەر ریّزگرتن بوّ دایك وباوکی. وەباوك ودایك و براکانی یوسوف کەوتن بەدەماو سەریان خەفان بوّ یوسوف بوّ ریّزگرتن لەیوسوف، سەردانەواندن مەرحەبایی بو بوّ پیاوە گەورەکان لەو سەردەمەدا.

﴿ وَقَالَ يَاأَبَتِ هذا تَأويلُ رُؤيايَ مِنْ قَبْلُ قَدْ جَعَلَها رَبّي حَقّاً﴾ وەیوسوف ووتـی: ئـەی باوکی خۆم: ئەمەیە مانای ئەو خەوەی من بینیم لەمەوبەر کەیازدەئەستێرە و مانگ ورۆژ سوژدەیان ئەبرد بۆمن. بەڕاستی پەروەردگاری من ئەو خەوەی منی بەڕاست گێڕا لەبێداریدا بەئاشکرا .

﴿ وَقَدْ احْسَنَ بِي إِذ أخرَجَنِي مِنَ السِجْنَ وَ جاءَ بِكُمْ مِنَ الْبَدْوِ ﴾ وە بەڕاستی پەروەردگاری من چاکەی لەگەڵ من کردبو کاتێ منی دەرهێنا لەگرتوخانە ومنی کرد بەشالیاری ئابووری ودارایی و لەسەر تەختی کاربەدەستی دانام و ئێستاش ئێوەی هێنا بۆلای من لەلادێ وجێگەیەکی بێسەوزایی ولەبەخێوکردنی ئاژاڵ و هاتنە نێو شارستانیەوە .

﴿ مِنْ بَعْدِ أنْ نزَعَ الشَيْطانُ بَيْني وَبَيْنَ إِخوَتِي إنَّ رَبِي لَطِيْفٌ لِمَا يَشاءُ إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيْمُ الْحَكِيْمُ ﴾ لەپاش ئەوەی کەشەیتان نێوانی من وبراکانی منی تێك داو براکانی منی هاندا ئازاری من بدەن بەوکارانەی کردیان. بەڕاستی پەروەردگاری من خاوەنی نەرم و پاکیە بۆ هەرشتێ ئارەزووی بکا بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی. بەڕاستی پەرورەدگاری من هەر ئەوە هەمووشتێ بزانێ و هەمووشتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دابنێ .

﴿ رَبِّ قَدْ آتَيْتَني مِنَ الْمُلْكِ وَعَلَمْتَنِي مِنْ تَأويلِ الآحادِيثِ ﴾ ئەی پەرورەدگاری من بەڕاستی تۆ بەخشیت بەمن پاشایەتی و سامانداری و فێری منت کرد مانالێکدانەوەی خەوەکان ونامەکانی خۆت .

﴿ فاطِرَ السَّماواتِ وَالآرْضِ أنْتَ وَلِيّي فِي الّدنيا وَالآخِرَةِ ﴾ ئەی دروست کەری ئاسمانەکان وزەوی بەبێکەرەسەی پێشکەوتو بۆیان هەرتۆی یاریدەدەر و بەڕێوەبەری کاری من لەجیهان و لەپاشە ڕۆژدا .

﴿ تُوفَّنِي مُسْلِماً وَألْحقْنِي بِالْصالِحِيْنَ ﴾ تۆ گیانی من بکێشەو بەموسڵمانیو تۆ من کۆبکەرەوە لەگەڵ پیاو چاکانا لەڕۆژی دواییدا، وێنەی پێغەمەران وباوباپیرانم .

بۆ زانین: یوسوف کاتێ باسی چاکەی خوای کرد لەگەڵی باسی دەرهێنانی لەبیرەکەی نەکرد لەبەردڵی براکانی باس کردنی ئاسمانەکان بە چەند ئاسمانێ و باسی زەوی بە تەنها زەویە لەبەرئەوەیە ئادەمیزاد چەند ئاسمانێ ئەبینن و تاکە زەویە ئەبینن .

کەم جاران گومان ئەبرێ یەکەم جار کەسورەتی یوسوف وێنەی چیرۆکێکە پاڵەوانی ئەو چیرۆکە ژنێ بێ ژنایەتیەکەی زۆری لێ کردبێ وعاشقی کوڕێکی جوانی وابوبێ وێنەی ئەو کوڕە نەی دیبێ لەناو پیاوانا لە شیرینی وجوانیدا وئەوکوڕە لە ترسی خواو سزا واز لەو ژنە بهێنێ وڕونەکا بۆلای، هەندێ لەئادەمیزاد ئەڵێن: چاك وابو ئەوسورەتە لەنامەی خوادا باسی نەکرایە، تاقمی مەیمونیەکان لەخەوا چ ئەڵێن: ئەو سورەتە بەشێ لەقورئانیە وباوەڕیان پێ‌نیە وئەڵێن: دڵداریە بەگوێرەی بیرو بۆچونی خراپی خۆیان دژی هەمو پەیڕەوەکانی ئیسلامن. بەلاّم بەڕاستی هەرکەسێ بەوردی ئەم سورەتە بخوێنێتەوە ولێی تێ‌بگا، نهێنی ونیشانەی ئەزانێ وباوەڕی بێگومان ئەهێنێ ڕونترین وێنەی تاقی کردنەوە پێش کەش ئەکا. ئێمە لەمەوپاش هەندێ نهێنی و مەبەستی ڕاستی ناوەڕۆکی ئەم سورەتە باس ئەکەین و خۆی لەخۆیا ڕاستی بۆ هەموکەسێ دەرئەخاو پێویستی ئەکا لەسەریان بیانزانن:

١- بەڕاستی پاڵەوانبازی و جەنگی نێوان ڕاستی وپوچی بەردەوامە لەم ژیانەی ئێستادا وئاشتەواییان ناکرێ ولەئەنجامدا هەرکەسێ ڕێگەی خراپ بگرێ پیاوچاکان ڕوبەڕویان ئەوەستن بەجۆرێکی داد پەروەری وڕاستی، هەرکەسێکیش ڕێگەی چاك بگرێ پیاوخراپان بەرەنگاریان ئەکەن بەبوختان کردن وفێڵ ودرۆکردن، بەوێنەی ڕوداوی نێوان ژنی عەزیز و یوسوف، ژنەی عەزیز بەدرۆو بەبوختان یوسوفیش بەئامۆژگاری کردن وبەترسان لەخواو لەبێ نمەکی لەگەڵ عەزیزی میسردا .

٢- فەرمودەی خوا ( لَوْلا أَنْ رَأَى بُرهانَ رَبِّهِ ) بەراوردێکی ڕاستیمان پێ ئەبەخشێ بۆ جیاوازی نێوان باوەڕدارو بێ‌باوەڕان کە هەرکەسێ وەلاّمی ئەو بەڵگەیە بداتەوە لەکاتی تاقی کردنەوەدا بەوێنەی یوسوف بەڕاستی ئەوکەسە باوەڕی بێگومان جێگەی

خۆی گرتوه لەدڵیا ،هەرکەسێکیش ئاوات و ئارەزووی خراپ پاڵی پێوە بنێ وبەڵگەو فەرمانی خوا بخاتە پشتەوە ئەو کەسە هیچ بەشێکی لەئایین و باوەڕ تێدانیە.

٣- پیاوچاکان کاتێ کاری گرنگ و خراپ توشیان بو، بۆیان نەئەکرا خۆیان لای بن پەنا ئەبەن بۆ لای چەند کەسێکی پسپۆڕو کارامە بۆ نەهێشتنی ئەو کارە خراپانە، بەوێنەی پاشا میسر پەنای برد بۆ لای یوسوف کەلەگرتوخانەدابو هەتا بیپارێزێ لەخراپەی سالآنی گرانی سەخت. بێگومان کاری خراپ خراپەی خراپ کاران زۆر ئەکا وبەرزیان ئەکاتەوەو کاروباری پیاوچاکانیش نزم ئەکاتەوە. بەلآم لەکاتی سەختی وتەنگانەدا هەموشتێ وەك خۆی دەرئەکەوێ لەکاری خراپ وکاری چاك .

٤- ڕاهێنانی ئادەمیزاد دەروونی خۆیان لەسەرچاکە گەورەترین ئامانج بۆ خۆیان ئەڕەخسێنن. بۆوێنە ئارام گرتنی یوسوف لەقوڵایی و تاریکی بیردا و ئازاری گرتوخانەو فرۆشتنی وەك بەندەو بوختان کردن بەودا، ئامانجەکەی ئەوەبو بوبەگەورەیەکی پەیرەوکراو لەمیسردا، براکانی لەبەردەمیا وەستان داوای لێ بوردنیان کرد وسەریان بۆ خەفان. ئەوانە باسکران لەنهێنی ئەو سوەرەتەدان و شتی زۆری تری تێدایە لە پەندو ئامۆژگاری .

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی هەواڵ و بەسەرهاتی یوسوفی کرد. ڕوئەکاتە پێغەمەری خۆی ئەڵێ:

﴿ ذٰلِكَ مِنْ أَنْبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ﴾ ئەوشتەی ئێمە بۆمان گێڕایتەوە دەربارەی یوسوف لە هەواڵ و نهێنیەکان وئەوشتانەن لەبەرچاونین ئێمە بۆمان ناردوویی بەهۆی سروشەوە.

﴿ وَمَا كُنْتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوا أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ ﴾ وەتۆ لەلای ئەوبرایانەی یوسوف نەبوی کاتێ پیلانەکەی خۆیان کۆکردەوەو پێکیان هێنا بۆ یوسوف بیخەنە نێو بیرەوەو، ئەوان فێڵیان لەیوسوف کردو ئازاریان داو کراسی خوێناویان بەدرۆهێنایەوە بۆ لای یەعقوب ووتیان. گورگ خواردویەتی .

هەمو کەس ئەزانێ کەموحەمەد خوێنەواری نەبوە، نامەی مێژووی نەخوێندوەتەوە ئەگەر خوا بەسروش بۆنە نادربێ چۆن ئەهەوالآنە ئەزانێ. کەواتە چارەمان نامێنێ جگەی لەوەی باوەربکرێ خوا هەوالّی دابێتێ. پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ نیشانە ڕون و پەك خەری زۆری هەیە کەبەلّگەن لەسەر پێغەمەرایەتی ئەو. هەندێ لەو کارە پەکخەرانە هەوالّدانە بەشتە نهێنیەکان وێنەی هەوالّدان بەبەسەرهاتی یوسف بەدرێژی، پێغەمەری خوا بەوئاواتەوە بو کەئادەمیزاد باوەڕبهێنن بەخواو بە ئایینی ئیسلام. بەتایبەتی قوەریشیەکان، وەك خوا ئەفەرموێ :

وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَمَا تَسۡـَٔلُهُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ وَكَأَيِّن مِّنۡ ءَايَةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ يَمُرُّونَ عَلَيۡهَا وَهُمۡ عَنۡهَا مُعۡرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤۡمِنُ أَكۡثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشۡرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ أَفَأَمِنُوٓاْ أَن تَأۡتِيَهُمۡ غَٰشِيَةٞ مِّنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوۡ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١٠٧﴾

﴿ وَما أَكْثَر النّاسِ وَلَو حَرَصْتَ بِمُؤمِنِينَ ﴾ وە زۆرتر لە ئادەمیزاد باوەڕناهێنن ، ئەگەر چی تۆ کۆشش بکەی بەهەمو تواناتەوە لەسەر باوەڕهێنانیان ، واز نایەرن و بەردەوام ئەبن لەسەر بێباوەڕی خۆیان .

﴿ وَماتَسْأَلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أجر إنْ هُوَ إلاّذِكْرٌ لِلْعالَمِيْنَ ﴾ وەتۆ داوا لەئادەمیزاد ناکەی هیچ کرێو پاداشتێ لەسەر ڕاگەیاندنی قورئان وێنەی چیرۆکی خۆیان کە ئەوان داوای کرێ ئەکەن، دووبارە وەك قەشەو مالومەکان وهەندێ لەزانایانی بەناو موسلّمان مەگەر

ئەو قورئانە داوای هیچ شتێ ناکا جگەی ئامۆژگاری کردنبێ بـۆ بونـەوەران و هاندانیـان لـەسەر داواکردنی ڕزگار بونیان لـەسەر زمانی تۆو نیشاندانیان ڕێگەی ڕاسـت وپەرسـتنی خوا .

﴿ وَكَأَيِّنَ مِنْ آيَةٍ فِي السَّماواتِ وَالأرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْها وَهُمْ مُعْرِضُـونَ ﴾ وەزۆر ژمـارە هەن لـەوبەڵگانە تۆ ئارەزوی بکەی لـەسەر بونی خواو توواناى زۆرو یەکێتی خـوا لـەنێو ئاسمانـەکان و زەویـدا ئادەمیزادئـەڕۆن بەسـەریاناو ئـەیان بینـن و ئـەوان ڕو وەرئـەگێڕن لـەوبەڵگانـەو ئامۆژگـاری وەرنـاگرن و تـەمێ خـوار نـابن. کەواتـە ئەوکەسـانە بـاوەڕ بەدروست کەری خۆیان نەهێنن بـەهۆی ئەوبەڵگانـەوە تۆیـش دڵگـران مەبـە کـەباوەڕ ناهێنن. ئادەمیزاد بڕوایان بەبونی دروست کەری بونەوەران هەیە .

﴿ وَمايُؤمِنُ أكْثَرُهُمْ بِاللهِ إلاّ وَهُمْ مُشْرِكُونَ ﴾ وەزۆرتر لەئادەمیزاد باوەڕبە خوا نـاهێنن مەگەر ئەوان هاوبەش دانەنێن بۆ خوا لـەگـەڵ ئەوەیشـدا ئەگـەر لـەوان پرسیاربکرێ چ کەسێ ئاسمانەکان وزەوی وخۆرو مانگی دروست کردوە؟ ئەڵێن: خوا ئەوەتە گاورەکـان ئەڵێن: عیسا کوڕی خوایە، جولەکەکان ئەڵێن: عوزەیر کوڕی خوایە، عەرەبەکان بتەکان ئەکەن بەهاوبەشی خواو ئەیشڵێن: فریشتەکان کچی خوان .

﴿ أفَآمِنُوا أنْ تأْتِيَهُمْ غاشِيَةٌ مِنْ عَذابِ اللهِ ﴾ ئایائەیەوبێباوەڕە هاوبەشـدانەرانە ناترسـن سزایەکی بەربلاو بێت بۆ لایان لـەسزای خواو ئەوان بەگشتی داپۆشی ؟

﴿ أوْ تَأْتِيهُمُ السّاعةُ وَهُمْ لايَشْعُرُونَ ﴾ بالـەناکاودا پاشـەڕۆژ بێـت بۆلایـان و، ئـەوان هەستی پـێ نەکـەن و خـەریکی کـاری خۆیـانبن لـەبازاڕو لـەکێڵگـەکانا، لـەکارگـەداو لـەدەریاو لـەزەوی و لـەهەوابن .

لـەپاشا خوای مەزن فەرمان ئەدا بەپێغەمەری خـۆی بـۆ بـت پەرسـتانی ڕون بکاتـەوە ڕێگەی ڕاستی ئایینی خوا و ئەفەرموێ :

قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ

ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓۗ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۗ وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٠٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُۖ وَلَا يُرَدُّ بَأۡسُنَا عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١١٠﴾ لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِۗ مَا كَانَ حَدِيثٗا يُفۡتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصۡدِيقَ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَتَفۡصِيلَ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿١١١﴾

﴿ قُلْ هذِهِ سَبيلي أدْعُوا إلى بَصيرَةٍ أنا وَمَنْ أتبَعَني ﴾ تۆ بلّێ بەبت پەرستان : ئەورێگەی ئەو تۆیە من و پەیرەوانی من بانگی ئەکەین لەیەکێتی خواو باوەڕ بەخوایە لەسەر بەڵگەی ئاشکرای واین راست و پوچ جیا ئەکاتەوە لە یەکتری و لەسەر بڕوای بێگومانین و هەمو ئادەمیزادێ بانگ ئەکەین بۆلای و ڕێبازی ئێمەیە. بێگومان هەموو پێغەمەران و نەتەوە دڵسۆزەکانیان بەجۆرێکی دادپەروەرانەو لەسەرخۆو لەسەر بەبەڵگەی ڕونن و بانگی ئادەمیزاد ئەکەین بۆلای پەرستنی خوا.

﴿ وَسُبْحانَ اللهِ وَماأنا مِنَ المُشْرِكِينَ ﴾ وەپاکی وخاوێنی لەشتی نارەوا بۆ خوایە و، من لەوکەسانە نیم هاوبەش بۆ خوا دائەنێن و پەرستن هەربۆ خوایە بەتەنها.

بت پەرستانی مەکە ئەیان ووت: ئەگەر خوا ئارەزووی هەبوایە فریشتەی ڕەوانـەکردو داوایان ئەکرد لەئێمە باوەڕبهێنن، خوای مەزن بۆ ئەو داوایەی ئەفەرموێ :

﴿ وَماأرْسَلْنا مِنْ قَبْلِكَ إلا رجالاً نُوحي إلَيْهِمْ مِنْ أهْلِ القُرى ﴾ وە ئێمـە لـەپێش تـۆوە ڕەوانەمان نەکردوە هیچ کەسێ مەگەر پیـاوان ئێمـە ڕەوانـەمان ئـەکرد بۆلایـان سـروش لەدانیشتوانی گوندەکان و شارەکان، ئیتر گەورەبن ئەوشارانە یابچووك .

زانایان ئەڵێن ئەوئایەتە بەڵگەیە لـەسەرئەوەی خوای گەورە هـەرگیز ژنـانی نـەکردوە بەپێغەمەر، پیاوی لادێی ڕەوانە نەکردوە بـۆ پێغەمەرایـەتی، چونکـە ووشـك ودڵ ڕەقیـان تێدایە. مەبەستیش لەوئایەتە ئەمەیە: وەڵامی ئەوکەسانە ئەداتەوە باوەڕیان بەپێغەمەرایـەتی مەحەمەد نەبوە. هەر ئەوبەتەنها نەکراوە بەپێغەمەر، پێغەمەرانی پێشویش پیـاو بـوون وەك ئەو خواردنیان خواردوەو چونەتە بازاڕ، ئیتر چۆن سـەریان سور ئـەمێنێ لەپێغەمەرایـەتی مەحەمەد و سەریان سوڕنامێنێ لەپێغەمەرایەتی پیاوانی پێشوو .

﴿ أفَلَمْ يَسيرُوا فِي الأرْضِ فَيَنْظُرُوا كَيْفَ كانَ عاقِبَةَ الّذِيْنَ مَنْ قَبْلِهِمْ ﴾ ئایـا دوایـی بـۆ ئەوکەسانە تۆ بەدرۆ ئەخەنەو نە ڕۆیشتون بەڕوی زەویدا، بەتایبەتی شام ویەمەن وشـوێنی گەلی نوح وعادو سەمود، دوایـی تەماشـا بکـەن پاشـەڕۆژی کەسـانێکی ئـەوتۆ لـەپێش ئەوانەوە بوون پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆ ئەخستەوە چون بوەوەو بۆ بنەبڕکراون ؟

﴿ وَلَـدارُ الآخِـرَةِ خَـيْرٌالّذِيْنَ اتّقُـوا أفَـلا تَعْقِلُـونَ ﴾ وە بەڕاسـتی خـانوی پاشـەڕۆژو گوزەران وئەو شتەی لەویدان چاکترە لەڕابوادرن و ژیانی جیـهان بـۆ کەسـانێکی ئـەوتۆ لەخوا بترسن و خۆیان ئەپارێزن لـەبێ فەرمانی خوا. ئایا دوایی ئەقڵی خۆتان بەکارنایـەرن و تەمێ خوار بن وباوەڕبهێنن .

خوای مەزن لـەوەوبەر پێغەمەرانی ڕەوانە ئەکرد بۆ لای گەلـەکانیان و هەوڵی زۆریـان ئەدا لـەگەیاندنی فەرمانی خوا، دوایی سەرکەوتنی ئەوپێغەمەرانە بۆ ماوەیە لـەلایەن خوای گەورەوە دواکەوتوە .

﴿ حتّى إذا استَيْأسَ الرُسُلُ وَظَنُّوا أنَهُمْ قدَمَ كَذّبُوا جاءَهُمْ نتصرُنا ﴾ هەتا کاتێ بێ ئومێد ئەبون پێغەمەرەکان وبەتەمای سەرکەوتن نەئەمان و گومانیان ئەبرد لەدەروونی خۆیانا بەڕاستی بەدرۆ خراونەتەوە لەلایەن هەندێ لەگەلەکانیان کەبەردەوام بون لەسەر بێ باوەڕی و سزایان نادرێ لەلایەن خواوە. بەوبۆنەوە دوودڵی بکەوێتە دڵی باوەڕدارانەوە، کاتێ توشی ئەو گومانە ئەبن دێت بۆلای ئەو پێغەمەرانە یاریدانی ئێمەو سەریان ئەخەین .

﴿ فَنجيء مَنْ نَشاءُ وَلايَرُدُ بَأسَنا عَنْ الْقَوْمِ الُمجْرِمِيْنَ ﴾ دوایی ڕزگار ئەکرێ لەسزای ئێمە هەرکەسێ ئارەزووی بکەین لەبەندەکانی ئێمە و ناگێڕرێتەوە سزای ئێمە لەوتاقمانە تاوانبارن و پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆئەخستەوە. براکانی یوسوف و ژنی عەزیز و پاشای میسر تەمێخواری وپەندن بۆ ئەوکەسانەی خاوەنی ئەقڵن. وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ لَقَدْكانَ فِيْ قِصَصِهِمْ عِبْرَةً لأولي الالْباب ﴾ بەڕاستی هەیە لەچیرۆکی پێغەمەران و هەواڵی یوسوف و براکانی ئامۆژگاری کردن و تەمێ خواری بۆئەوکەسانە خاوەنی ئەقڵن.

﴿ ماكانَ حَدِيْثاً يُفترى وَلكِنْ تَصْدِيْقَ الّذي بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾ ئەوقورئانەی باسی ئەوهەواڵانە ئەکا گفتوگۆیە نیە هەڵبەسترێ لەلایەن موحەمەدەوە ﴿ ﷺ ﴾، بەڵام ئەوڕاستانەی ئەوان بەڕاست ئەگێڕی شتێکی ئەوتۆ هاتوە بۆلای پێغەمەرەکان لەنامەکانی خوا، وەك تەورات وئینجیل، ئەم قورئانەیش دەقی ئەونامانەیەو لەیەك سەرچاوەوە هاتوون .

﴿ وَتَفْصِيلُ كُلّ شَيءٍ وَهُدىً وَّرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤمِنُونَ ﴾ وەئەو قورئانە ڕونکردنەوەیە بۆ هەمو شتێ بەدرێژی و ڕونی پێویستی هەمووئادەمیزادە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئایینیان، چونکە ڕاستەوخۆ وەك قورئان یابەبەڵگەی قورئانەوە لەفەرمودەکانی پێغەمەر وئیجماع قیاس یاساو دەستورن وقورئان شارەزایی کەرە بۆ لادان لەگومڕایی بەخشش و یاریدانە بۆ تاقمێ باوەڕیان بەخواو بەپێغەمەران هەیە، هەر ئەوانیش سودیان لێ وەرئەگرن .

بۆ زانین: شێخ ئەبو مەنسور ئەفەرموێ لەباسکردنی یوسوف وبراکانیان ئـارام گرتنـی پێغەمەری تێدایە لـەسەر ئازاری قورەیشەیکان بۆی، چونکـە براکـانی هەرچـەندە ئایینیـان یەکبو برای یەکتریش بون ئەوکارانـەیان لەگـەڵ یوسـوف کـرد لـەپیلانی لـەناوبردنی و ئارامیشی گـرت، کەواتـە تـۆ شایسـتەتری ئـارام بگـری لەسـەر ئـازاری قورەیشـیەکان کەئاییینیان جیاوازە لـەگەڵ یەکتری و لـەگەڵ تۆیش .

بەیاریدەی خوا کۆتایی بەسورەتی یوسوف هات ،خوای خاوەن بەزەیی خۆت ئاگاداری شاراوەی دەرونی منی داواکارم لـە تۆ جیٚبەجیٚیان بکەی بۆم .

(١٦) ی مانگی رەمەزانی (١٤٢٠)

بەرانبەر ٢٣ / ١٢ / ١٩٩٩

# ﴿ سورەتی ڕەعد ﴾

زانایان بیریان جیاوازە لە بارەی هاتنە خـوارەوەی ئـەم سـورەتە: هـەندێکیان ئـەڵێن: هەموو ئایەتەکانی لە مەککە هاتونەتە خوارەوە. هەندێ تریان ئەڵێن: لە مەککە هاتووەتـە خوارەوە جگە لە ئایەتی (٣١-٤٣)لە مەدینە هاتونەتـە خـوارەوە. هـەندێ تریـان لایـان وایە: هەموو ئایەتەکانی لە مەدینە هاتونەتە خوارەوە جگە لە ئایەتی (٣١). هەندێ تریـان ئەڵێن: لە مەککە هاتووەتە خوارەوە جگـە لـە ئایـەتی(١٢). ژمـارەی ئایەتـەکانی (٤٣) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓمٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ۗ وَٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١﴾

﴿ بسم الله الرحمن الريحم ﴾

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

(المر) لە سورەتەکانی پێشودا باسی مابای ئەو پیتانە کراوە. بەڵام خـوای مـەزن ڕونـی کردۆتەوە کە ئەم سورەتەو سورەتەکانی تریش دەستی پێ کراوە بەم پیتانەو بەپیتـەکانیتر بۆ ئەوەی ببنە هۆی بەرزی وسەرکەوتن بە سەر هەموو گفتو گۆکانی عەرەبدا، بە جۆرێ هەموو دوژمنانی قورئان چارەیان نەمێنێ جگە لەوەی سەری بۆ شـۆڕ بکـەن، هەرچـەندە ئەو قورئانە بە زمانی ئەو عەرەبانە هاتۆتە خوارەوەو بەو پیتانە ڕستەی زمانیان بەوان پێـك دێ ناتوانن بەرەنگاری بکەن لەگەڵ ئەوەیشدا خۆیـان عـەرەبن و زمانیشـیان پـاراوە لـە عەرەبیدا.

﴿ تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ وَالَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِـنْ رَبِّـكَ الْحَقُّ ﴾ ئایەتـەکانی ئـەم سـورەتە بەشێکن لـە ئایەتەکانی نامەی بەرزی خوا کە قورئانە بێ جیاوازی و ئـەو شـتەی ئـەو تـۆ نێراوە بۆ لای تۆ لەلایەن پەروەردگاری خۆتـەوە هـەموویان ڕاسـتن و لـە لایـەن خـواوە هاتون.

﴿ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لايُؤْمِنُونَ ﴾ بەڵام زۆرتری ئادەمیزاد باوەڕ بەو قورئانەو بە ڕاستی و داد پەروەری ئەو قورئانە نابەرن، ئەو کەسـانەی بـاوەڕ بـەو قورئانـە ئەکـەن چاکـەی ئادەمیزاد بە چاکەی خۆیان دائەنێن و ئازاری ئەوان بە ئازاری خۆیان ئـەزانن. بـەڵام ئـەو تاقمەی باوەڕدارن بەرانبەر بـەبێ بـاوەڕان زۆر کـەمن جابۆیـە خـوا ئەفـەرمۆێ:زۆر لـە ئادەمیزاد باوەڕ نا بەرن.

ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَٰرًا ۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٣﴾ وَفِى ٱلْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَٰوِرَٰتٌ وَجَنَّٰتٌ مِّنْ أَعْنَٰبٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلْأُكُلِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾

﴿ اللهُ الّذي رَفَعَ السَّماواتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنها ﴾ خوا كەسـێكی ئـەو تۆیـە ئاسمانـەكانی بەرز كردوەتەوە و ڕای وەستانوە بەو جۆرەی ئێوە ئەیبینن بـەبێ كۆڵەكەیـە لـەژێریابێ و بەبێ شتێ پـەیوەندی بەسـەرەوەی ئـەو ئاسمانانـەوە هـەبێ. هـەر بـەو جۆرەیـش هـەموو ئەستێرەكانی ڕاوەستاندوە بەبێ كۆڵەكەیە ڕای گرتبن، هەمویان لە بۆشاییدا ئەسـوڕێنەوە. گەورەیی تەنی ئاسمانەكان مەگەر هەر خوا بیزانێ .

﴿ ثُمَّ اسْتَوىا عَلَي الْعَرْشِ ﴾ لە پاشا خوا ئەوپەڕی دەسەڵاتی پەیدا كرد بەسەر هەموو بونەوەرانداو هەموویانی خستە ژێر تووانای خۆی و بـە گوێـرەی زانیـاری خـۆی هـەڵیان ئەسوڕێنێ، وەك خوا ئە فەرموێ ووشەی عـەرش هێمایـە لـە خاوەنیـەتی خـوا بـۆ هـەمو بونەوەران .

﴿ وَسَخَرَ الشَمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمى ﴾ وە خوا خۆرو مانگی ڕام كـردوە بۆ سودی بونەوەران، ئەیانبا بە ڕێوە هەر چۆنێ بیەوێ، هەمویان ئەڕۆن بە شـوێنی دیـاری كراوی خۆیانا هەتا نەمانی جیهان. یانێ خۆر لــە مـاوەی سـاڵێكدا و مـانگ لـە مـاوەی مانگێكا ئەڕۆن بە جێگەی دیاری كراوی خۆیان و چركەیەك لەوەی بۆیان دیاری كـراوە لانادەن هەتا كۆتایی پێهاتنی بونەوەران .

﴿ يُدَبِرُ الْأَمْرَ ﴾ خوای مەزن ئەبا بـەڕێوەكاری بونـەوەرانی سـەرەوەو خـوارەوە بـەو فراوانیـەوە هەیانـە بەهـەر جـۆرێ ئـارەزۆی بكـاو هیـچ شـتێ بـێ ئاگـای ناكـا لــە كاری‌بونەوەران، دروستیان ئەكاو لەناویان ئەبا. ئەو ڕسـتەیە بەڵگەیـە لـە سـەر ئـەوەی بونەوەران پێویستیان بەڕێوەبردنی خوا هەیەو هـەمویان لـەژێر توانـای ئـەودان، هـەروەك پێویستیان بە ناردنی پێغەمبەران هەیە لەبەر ڕاگەیاندنی دەسەڵاتی خوا بۆیان، هـەمو شـتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ .

﴿ يُفصِّلُ الآياتِ لَعَلَّكُمْ بِلِقـاءِ رَبِكُـم تُؤمِنُـونَ ﴾ خوا ڕون ئەكاتـەوە بـە درێـژی ئـەو نیشانانە بەڵگەن لەسەر یەكێتی خوا لە نامەكانی خۆیا نـاردوونی بـۆلای پێغەمبـەران بـۆ ئەوەی ئێوە باوەڕی بێگومان پەیدا بكەن بە خزمەت گەیشـتنی پـەروەدگاری خۆمـان لـە

ڕۆژی دوایدا بۆ ئەوەی یاداشتی کردەوەی خۆتان وەربگرن، هەر کەسێ بۆی دەرکـەوت خوا ئەو توانانەی پێشوی هەیە ئەبێ باوەڕی بێگومانی بـەو خوایـە هـەبێ . پـاش ئـەوەی خوای مەزن باسی ئاسمانەکان و زەوی کرد هەتا ئادەمیزاد وووریا بکاتەوە لەسەر گەورەیی خۆی و بۆیان دەرکەوێ ئەو کەسەی ئەو بونەوەرانە دروسـت بکـا خـاوەنی توانایـە کـە پێغەمبەران بنێرێ و نامەیشیان بۆ بنێرێتە خوارەوە، ئەتوانێ مردووانیش زیندو بکاتـەوە بـۆ پرسیار کردنیان لەسەر کردەوەکانیان، ئەمانەیش نمونەیەکن لە توانای خـوای مـەزن کـە ئەفەرموێ:

١-﴿ وَ هُوَ الَّذِي مَدَّ الأَرْضَ ﴾ وەخوا کەسێکی ئەو تۆیە زەوی درێژوپـان کـردووەو ئامادەی کردوە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بەئاسانی بڕواو بگەڕێ بەسەر هەمو کونـج و قوژبنـی زەویدا بۆ سودی ژیانیان. ئاشکرایە ڕاخستنی زەوی و فراوان کردنی ئەوە ناگەیـەنێ کـە زەوی پانبێ یا خڕ، چونکە هەمو تەنێ کە قەوارەی گەورەبێ وێنەی زەویـی هەمولایـەکی درێژو فراوان ئەبێ با خڕیش بێ. کەواتە ناکرێ بە بەڵگە لەسەر ئەوەی زەوی خڕ نـەبێ. بەبێ گومان لە شوێنانی تردا بەڵگەی ڕاست ڕونی کردوەتەوە کە زەوی خڕە، شـتێ خـڕ بێ و لە ئەوە پـەڕی گـەورەییدابێ وەك زەوی هـەمو پارچەیـەکی وا ئـەبینرێ کـە پانـە، زانایانی یۆنان لە کاتی ئەرەستودا پێك هاتوون لەسەر خڕی زەوی هەرچەندە ئەیان ووت: زەوی ناجوڵێ.

٢- ﴿ وَجَعَلَ فِيها رَواسِيَ ﴾ وە خوا دروسـتی کـردوە لـە زەویـدا چـەندین کێـوی وەستاو و نەجولاو لە جێگەی خۆیانا بۆ ئەوەی زەوی جێگەی خۆی بگرێ و نـەجوڵێ و ئازاری دانیشتوان نەدا. لەزەویدا دروستی کردوە کانگاو بەردیجۆراو جـۆر بـۆ سـودی ئادەمیزا .

٣- ﴿ وَ أنهارا ﴾ وە دروستی کـردوە هەرلـە زەویـدا چـەندین ڕووبـاری گـەورە و جۆگەی بچوك و مام ناوەندی، بـۆ ئـەوەی ئێمـە ئاوەکـەی بخۆینـەوە خۆمـانی پـێ پـاك بکەینەوە و بەکاری بهێنین بۆ ئامادە کردنی نان و خواردەمەنی تر، کشت و کاڵ و بـاخ و بێستانی پێ ئاو بدەین بۆ خواردنی خۆمان و ئاژەڵەکان.

٤- ﴿ وَمِنْ كُلِّالثَّمراتِ جَعَلَ فِيها زَوْجَيْنِ إِثْنَيْنِ ﴾ وەخوا دروستی کردوە لە زەویــدا چەندین میوەو دانەوێڵە جۆتێ دووان. نێرینەو مێینە، هەتا درخت و جگەی درخت ئـاوس بن و میوەی خۆش و دانەوێڵەمان بۆ بسازێنن، ئیتر ئەو نێرو مێیە بە هــەر جـۆرێ بگـەن بەیەکتری گرنگ نیە بەهۆی ئادەمیزادەوە بێ یابەهۆی باو باڵندەو جرو جانەوەری تـرەوە بێ، لەهەموو ڕەنگ و تامێ ئەو میـوەو دانەوێلانـە پـەیدا ئـەبن و ئـاو و زەویەکانیشـیان یەکن. هەمو شتێ بەبێ نێرومێ بەرناگرن بەوێنەی ئادەمیزاد، ئیتر ئەو نێرو مێیانــە ئاشـکرا بن وەك خورماو زینەوەرانی تر یانهێنی بن وەك ڕووەکانی تـر. یـا لــە یـەك درەخـت بـن بەوێنەی زوربەی درەختەکان یا لـە دوودرەخت بن وەك خورما جرو جانەوەر بۆ گەیشتنی نێرو مێ بۆلای یەکتری دەوری سەرەکیان هەیــە، بـۆ نمونـە کاتـێ ڕژێمـە هاوپەیمانـەکان (کورسیکا کە دورگەیە لـە فەرەنسا) زەیتونەکانی نەخۆش کەوتن و بەرهەمیان کــەم بـو، ڕژێمی ئەمەریکا ویستی یارمەتی دانیشتوانی بدا مـادەی د. د.ت ڕژانـد بەسـەر درەختـی زەیتونەکاندا هەمو جرو جانەوەران مردن ساڵی دوایی بەتەواوی بەرهەمیان نەگرت .

٥-﴿ يُغشي اللَّيْلَ النَّهار ﴾ وە خوا دائەپۆشێ بـەتاریکی شـەو ڕونـاکی ڕۆژو جیـهان لـەلایەکی زەوی ڕوناکی نامێنێ، هەروەها ڕونـاکی ڕۆژ تـاریکی شـەو نایـەڵێ و لایـەکی زەوی ڕوناك ئەبێتەوەن هەر بەو جۆرە شەو و ڕۆژ دێــن و ئـەڕۆن هیـچ کامیـان دەسـت درێژی ناکاتە سەر ئەوی تریان .

﴿ إِنَّ في ذٰلِكَ لآياتٍ لِّقَومٍ يَتَفكَّرُنَ ﴾ بەڕاسـتی هەیـە لــەو بونەوەرانـەدا کـەدێن و ئەڕۆن و کاری خۆیان جێ بەجێ ئەکەن بە گوێرەی یاسـایەکی نـەگۆڕاو چـەند نیشـانەو بەڵگە لـەیەکێتی خواو توانـای خـوا بـۆ تاقمـێ ووردبینـەوە و بیربکەنـەوە لـە دروسـت کراوەکانی خوا، ئەو بونەوەرانە کەدێن و ئەڕۆن بـەجۆرێکی نـەگۆڕاو و لـێـی لانـادەن . ئەگەر بەو جۆرە نەبونایــە زانایـان نـەیان ئـەتوانی ئـامێری چـاودێری دروسـت بکـەن و بەجۆرێکی تەواو سودی لێ وەربگرن و هەمو جێگەکان و کــەش و هــەوای پـێ بزانـن . کەواتە ئاشکرایە = (الصَدفة ) ڕاست نیە، بۆیە زۆرتر لە زانایانی سروشت باوەڕیان هێنـا بەبونی خوای دروست کەری هەمو بونەوەران .

٦- ﴿ وَفِي ٱلأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجاوِراتٌ ﴾ وە لـە زەویـدا هەیـە چـەندین پارچەیـە نزیکـن لـەیەکەوەو لکاون بەیەکتریـیـەوەو سروشـتیان لـەیـەك جیـاوازە: هەیانـە دەشـتەو هەیانـە کێوون، هەیانە ڕەقەو هەیانە نەرمە ، هەیانە بەپیتەو ئـەوی تریـان نسـێیە. هەیانـە گڵـەو ئەوی تریان لمە. هەیانە ڕەشەو ئەوی تریان سپیە یا سورە یا زەرد یا ڕەنگـی تـر. هـەتادێ سروشتیان جیاوازن . ئەوانە بۆ سودی ئادەمیزادە.

﴿ وَجَنّاتٌ مِّنْ أعْنابٍ وَّزَرْعٌ ﴾ وەهەیشە لـە زەویدا چـەندین بێسـتان لـەترێ جـۆراو جۆر و شینایی و کشت و کاڵ و دارو درخت لەهەمو جۆرێ .

﴿ وَنَخِلٌ صِفْوانٌ وَّ غَيْرُ صِفْوانٍ ﴾ وە هەیشە لـە زەویدا چەندین درەختی خورمـای وا کەکۆیان ئەکاتەوە یەك ئەسڵی تەنهاو جیاواز نین لـە یەکتری و خورمای وایش هەیـە لـە چەندین ئەسڵی جیاوازن، یانێ خورما جۆری زۆرە. ئەو هەمو درخت و دانەوێڵەو میوانـە بەو هەموە جیاوازیەوە هەیانە لەلایەن تـام و ڕەنـگ و گـەورەو بچوکیـەوە لـەگـەڵ ئـەو هەموە جیاوازیانە .

﴿ يُسْقىٰ مِنْ مّاءٍ وّاحِدٍ ﴾ هەمویان ئاو ئەدرێن بە ئاوێکی تەنها لـە ئاوی باران یا ئاوی بیر یا ئاوی ڕوبار، لـەیەك جێگەی تایبەتی زەویدا ڕوواون بەرهەمەکانیان هەیانـە شـیرینن. هەیانە تاڵن. هەیانە گەورەن. هەیانە بچوکن. هەیانە ڕەشن. هەیانە سپی. هەتا دێ .

﴿ وَنُفَضِّلُ بَعْضَها عَلىٰ بَعْضٍ فِي ٱلأُكُلِ ﴾ لەگەڵ ئەوەیشدا کە هۆیِ بونیان و گەشـە کردنیان یەکە ئێمە ڕێزی هەندێکیانمان داوە بەسـەر هـەندێ تریانـا لـەخواردندا. ئەوەتـە ڕێزی گەنم دراوە بەسەر جۆدا، ڕێزی هەندێ میوە دراوە بەسەر هەندێ تریانا.

﴿ إنَّ فِي ذٰلِكَ لآياتٍ لِّقَوْمٍ يَّعْقِلُـونَ ﴾ بەڕاسـتی هەیـە لـەو جیاوازییـەی بەرهـەمیانا لەگەڵ ئەوەیشدا شوێن و ئاویان یەکـە چـەندین بەڵگـەو نیشـانە ئاشکرا لـەسـەر بونـی خوایەکی بەتوانا بۆ تاقمێ ئەقڵی خۆیان بخەنەکار بۆ ئـەوەی بـاوەڕ بـهێنن بـەو کەسـەی دروست کەری ئەو بونەوەرانەیە.

بۆ زانین: چاکترین شتێ بێژرابێ بۆ بۆڕانی ئەو تاقمانە ئەڵێن: ئەم جیهانـە بەردەوامـەو کۆتایی پێ نایە= ﴿الدّهريّون ﴾ فەرمودەی جەمالـەدینی ئەفغانیـە لەنامـەی خۆیـا ( الـرّد علىٰ الدّهريين )ئەفەرموێ :

( هەرکاتێ پرسیار کرابێ لە (داریۆن ) لەو دارو درختانە ڕاوەستاون لـە دارستانی هیندوستاناو لەو هەمو ڕووەکانە لە کۆنترین ماوەدا پەیدا بوون و مێژو کاتی بۆ دیاری نە کراوە بەجگەی گومان نەبێ و هەمویان ڕوواون لەجێگەیەکی تەنها داو لقەکانیان بـەرەو ژور ڕۆیشتون، دوایی هۆی گۆڕانی هەمویان چ شتێکە لە بنچینەو ڕەنگ و گلاۆدرێژی و کورتی و قەڵەوی و بـاریکی و گولـو بەرهـەمو بۆنیانـەوە؟ چ شـتێکی دەرەکـی کـاری کردبێتە سەریان جیاوازبن لەیەکتری لەگەڵ ئەوەیشـدا جێگـەو ئاووهـەوایان یەکـە؟ مـن گومان ئەبەم کە بە ڕاستی ڕێگەیە نیە بۆ وەڵامدانەوەی جگەی ئـەوەی پـەکی بکـەوێ• ئەگەر پرسیاری لێ بکرێ: ئەو ماسیانەی لە ڕوباری ئۆڕاڵ و دەریـای قـەزوێندان لەگـەڵ ئەوەیشدا خواردن و خواردنەوەیان و هاتوچوو پێش برکێیان یەکە، کەچی ئێمە جیـاوازی ئەبینین لەنێوانیانالـەڕەگەزیان و ڕ ەنگ و لەشیان زۆر دورن لەیەکتری، ئـەبێ هـۆی ئـەو جیاوازیانە چ شتێ بێ؟ دوایی من وای ئەبینم وولام بەبێ جگـەی لـەوەی هەناسـەی دەر نەیە ) لەوانەیە تۆ پرسیار بکەی : داریۆن بۆی هەیە وولامی بەرێز ئەفغانی بداتەوەو بڵێ: زانایانی ڕووەك نـاس هـۆی سروشـتی ئـەو ڕووەکانـە ئـەزانن و ئـەتوانن وولامیهـەموو داواکەران بداتەوە. کەواتە لەو کاتەدا پێویستی بـەوە نابـێ بەڕێوەبـەرێ تربـێ لەپشـت سروشتەوە. وولامی ئەو پرسیارە ئەدەینەوەلەوانەیە زانایانی ڕووەك بزانـن، بـەلام زانینـی ئەوان سنورێکی بۆ هەیە تۆ لەو سنورەدا بوەستی و نەتوانن تێپەڕبکەی لەو سـنورە. ئەوەیش ئەوان ئەیزانن هوێکی نزیکی ڕاستەو خۆیە. ئەگەر پرسیار بکرێ لە هوێکی دوری ئەوتۆ ئەو هۆ نزیکەی پەیدا کردوە هیچ جـۆرە مانایـەکیان دەسـت ناکـەوێ مەکەر ئەم دوو شتە: یا ئەبێ ئەو هۆ دورە ڕێکەوتبێ یـا بەڕێوەبـەرێکی وا کەهـەمو شتێ لە جێگەی شیاوی خوا دائەنێ و لەو دیوی سروشتەوە بێ، یەکـەمیان پوچـەو چونکە ڕێکەوت دووپات نابێتەوە بـەردەوام نابـێ ودوهـەمیان دیـاری ئـەکرێ کـە بەڕێوەبەری هەمو شتێکە .

وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ ۗ أُولَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ وَأُولَٰٓئِكَ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَاقِهِمْ ۖ وَأُولَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٥﴾ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ وَقَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ ٱلْمَثُلَٰتُ ۗ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ ۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٦﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦٓ ۗ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٌ ۖ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴿٧﴾

﴿ وَإِنْ تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ إذا كُنّا تُراباً ﴾ وە ئەگەر تـۆ سـەرت سـوڕ ئـەمێنێ لـە پەرستنی بتەكان و سەرت سوڕ ئەمێنێ كە بت پەرستان باوەڕیان بەزیندوبونەوە نیە، دوای گفتوگۆی ئەوان جێگەی سەر سوڕمانە كە باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی تۆ نیـەوباوەڕیان بـە زیندو بونەوە نیەو ئەڵێن: ئایا ئێمە كاتێ ئەمرین و ئەبین بە خاك .

﴿ أإنّا لَفِيَ خَلَقٍ جَدِيدٍ ﴾ ئایا بەڕاستی ئێمە ئەبینەوە بە دروسـت كراوێكـی تـازە وەك جاری پێشومان، هەرگیز شتی وانابێ. كەچی ئەو كەسانە ئەڵێن: خوا بونەوەرانی دروست كردوە. كەواتە بتوانێ یەكەم كات بونەوەران لـە نەبونەوە دروست بكـا چاكـتر ئـەتوانێ لەسەر پاشماوەی لـەشەكانیان بۆ جاری دووهەم زیندووان بكاتەوە، زۆر ئاسان ترە لای.

﴿ أولَئِكَ الّذينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ وَأُلَئِكَ الأَغْـلالُ في أعْناقِـهِم ﴾ ئـەو کەسـانەی ئـەو تـۆ باوەڕیان بە پەروەدگاری خۆیان نەبوە، ئەو کەسانە زەنجیر ئەکرێتە ملیان و پێوون ئەکرێن لە ڕۆژی دووایدا.

﴿ وَأُولَئِكَ أصْحابُ النّارِ هُمْ فِيها خالِدونَ ﴾ وە ئەو کەسانە دانیشـتوی نێـو ئـاگری دۆزەخن، ئەوان لـەنێوئەو ئاگرەدا بەردەوامن هەتا هەتایە. ئەو کەسانە کە کەرەسەو مادە پەرستن کاتێ بڕوایان بەبونی خوا نەبێ چاکتر بڕوایان بە زیندو بونەوەی پاش مردن نـابێ، بەڵگەکانیان بۆش وپوچە، ئەڵێن: هەر شتێ دەرکەوتو نەبێ لەلایەن هەستەکانەوە نـەبینرێ ئەبێ باوەڕی پێ نەکرێ، چونکە هەر شتێ هەستی پێ نەکرێ چۆن باوەڕ بەبونی ئــەکرێ؟ ئەو کەسانە بەو جۆرە وابن، چۆن ئەبێ بڕوایان بە بەهەشت و بە دۆزەخ و سزای دۆزەخ ئەبێ، ئاشکرایە باوەڕیان پێیان نابێ ئێمە پرسیار لەو مادە پەرستانە ئەکەین لە چ لایەکەوە زانیویانە کەهەر ئەبێ هەست ڕاستی هەمو شتێ دەربخاو جگە لە هەست و حیـس پـوچ و بۆش بێ؟ ئەگەر ئەو کەسانە وەڵام بدەنەوەو بڵێن:بـەهۆی هەسـتەوە زانیومانـە، ئێمـەیش ئەڵێین: هەر ئێوە بەتەنها خاوەن هەست نین و جگەی ئێوەیش ئێمەیش خاوەنی هەسـتین و کەسی ترمان جگەی ئێوەمان نەدیوە بڵێ:بڕوا بەهیچ شتێ ناکەین جگــە لــە هەسـت بـۆ ناسینی بونەوەران،ئەگەر ئێوە بڵێن: بە جگەی هەست زانیومانە هەر بە گفتو گۆی خۆتان بۆڕ ئوخۆن،چونکە باوەڕتان بۆ جگەی هەست دەربڕی،ئێمەیش ئەوەمان ئـەوێ بـۆ بـیرو بۆچونی خۆمان. بۆ ئەوەی چاکتر ( مادیەکان ) بۆڕ بدرێن ئەم بەراوردانەی خوارەوە ڕون ئەکەینەوە.

١-ئەوەی ڕاستی بێ زانایان دەستیان کەوتوە (١٤) هەزار هێڵی ڕێك و پێکیان لـەنێو مێشکی ئادەمیزادادۆزیتەوە بە ئەو پەڕی نەگۆڕان، بەوردەکاریەوە بە پێویسـتی سەرشـانی خۆیان هەڵئەسن .گەورەترین و زاناترین ئەندازیار بگرە هەمویان لـەسەر ئەوەن هەر کاتـێ بە ئەندازەی موێ لە جێگەی خۆیان لابـدەن هەسـتی مـرۆڤ نامێنـێ یاتوشـی لەخشـەو سستی ئەبێ، ئەقڵ بۆ مانای ئەو شتە هیچ بەڵگەیـەکی لانیـە جگـەی بڕیـار بـدا بـەبونی

بەڕێوەو زانایە نەبەچاو و نە بەگوێچکە و نە بەلوت و نە بـەزمان هەستی پـێ نـەکرێ . بێگومان ڕێکەوت بەهەمو تواناپەوە ئەگەر هەیبێ ناتوانێ جێگەی دانانی کارەبایە دروست بکا (١٤) هەزار هێڵی لەسەر دابنێ لـەیەك کاتا . دوایی چۆنـی بـۆ ئـەلوێ ئەگـەر ئـەو جێگانە بە ئەندازەی سەری هەمو ئادەمیزادو مێشکیان بێ ؟

٢-(مادیەکان) ئەڵێن: مێشکی ئـادەمیزاد دەق بـە دەق وێنـەی ئـەقڵی ئەلەکترۆنیـە، هەردولایان کۆکراونەتەوە لـەچەندین پارچەی ووشـــك و ڕێـك خـراون و پـاڵدراون بـە یەکەوە بەجۆرێ هەموکارێکی لەسەر ڕێك خـراوە، زانـای فەرەنسـی (کوسـا) وولاٚمـی داونەتەوەو ئەڵێ: هەرکاتێ ماشینەکەی من دەنگێکی لێوە دەربچێ و هاوار بکا بەوبێنەی کەسێ توشی باداری بوبێ ئایا من ئەتوانم لـەو کاتەدا بڵێم: ماشینەکەم توشی باداری بـوە؟ یا هەر کاتـێ (کاربوتـیر) قورسـایی خسـتە سـەر بـەنزین و خنکـانی مـن ئـەتوانم بڵێـم: ماشینەکەم توشی هەناسە کورتی بوە؟ جابا هۆیێ بکەینەوە بۆ لای گفتوگۆی ئەو زانایـــەو بڵێن: ڕێك خستنی پارچەکانی ئەقڵی ئەلەکترۆنی کردەوەی مرۆوڤە. بـەلاٚم چ کەسـێکە مێشکی مرۆڤی ڕێك خستوە؟ کاتێ ئادەمیزاد ئەقڵی ئەلەکترۆنی دروست کردوە ئـەتوانێ ئەقڵی وێنەی ئەو ئەقڵە یا خوار تر یا دەموسێ دروسـت بکـا .زانـای سـۆڤییەتی (یـوری باخلۆف ) لەنامەی خۆیا (العمل والمخ ) ئەڵێL ئەو کەسـانەی گومـان ئەبـەن لـەوانەیـە: ئەقڵی ئەلەکترۆنی جێگەی مێشك بگرێتەوە بەهەڵـەیەکی زۆر گەورەدا چوون . بەڕاسـتی مێشکی ئادەمیزاد شایستەیە بۆ وەرگرتنی زۆر شتی گرنگ بـەبێ کۆتـایی . بـەلاٚم ئـەقڵی ئەلەکترۆنی توانای بۆ دیاری کراوە لـەلایەن ئادەمیزادەوە .

٣-زانایان دەریان خستوە: هەر کاتێ پلەی گەرما بەرزبویەوە لـــە نێـو شـانەی مێـش هەنگدا کۆمەڵێ لـەو مێشانە ئەڕۆن و بە لـــەمۆزی خۆیانـەوە هـەندێ ئـاو ئـەهێنن و لـە هەماراوا دای ئەنێن هەتا ئەندازەیەکی پێویست .کـۆ ئەکەنـەوە، تاقمـێ تریـان هەڵئەسـن بەپرژاندنی ئەو ئاوە، تاقمێ تریان باڵەکانیان ئەخەنە جوڵە بۆ پەیداکردنی هـەوای گـەرم، دوایی ئەو ئاوە کتوپڕ ئەبێ بە هالاٚو، بە بۆنەیەوە پلەی گەرما دائەبەزێ .چ کەسێکە ئـەو

کارەی نیشان دابن؟ ڕێکەوتە یا هێزێکی ڕاست و ڕەوان جگە لە سروشت کە هەر ئەو هێزە سەرچاوەی هەڵسوڕانی هەمو بونەوەران بێ، زۆر بێگومانە ڕێکەوت بۆش و پوچەڵە، ئەو هێزە هەر خوایە کە سەر چاوەی کاروباری هەمو شتێکە .(فولتر) ئەڵێ لەبەردەم بیرکردنەوەدابۆ بونی خوا چەندین گیروگرفت هەن، بەڵام لەو بیرو بۆچونانە چەندین بێ ئەقڵی پەیدا ئەبن، هەروەها ئادەمیزاد لە گومانێکەو ئەڕۆن بۆ لای گومانی تر هەتا ئەگەنە لای ئەوە بڕوای بێگومان بەخوا نزیکترین شتەکە یاسای پێویستی بۆ بونەوەران بەوەوە هەڵسپێردراوە . پێغەمبەری خوا﴿ ﷺ﴾ بانگی بت پەرستانی ئەکرد بۆ لای یەکێتی و پەرستنی خوا، مژدەی ئەدانێ بە دەست کەوتنی پاداشتی چاك ئەگەر وەڵامی بدەنەوە، هەڕەشەی لێ ئەکردن بە سزادانیان ئەگەر پشتی تێ بکەن، کەچی ئەوان باشتر یاخی ئەبون و ئەیان ووت: ئەگەر ڕاست ئەکەی تۆ پەلە بکە بۆ هاتنی ئەو سزایە بۆ سەرمان، وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ ﴾ وە بت پەرستان بە گاڵتە پێ کردنەوە داوا ئەکەن لەتۆ بە گورجی بەر لە هاتنی خۆشی و بەختیاری ئەو سزایە خوا دیاری کردوە بێتە خوارەوە بۆ سەریان.

﴿ وَقَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِم الْمَثُلاتُ ﴾ وبەڕاستی ڕابوردوە لە پێش ئەوانە بۆ گەلانی پێشو چەندین سزا بە نیشانەی دیارە بەسەریانەوە .شایستەی ئەم بت پەرستانەیە تەمێ خوار بن بەبێ باوەڕانی پێش خۆیان . بەڵام زۆربەی ئادەمیزاد تەمێ خوار نابن بەجگەی خۆیان، هەتا دێت خراپتر دەبن، چونکە دوژمنی چاکەی تایبەتی خۆیانن و پەیڕەوی ئاینی پاك و ڕاست ناکەن.

﴿ وَ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِلنّاسِ عَلى ظُلْمِهِم وَ إِنَ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقابِ ﴾ وە بەڕاستی پەروەردگاری تۆ هەمو کاتێ خاوەنی لێ خۆش بونە بۆ ئادەمیزاد لەسەر ستەمکردن لەخۆیان لەجگەی هاوبەشدانان بۆ خوا، ئەگەر باوەڕ بهێنن بە خواو لە گوناهەکانیان پەشیمان ببنەوە لە جیهاندا. سزادانیان دوا ئەخا، بۆ ئەوە بیربکەنەوە و واز لە گوناه

کردن بهێنن و، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ هەمو کاتێ سزای سەختە بـۆ بـێ بـاوەڕان لـە پاشەڕۆژدا. بەبێ گومان دەرگای پەشیمان کراوەتەوە بۆ ئادەمیزاد بەر لە مردنیان .

﴿ وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَولاْ أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِنْ رَبِّهِ ﴾ وە ئەو کەسانەی ئەو تۆ باوەڕیان نـەهێناوە ئـەڵێن بـۆ نایەتـە خـوارەوە بەسـەر موحەمـەدا نیشـانەیەکی ڕون لـەلایـەن پەروەردگاری خۆیەوە پەك خەری دوژمنەکانی بێ، بە وێنەی داری دەستی موساو وێنـەی هوشتری صالح و زیندوکردنەوەی مردوان وەك عیسا.

﴿ إِنَّما أَنْتَ مُنْذِرٌ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هادٍ ﴾ خوای مەزن ئەفەرموێ بە پێغەمبەر: بەڕاستی تـۆ ترسێنەری بێ باوەڕانی، جگە لـە ڕاگەیاندنی فەرمانی خوا هیچ شـتێ پـەیوەندی بـە تـۆوە نیەو، بۆ هەمو گەلێ ڕانومایی کەرێ هەیە لـە پێغەمبەران و بانگیان ئەکەن بۆ لای پەرستنی خوا بە تەنها، هەر یەکە لەو پێغەمبەرانە یاریدراون بە جۆرە کارێکی پەك خەری تایبـەتی بۆ بۆڕدانیان. بە ڕاستی ئێمە تۆمان بـەهێز کـردوە بـەهۆی قورئانەوەکـە گەلەکـەتی لاڵ کردوە وە پەکی خستون بەو هەموە زمان پاراویە هەیانە .کەواتە تۆ دڵ تەنگ مەبە . لـە ئایەتەکانی پێشودا بت پەرستان وایان لـە پێغەمبەر کرد بۆ کاری پەك خـەرێ تـر جگـەی قورئان کە نیشانە بن بۆ پێغەمبەرایەتی ئەوبەڵام خوای مەزن نایان نـیرێ، چونکـە ئـەزانێ ئەوان نایانەوێ شارەزای ڕێگەی ڕاست بکرێن، بەگاڵتەوە داوای ئەکـەن لـەم ئایەتانـەی دواییدا خوا باسی ئەوەمان بۆ ئەکا کە خوا هەموشتێ ئەزانێ و خوا ئەفەرموێ:

ٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ٱلْكَبِيرُ ٱلْمُتَعَالِ ﴿٩﴾ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ

بِالنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴿١١﴾

﴿ اللهُ يَعْلَمُ ما تَحْمِلُ كُلُّ أنثى ﴾ خوا ئەزانێ بە شتێ هەمو ژنێ هەڵی ئەگرێ لە منالْ: نێر بێ یا مێ. یەکێ بێ یا زۆر تر بێ لە یەکێ. تەواو بێ یا ناتەواو. درێـژ بـێ یـا کـورت بێ. جوان بێ یا ناشرین. ڕەش بێ یا سپی جگەی ئەوانەیش.

﴿ وَما تَغيضُ الأَرْحامُ وَما تزْدادُ ﴾ وە خوا ئەیش زانێ بە شتێ منـاڵدانی ژنـان کـەمی ئەکاتەوە لـە ماوەی هەڵگرتنی منالەکـەی و ژمـارەی و لـەشـی لـە منالْدانیـا بەشـێوەی ئاسایی یانێ ئەوە منالْدان لە ناوی ئەباو، دوایی بە وێنەی ئاوێکی لێـی دێـی زەوی قوتـی بداو ئەیشزانێ بە شتێ منالْدان زۆری ئەکا لـە ژمارەی منالْ یەکبێ یا زۆرتر. ئەندام لەشی تەواوە یا ناتەواو. ماوەی دانانی منالەکە کەمبێ یا زۆر.

﴿ وَكُلُّ شيءٍ عِنْدَهُ بِمِقْدار ﴾ وە هەمو شتێ لای خوا بە ئەندازەیەکی دیاری کـراوە، بەبێ هودەو بەبێ بنچینە دروستی نە کردون. بەڵکو بۆ هەمو شتێ سنورێکی تایبەتی هەیـە لـە ئەندازەی پارچەکانی و نیشانەکانی لـە بارەی وێنەو نەخشەو شـوێن و کـات و یاسـاو ڕەوشتیانەوە، هەمو شتێ لـە جێگەی شیاوی خۆیا داناوە. ئادەمیزاد هەر ئـەوەی لەسـەرە تەماشا بکاو چاودێری بکاو بەراوردی شتە بینراوەکان بکا بە گوێرەی ژیری خۆی، وایش ئەبێ بەهەڵەدا بچن و وایش ئەبێ بەڕاستی بیپێکن . بەڵام زانین و زانیـاری خـوای مـەزن پێویستی بە هیچ هۆیە نیە هەر لـە خۆی بـۆ خۆیـەتی و بـەس. بـە پێچەوانـەی ئـادەمیزاد پێویستی بە هۆیە هەیە. لەژێر ڕوناکی ئەو ئایەتەدا باسی ئەمانەی خوارەوە ئەکەین:

١- ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ژنی ئاوس ئەکەوێتە حەیزەوە بەلای زۆربەی زانایانەوە.

٢- ژنی ئاوس بۆ دانانی منالەکەی لەماوەی چوار ساڵ زیاتر نابیٚ و لەشەش مانگ دوو چرکە کەمتر نابیٚ و بەزۆری نۆ مانگە لای شافیعی. لای ئەبو حەنیفە لەنۆ مانگ کەمتر ئەبیٚ و لە دووساڵ زیاتر نابیٚ، لای مالیك لەپێنج ساڵ زیاتر نابیٚ.کەواتە ئەتوانریٚ بیٚژریٚ کەم و زۆری منالدان لەو ئایەتەدا بریتی بیٚ لە ماوەی دانانی منال لەمنالدانا.

﴿ عالِمُ الْغَيبِ وَالشَهادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتعالِ ﴾ خوا زانایە بەو شتانە لە بەر چاو نین و بەو شتانەی ئەنینرێن و هەستیان پیٚئەکریٚ، خوا خۆی و سیفاتەکانی گەورەو بەرزو بڵندن و دورن لەهەمو شتی تازە پەیدابو. ئەم گەردونە پڕە لە بونەوەران لەهەمو ڕەگەزو تاقمیٚ لە سەرەوە بن یا لە خوارەوە بن، لە میکرۆبێکەوە هەتا ئادەمیزادو فریشتەکان، لە کانگاکانەوە بۆلای ڕووەکو زینەوەران، لە ئاوو لە هەواو ئەو شتانەی لە ناویانن، هەتادیٚ. ئادەمیزاد بەشێکی کەم لەو بونەوەرانە ئەزانیٚ. بەلاّم زانیاریەکەیان ناگاتە ئەوەی بەشیٚ لەو شتە لەبەر چاو نین بیانزانیٚ و ئەوانەی لەبەر چاو نین شاراوەی زۆریان تێدایە، هەر خوایە ئاشکراو نهێنی لای یەکسانیٚ .

﴿ سَواءٌ مِنكُمْ مَّنْ أسوَّ الْقَوْلُ وَمَنْ جَهَرَبِهِ ﴾ یەکسانە لای خودا کەسیٚ لە ئێوە بەنهێنی گفتوگۆبکاو، کەسیٚ بەئاشکرا گفتوگۆبکا لەگەڵ جگەی خۆی ،خوا هەمویان ئەزانیٚ .

﴿ وَمَنْ هُوَّ مُسْتَخْفٍ بِالَّليْلِ وَساربٌ بِالنَّهار ﴾ وە یەکسانە لای زانیاری خوا کەسیٚ لەئێوە خۆی پەنهان بدا بەهۆی تاریکی شەوەوە و کەسێکیش دەرکەویٚ بە ڕۆژدا و بڕوا بەڕێگەوە بۆ پەیداکردنی خواردەمەنی و بۆ کاری تریش. خوا ئەزانیٚ بەنیازی دەرونیان و بە گفتوگۆو کرداریان.

﴿ لَهُ مُعَقِباتٌ مِنْ بَيْنِ يَدَيهِ وَمِنْ خَلفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أمرِ اللهِ ﴾ وە هەیە بۆ ئادەمیزاد بەگشتی چەندین فریشتەیە یەك لەدوای یەك دێن هەندێکیان بە شەواو هەندێکیان بە

ڕۆژدا لە پێشیانەوە و لە پشتیانەو لەهەمو لایەکیانەوە ئەیانپارێزن لە ئازارو گیرو گرفت و چاو دێریان ئەکەن لە هەمو کاتێکا بە فەرمانی خوا، هەروەها هەڵسان و جمو جۆڵیان و دانیشتنیان و گفتو گۆیان و کرداریان ئەژمێرن و ئەیان نوسن. هەندێ زانایان ئەڵێن: خوای مەزن( ١٠ ) فریشتە ڕەوانە ئەکا بە ڕۆژدا پاسەوانی ئادەمیزاد ئەکەن، لە ئێوارەدا ئەوان ئەڕۆن و (١٠) فریشتەی تر دێن پاسەوانیان ئەکەن لە شەودا، هەر بەو جۆرە ئیش ئەکەن لەگەڵ هەمو یەکێ لە ئادامیزاد. بەڵام شەیتانیش بە ڕۆژدا هەڵئەسێ بە لادانیان بە ڕۆژداو مناڵەکانیشی بە شەودا. کەواتە ئادەمیزاد کە بۆیان دەرکەوت هەمو لایەکیان بە فریشتە گیراوەو کردەوەیان ئەنوسرێ لە چاك و لە خراپ زۆر نزیکە شەرم بیان گرێ و خۆیان بپارێزن لە بێ فەرمانی خوا. هەندێ لە زانایان لایان وایە مەبەست لە ( معقبات ) هەستەکان وسروشتەکانی مرۆڤە بون و چۆنیەتی خۆیان بەوان ئەپارێزن .

﴿ إنَّ أللهَ لايُغَيِّرُ ما بِقَومٍ حَتیٰ يُغَيِّرُ ما بِأنْفُسِهِم ﴾ بە ڕاستی خوا ناگۆڕێ ئەو شتەی بەخشیویەتی بە تاقمێ لە تەندروستی و ئاسایش و ڕابواردنی خۆش و هەرزانی و سەرکەوتن و سزای خۆی نانێرێ بۆ سەریان هەتا ئەو تاقمە خۆیان ئەیگۆڕن شتێ خوا داویە بەوان بەهۆی بێ فەرمانی خوای مەزنەوە، واز لە زانیاری و نیازی پاك و ڕەوشتی بەرز ئەهێنن بە بڵاو کردنەوەی کاری خراپ و نا پەسەند، هەندێ لە زانایان مانای ئەو ڕستەیان بەم جۆرە کردوە: ( خوای مەزن ئادەمیزاد لە ئازارو بێ نرخیدا ئەهێڵێتەوە کە بەردەوام بن لەسەر بێ دەنگی و بەرانبەری کاری خراپ نەوەستن و خۆیان ڕزگار نەکەن لەو سەرشۆڕیە لە ناویدان و هەوڵ نەدەن بۆ لەناوبردنی ستەمکاران و خوێن مژان. کارگا ئامادە نەکەن و زانکۆو تاقیگا بنیات نەنێن و خۆیان لە نەزانین ڕزگار نەکەن، هەتا دێ.

﴿ وَإذا أرادَاللهُ بِقَومٍ سوءً افَلا مَردّ لَهُ ﴾ وە هەر کاتێ خوا ویستبێتی تاقمێ لە ئادەمیزاد لە ناو بباو سزایان بدا بە هۆی خراپەیانەوە، هەژاری و بێ پیتی زەوی و زاریان ئەڕێژێ بە سەریا، دوایی گەڕانەوە بۆسەر ئەو سزایە ڕزگار بونیان بۆ نابێ و کەس ناگاتە فریایان، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿وَمَا لَهُمْ مِنْ وَالٍ﴾ وە نابێ بۆ ئەوان کەسێ کاروباریان ببا بـە ڕێـوە و سـزا کـەیان بگێڕێتەوە، خوا داد پەروەرە لە هەر شتێکا بیکاو هەر خوای گـەورە بەڕێوەبـەری کـاری بونەوەرانە، لە دوایدا خوای مەزن هەوڵ ئەدا بە ئادەمیزادو توانای خۆی بۆیان دەرئەخاو ئەفەرموێ:

هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِۦ وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمْ يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴿١٣﴾ لَهُۥ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ ۖ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَىْءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ ۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿١٤﴾ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ ۩ ﴿١٥﴾

﴿ هُوَ الَّذِي يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً ﴾ خوا کەسێکی ئەو تۆیە بریسـکەو ڕوونـاکی نیشان ئەدا بە ئێوە لەیەك کاتا لەبەر ئـەوەی ئێـوە بترسـن لـە ئـازاری ئـەو ئـاگرە دێنـە خوارەوە لـە ئاسمـان و بتـان کـوژێ و لـەبـەر ئـەوەیش ئێـوە بەتـەمای چاکـەی بـن بـە هاتنەخوارەوەی باران و سود بگەیەنێ بە کشـت و کاڵـتـان و بـە زۆر بونـی ئـاو بۆتـان.

خوای مەزن ئەم گەردونەی دروست کردوەو چەندین دەستوری تایبەت و نیشانەی نهێنی و ئاشکرای بۆ داناوە، لەوانەیە بزیسکەو چەخماخەو هەورو هـەورە گرمـە زانـاو نـەزان. باوەڕدارو بێ ئاین. ئەیان بینن و جۆرێ سروشتیان نازانن مەگەر کەسێکی خاوەن زانستی تایبەتی بێ.

﴿ وَيُنشِيءُ السَّحابَ الثِّقالَ وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ وَالْمَلائِكَةُ مِنْ ضَيفته ﴾ وە خوا پەیدا ئەکا هەوری چڕوپڕو گران کە قورس بووە بە ئاو هەتا بیڕێژێ بەسەر زەویـدا بـاران . وە بیسەرانی دەنگی هەورە گرمە پاك و خاوێنی بۆ خـوا دەرئـەبڕن لـەگـەڵ سوپاسـی خـواو ئەڵێن:

( سُبْحانَ اللهُ وَالحَمدُ للهِ ) یانێ پاك و خاوێنی بۆ خوایەو سوپاس بـۆ خـوا کـە ئێمـەی ڕزگار کرد لـە کوشتن بەو ئاگرەی ئـەبینرێ لـە هـەورەوەو فریشـتەکانیش پـاکی خـواو سوپاسی خوا دەرئەبڕن لەبەر ترسی خواو سام و گەورەیی خوا. هەندێ لەزانایان ئـەڵێن: هەورە گرمە خۆی لەخۆیا بەڵگەیە لەسەر یەکێتی و تواناو پاکی خواو سوپاس کردنە بـۆ خوا لـەسەر ڕژاندنی بەزەیی و میهرەبانی خوا، بەو زمانە تایبەتیە خوا داویە بەهـەور پـاکی خواو سوپاسی خوا ئەکا. بێگومان هەمو شتێ بەڵگەن لـەسەر بەتوانای خـوا، وەك نوسـین بەڵگەیە لەسەر نوسەر، خانو بەڵگەیە لەسەر ئە ندازیار.

﴿ وَيُرْسِلُ الصَّواعِقَ فَيُصِبُ بِها مَنْ يَشاءُ ﴾ وەخـوا ئـەنێرێ لـەنێو هـەورە گرمـەدا ڕوداوێ بەکتو پڕی لە ئاگرو لــە سزای تـر لــە ئاسمانـەوە، دوایـی ئـەو ڕوداوە توشـی کەسێکی ئەکا ئارەزوی هەبێ ئازاری بدا بەوێنەی گـەلی سـاڵح، هـەروەها ئـاگرێ هاتـە خوارەوەو پیاوێکی عەرەبی ستەمکاری کوشت کە پێغەمبەر فروسـتادەیەکی نـارد بـۆلای داوای لێ بکا موسوڵمان بێ، ئەویش بە گاڵتەوە ووتی: پێغەمبەری خوا لـە زێرە یا لـەزیوە، هەورە گرمەیە دای بەسەریاو مێشکی پژاند. کورتە باسێ بۆمانای بریسکەو هەورە گرمەو ئاگری هەورە گرمە:

١- هەور لەهەندێ کاتا چڕ ئەبێ و ئاوەکەی پڕ ئەبێ لە کارەبا، دوو هەور ئەدەن لە یەکتری بەو بۆنەوە کارەبا فڕێ ئەدەن و گڕی زەنجیرەی کارەبایی لە گەڵیان پەیدا ئـەبێ، دەرئەکەوێ لەوانەوە ڕوناکیەکی زۆر کەپێی ئەوترێ بروسـکە﴿ ٱلبَرْق ﴾ لەگـەڵ ئـەو بروسکەدا دەنگێکی زۆر سەخت ئەبیسرێ پێی ئەوترێ: هەورە گرمە ﴿ الرَّعْد ﴾.

٢- وایش ئەبێ لەکاتی دەرچونی کارەبا لە نێوان هەواو زەویدا یـا لـە نێـوان هـەرو جێگە بەرزەکانی سەرزەوی ڕوداوێکی نا هەموار پـە یـدا ئـەبێ پێـی ئـەوترێ تریشـقە﴿ الْصاعقة ﴾ ئەبێتە هۆی ڕوخاندنی خانوو بەرەو کوشتنی گیانداران و وایـش ئـەبێ . لـە درەخت ئەدا و ئەیسوتێنێ یا لەبن دەری ئەهێنێ یا ئەیکا بە دوو کەرتـەوە، ئەیشـدا لـەو شتانە شیاوی ئاگر وەرگرتن و گڕیان لێ پەیدا ئەبێ وێنەی بەنزین و نەوت.

﴿ وَهُمْ يُجادِلُونَ فِي اللهِ وَهُوَ شَـدِيْدُالْمِحالِ ﴾ وەبـت پەرسـتان گفتوگـۆی دوژمنانـە ئەکەن لەبارەی تواناو گەورەیی خواو پێغەمبەرایەتی موحەمەدو زیندوبونەوە لەگـەڵ ئـەو هەمو بەڵگانە لەسەر توانای خواو، لەسەر ئەو هەمو کارە پەك خەرانەی بەڵگەن لەسـەر پێغەمبەرایەتی موحەمـەدو لەسـەر هاتنـە خـوارەوەی سـزا بۆسـەر کەسـانێ بڕوایـان بـە زیندوبونەوەو پرسیار نەبێ و، خوا سزای زۆر سەخت و بەهێزە بۆ دوژمنانی خۆی. هـۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستانە ئەمەیە: عامیری کوڕی توفەیل و ئەربـەدی کـوڕی ڕەبیعـە و برای لەبید بە نیازی کوشتنی پێغەمبـەر هاتنـە خزمـەتی، عامـیر دەسـتی کـرد بـە گفتـو گۆکردن لەگەڵ پێغەمبـەر ﴿ ﷺ﴾ ئـەر بـەدوەر گـەڕا بـۆلای پشـتەوەی پێغەمبـەر هـەتا شمشێری لێ بدا، پێغەمبەر هەستی پێ کردو فەرموی: ئەی خوایە لەم دوکەسـەم بپارێزە، خوا هەورە گرمەیەکی نارده خوارەوە و ئەربەدی کوشت و لویـەکی لـە عامـیری پـەیدا کردو دووایی لە خانوی ژنێکی سەلولیدا مرد.

﴿ لَهُ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ ﴾ هەر بۆ خوایە پاڕانـەوی ڕاستی، چونکـە هـەر خوایـە شـایانی پەرستنەو داوای پەرستنی بۆ بکرێ. کەواتە هەر کەسێ بەنیازی پاکەوە لە خوا بپاڕێتـەوە وولامی ئەدرێتەوەو پاداشتی ئەداتەوە.

﴿ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ لايَسْتَجِيبُونَ لَهُمْ بِشَيءٍ الاّ كباسط كَفَيهِ إلىا الْماءِ لِيَبْلُغَ فـاهُ وَما هُوَ بِبالِغِهِ ﴾ وێنەی کەسێکی ئەوتۆ پەرستن بۆ جگەی خوا بکەن و لـە جگـەی خـوا بپاڕێنەوە خوا وولآمی هیچ شتێکیان ناداتەوە بـەهیچ جـۆرێ مەگـەر وولآمیـان ئەداتـەوە بەوێنەی کەسێ هەردوو دەستی خۆی ڕابکێشێ بۆلای ئاو هەتا ئەو ئاوە بگاتە دەمی خۆی بەبێ ئەوەی دۆڵچەو گوریسی پێ بێ و بیەوێ ئاوەکە بگاتـە دەمـی و ئـەو ئـاوە ناگاتـە دەمیەوە، چونکە ئەو ئاوە بێ گیانە وەهەست بە تینوێتی ئەو کەسە ناکاو توانای نیە بگاتە دەمیەوە، هەروایش ئەو بتانە بێ گیانن و هەست بە پاڕانەوەی ئەو بت پەرستانە ناکـەن و سودێ بەوان نابەخشن.

﴿وَما دُعاءُ الْكافِرِينَ إلاّ فِي ضَلالٍ ﴾ وە پاڕانەوەی بێ باوەڕان لــە جگـە خـوا هیـچ سودێکی نیە مەگەر ئەوەیە لـە نێو لـەناو چون و زیان وپوچیدان. بە وێنەی کەسێکی تینـو وابزانێ دووکەڵ هەورەو ئاوی تێدایە دەستی ڕاپەکێشێ و دەمی ئەکاتەوە هەتا پـڕی بکـا لـەئاو ڕزگاری بکا لـە تینوێتی. وایش بزانێ شەپۆلی کەرما ئاوە.

﴿ وَلِلّهِ يَسْجُدُ مَنْ فِي الْسَّماواتِ وَالأَرْضِ طَوْعاً وَّكَرْهاً ﴾ وە ســوژدە ئەبـەن بـۆ خـوا کەسێ لـە ئاسمانەکان و لـە زەویدان بە ڕاستی، چونکە فریشتەکان و باوەڕداران بە خۆشی و بە ئارەزوی خۆیان لـەکاتی سەختی و لـە کاتی ئاسایشدا، بێ باوەڕانو دووڕووان سوژدە ئەبەن لـەکاتی تەنگانەو لـەکاتی پێویستیان پێی ببێ. بەتایبەتی دووڕووەکانی لـەترسـی بـێ باوەڕان.

﴿ وَظِلالُهُمْ بِالغَدوِّ وَالأصالِ ﴾ وە سوژدەیش ئەبەن بۆ خـوا سـێبەری ئەوانـەی لـە ئاسمان و زەویدان و جگەی ئەوانیش لـە ئێواران و بەیانیانا. سـێبەر بـە گوێـرەی سـوڕانی خۆر درێژ ئەبێ یا کورت ئەبێتەوە، سێبەر لـەو شتانەوە پەیدا ئەبێ خـۆر ئـەدا بەسـەریانا، بەیانیان بەرەو خۆر ئاوا سێبەری هەمو شتێ سوژدە ئەبەن بۆ خـوا ئێـواران دوای نیـوەڕۆ سوژدە ئەبەن بەرەو خۆر هەڵات. بە کورتی هەمو شتێ سوژدە ئەبەن بـۆ خـوا بەتایبـەت سێبەر لـەبەیانیان و ئێواراندا ڕون و ئاشکرایە. کاتێ خوا ڕونی کردەوە لـە ئایەتی پێشـودا

که هەر خوا شایانی پەرستنە، هەمو بونەوەران دروست کراوی خوان، لەم ئایەتەی دوایدا باسی ئەو شتانە ئەکا بەڵگەن لەسەر ئەو شتانەی ڕابوردن و ئەفەرموێ:

قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِى ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُ أَمْ جَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُوا۟ كَخَلْقِهِۦ فَتَشَٰبَهَ ٱلْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّٰرُ ﴿١٦﴾

﴿ قُلْ مَنْ رَّبُ السَماواتِ والأَرضِ ﴾ تۆ بڵێ بە بت پەرستان چ کەسێکەپەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و چ کەسێ دروستی کردون؟ ئایا بتەکانی ئێوە یا خوای تاك و تەنـها، ئەگەر لەبەر دوژمنایەتی وولامیان نەدایەتەوەو خۆیانیان بە گـەورە دانـا. ﴿ قُـلِ اللهِ ﴾ تـۆ بڵێ بە بت پەرستان: خوا پەروەردگاری بونەوەران و ئاسمانـەکان و زەویـە. بێگومـان بـۆ ئەوان جگە لەم وولامەی تۆ وڵامی تریان نیە، کەواتە سەرشۆڕ ئەبن و پەکیان ئەکەوێ.

﴿ قُلْ أفَتحذتم مِنْ دُوُنِهِ أولِياءَ ﴾ تۆ بڵێ بە بت پەرستان و هەمو ئادەمیزاد بۆ ئـەوەی پەکیان بخەی ئایا دوایی بۆ ئێوە وەرتان گرتووە لە جگەی خوا چەندین یاریدەر بۆ خۆتـان لە بتەکانتان و ئەیان پەرستن؟

﴿لایَملِکُونَ لأنفُسِهِمْ نَفْعاً ولاضَراً ﴾ ئەو بتانە خاوەنی سودو زیان نین بۆ خۆیان،ئیتر کەخاوەنی سودو زیان ئەبن بۆ خۆیان چاکتر ناتوانن سودو زیان بە جگەی خۆیـان بـدەن. کەواتـە ئێـوەو بتـەکانتان پێویـستیتان هەیـە بـەخوای هـەمو بونـەوەران، پێویـستمان بـە پێغەمبەران هەیە بە ڕێگەیە سود یا زیانی تێدابێ نیشانمان بدا.

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمى وَالْبَصِيرُ ﴾ تۆ بڵێ: ئایا وەك یەك وان كوێرو چاو ساغ ؟ وە باوەڕداران و بێ باوەڕان وێنەی یەكن، زۆر ئاشكرا وەك یەك نین، چونكە باوەڕدار بەدڵی وورياو ڕونەوە كاری خۆی ئەكاو خوا ئەپەرستێ خاوەنی سودەو زیانە بۆ بونەوەران، بێ باوەڕ كوێرانەكار ئەكاو پەرستن بۆ شتێ ئەكا خاوەنی سودو زیان نین بۆ خۆیان و جگەی خۆیان. كەواتە خوای خاوەن توانـاو لاواز وێنەی یەك نین، بۆئەوەی چاكتر ڕون ببێتەوە خوا ئەفەرموێ.

﴿ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُماتُ وَالْنُورُ ﴾ ئایا وەك یەك وان تاریكیەكان و ڕوناكی، بت پەرستی و یەكێتی خوا وەك یەك وان ؟ بێگومان وەك یەكنین.

﴿ أَمْ جَعَلُوا للهِ شُرَكاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشابَهَ الخَلْقُ عَلَيْهِمْ ﴾ ئایا ئەو بت پەرستانە دایان ناوە بۆ خوا چەندین هاو بەشێ دروستیان كردوە شتێ بە وێنەی دروست كردنی خوا، دوایی تێك بچێ لەسەر ئەوان و دروستكراوی خواو لەیەكیان جوێ نەكەنەوە، هەتا بڵێن : ئەو بتانەیش توانـای دروست كردنیان هەیەو شایستە پەرستن، چونكە كردەوەی ئەوانیش وەك كردەوەی خوایە. بێگومان ئەو بەردانە هیچ شتێكیان دروست نەكردوە بەوێنەی دروست كراوی خوا هەتا بڵێن: خوا دروست كەرەو بتەكانیش دروست كەرن.

﴿ قُلِ اللهُ خالِقُ كُلِّ شَيءٍ وَهُوَ الواحِدُ الْقَهّارُ ﴾ تۆ بڵێ: خوا دروست كەری هەموو شتێكەو بەتەنهاو بێ هاوبەشە لە دروست كردنداو ئەو بتانەیش دروست كراوی خوان، خوا دروست كراوی كەس نیەو، خوا تەنهایە لە دروست كردن و پەرستندا، دەسەڵاتی بەسەر هەمو شتێكتا هەیەو زبون و سەركزیان ئەكا بۆ ویستی خۆی.

ئەقڵی ئادەمیزاد كارێكی واناكا بۆ ئادەیزاد پێویستیان بە ئاینی خوا نەبێ، بۆ ئەو مەبەستە ئەمانەی خوارەوە ئەكەین كە زانیاری مرۆڤ ئەكرێ بەدوو بەشەوە:

١- زانیاری وا هەیە پێویستێ بە كۆشش و خۆ ماندوكردن نیە، زاناو نەخوێنەوار بەبێ بەڵگە هێنانەوە ئەیزانن وەك ئەم زانیاریانە: ڕوناكی لە جگەی تاریكیە، كوێری جگەی

چاو ساغیە، درێژی جگەی پانیە. دروست کراو جگەی دروست کەرە. ئەو جۆرە زانینانە خۆماندو کردنیان ناوێ، بەبێ کۆشش ئەزانرێن. ئەگەر گەسێ هەڵە بکا لە زانینیانا بیانوی لێ وەرناگیرێ:

٢- زانیاری واش هەیە پێویستە خۆی بۆ ماندو بکرێ و کۆشش بۆ ناسینی بکرێ، وەك ئەوەی بزانرێ ئایا ئاو لەیەك ڕەگەز دروست کراوە یا لە چەند ڕەگەزێ. ئەو نەخۆشیە ئەپەڕێ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر یا ناپەڕێ ، ئەو زانیاریە ئەگۆڕێ بە گوێرەی پلەی زیرەکی و نازیرەکی. هەڵە کردن لە زانینی ئەوانەدا ئەبێتە هۆی بیانو لێ وەرگرتن و چاو پۆشیان لێ ئەکرێ. کەواتە بۆمان ڕون ئەبێتەوە ئەو بتانە ئەکرێن بە هاوبەش بۆ خواوئەیان پەرستن کە هیچ جۆرە لەیەك چونێ بۆ ئەوان نیە لەگەڵ خوادا بەهیچ شێوەیە لەیەك ناچن هەتا بیانو لە گومانیانا وەربگیرێ، یا لەوانە بێ ئەو بتانە هاوبەشی خوا بن لە دروست کردنی بونەوارانا، چۆن ئەکرێن بەهاوبەش بۆ خوا کە سەگ و پشیلەو ڕێوی میز بکەن بەسەریانا ، پەرستنی ئەو بتانە زۆر زۆر خراپترە لەوەی ببێژرێ ڕوناکی و تاریکی وەك یەك وان.

لەوانەیە پرسیار بکرێ : گومان لەوەدا نیە کەناسین و زانینی ئادەمیزاد لەو دوبەشەی ڕابوردو بەدەرنیە بەو جۆرەی باسمان کرد، ئەو بتانە کەلە بەرد تاشراون بێگومان ناکرێن بە خوا. بەڵام ئەو بت پەرستانە هەیانە خاوەن ئەقڵ و زانیارین ئەبێ هۆی چ شتێ بێ ئەو بتانە ئەپەرستن ؟ لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا ئەبێژرێ : بێگومان تاقمێ لەو بت پەرستانە بتەکان ئەپەرستن بەنیازی سود پەیداکردن بۆ خۆیان. تاقمێ تریان لاسایی پێشوانیان بۆ جێ ماوە. ڕون و ئاشکرایە دەسەڵاتی ئەقڵ لاواز ئەبێ و بەرەو پاش ئەگەڕێتەوە لەبەردەم ڕەوشت و لاسایداو بەرەو پێش ناڕوا. بەتایبەتی کاتێ ماوەی زۆر بەسەریا تێ بپەڕێو ئەوە لەدوای ئەوە بۆیان پایە داربێ ئەو شتەی لەسەرین. زانیاری و ئەقڵی زۆر خاوەنەکەیان لەبیرو باوەڕی پوچ لاناداو باوەڕیان بەشتی پڕو پوچ هەیە. بۆ نمونە: ئەبینرێ زۆر مرۆڤی زاناو ژیر نرواویان بەزۆر شتی پڕو پوچ هەیە، ئەفسانەو جادو گەری باوە لەناو یانا، هەیانە ناڵی چارەوێی ئەکەن بەسەر دەرگای خانوەکانیانا بۆ پاراستنی لە چاو پیسی.

هەیانە لە چەند ڕۆژێکی تایبەنیدا ناچن بۆ کاروان. نامە گرتنەوەو نامە خوێندنەوە بەکار ئەهێنن. فنجان ئەگرنەوە. هەیانە هەمو بەیانیە شیاکەی گاو مانگا ئەدەن بەنێو چاوانیاناو بە خوایان ئەزانن. لەمەو بەر خوای مەزن چەند وێنەیەکی هێنایەوە لەسەر پوچی پەرستنی بتەکانە، هەندێ شتی بەراورد کرد لەگەڵ هەندێ شتی تردا، لەم ئایەتەی دوایشدا باسی هەندێ تر لە وێنەو بەراورد ترمان بۆ باس ئەکاو ئەفەرموێ :.

أَنزَلَ مِنَ السَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا فَٱحْتَمَلَ ٱلسَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا ۚ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِى ٱلنَّارِ ٱبْتِغَآءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَٰعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ وَٱلْبَٰطِلَ ۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَآءً ۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿١٧﴾ لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُۥ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٨﴾

﴿ أَنْزَلَ مِنَ السَّماءِ ماءً فسالت أَوْدِيَةٌ بِقَدرِها ﴾ خوا لە ئاسمانەوە ئاوێ ئەنێرێتە خوارەوە، دوایی ئەو ئاوە ئەڕوا بە شیوەکاندا بە ئەندازەیەکی ئەوتۆی ئەو شیوە خوا ئەزانێ سودی هەیەو زیانی‌نیە بۆ ئەو مەبەستەی ئاوی بەسەردا ئەڕوا. یا بە ئەندازەی ئەو شیوە لە تەنگی و فراوانیدا بەو ئەندازەیە خوا دیاری کردوە. هەر ئەندازیە لەو ئاوە شیوەکان نەی گرێ بلاّو ئەبێتەوە بەڕوی زەویدا.

﴿ فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَداً رَّابِياً ﴾ دوایی ئەو ئاوەی ئەڕوا هەڵئەکرێ ئــەو کەفـەی بـەرز بۆتەوەو بەسەریەوەو فڕەی ئەداو ئەبێ بە هەواو ئەچێ بە ئاسمانداو نابینرێ. خوای مـەزن لـەو وێنەیەدا بەراوردی کردوە بۆ ئێمە جیاوازی بـاوەڕو ڕاسـتی لـەگـەڵ بـێ بـاوەڕی و پوچیدا. یانێ ڕاستی و باوەڕ بون بە خوا وێنەی ئەو ئاوەن کە ئەبێتە هۆی زیندو بونـەوەی زەوی ووشك و مردو، هەندێکیشـی بـۆ سـەوز کـردن و ڕوواندنـی گییـاو دروخـت و دانەوێڵە، هەندێ تر لـەو ئاوە ئەچێتە ناو بۆشایەکانی زەوی و لـە کانیەکانەوە دەر ئەچێ، یا بەهۆی دۆڵچەوە لــە چاڵەکانـەوە دەر ئـەهێنرێ ، ئـەو ئـاوە ئەبێتـە هـۆی خۆشـی و گوزەرانیئادەمیزاد.

بێ باوەڕی و شتی پوچ وێنەی ئەو کەفـەن ئەکەوێتـە سـەر ئـەو ئـاوەو فـڕەی ئـەداو نامێنێ، یا لـەگەڵ باو هەوادا ئەڕواو سودی بۆ هیچ شتێ نابێ. هـەروەها قورئـانی پـیرۆزو ئاینی ئیسلام وەك ئەو ئـاوە پـاك و بـەردەوامن، سـود ئەگەیـەنن بەبونـەوەران و لـەدڵی باوەڕدارانا هەڵئەگیرێ. بەئەندازەی تەنگی و فراوانی مێشکی ئادەمیزاد، دوودڵی پەرت و بڵاوئەکاتەوەو نامێنێ لەدڵدا. خوای مەزن وێنەیە ترمان بۆباس ئـەکا لـەبارەی ڕاسـتی و باوەڕەوەو لەبارەی پوچی و بێ باوەڕی وەك ئەفەرموێ:

﴿ وَمِما يُوقِدُنَ عَلَيْهِ فِي النَّار أبْتغاء حلية أوْ مَتاعٍ زَبَدٌ مِثْلُهُ ﴾ وە لـەهەندێ شتا ئادەمیزاد فڕەبدەنە سەری سوتەمەنی لـەنێو ئاگردا بۆئەوەی باشتر گڕ بسێنێ کەفێ پەیدا ئەبێ وێنەی ئەو کەفەی ئەکەوێتە سەر ئاو لـە چڵك و چەپەڵی، ئەو کـارەیش ئەکـەن لـەبـەر ئـەوەی شخڵ و ئامێری جوانی لێ دروست بکەن یا کەل و پەلی ناوماڵ و چەك و ئـامێری کێڵانـی زەوی لێ دروست بکەن. ئەو شتانەیش وەك زێڕوزیوو مس و شتی تریش .

﴿ كذلِكَ يَضرِب اللهُ الحَقَ وَالباطِل ﴾ هەر بەو جۆرەی باسکرا خوا ڕونـی ئەکاتـەوەو نەخشە ئەکێشێ بۆ ڕاستی و بۆ شتی پوچ و بێ سوود. یانێ ئــەو ئـاوەو ئـەو گەوهەرانـە سودیان لێ وەرئەگیرێ بۆ ئادەمیزاد. ئەو کەفەیش ئەکەوێتە ســەریانەوەو هــەوا ئـەیبا بـێ سودە. وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ فَأَمّاالزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جفَاء وَأَمّا ما يَنفَعُ النّاسَ فَيُمْكثُ فِي الأَرْضِ ﴾ دوای ئەو کەفەی سەر ئاو سەری ئەو شتانەی تر ئەڕۆن بە پوچیو فڕێ دراوی و بێ سودی وە شتێ سود ئەبەخشێ بەئادەمیزاد لەو ئاوە پاکەو لەو شتانەی پاڵفتەکراون ئەمێنێتەوە لەزەویدا هەتا ئادەمیزاد سودی لێ وەربگرن و بیکەن بەهۆی خۆشی و گوزەرانی خۆیان. ﴿ كَذلِكَ بضرب الله الأمثال ﴾ هەر بەو جۆرانەی باسکران خوا وێنەکان لێ ئەداو ڕونیان ئەکاتەوە لەبەر ڕونکردنەوەی ڕاستی و جوێ کردنەوەی لەشتە پوچەکان. ئەو ئایەتانە نەخشە بۆ ئاینی ئیسلام ئەکێشن، ڕونی ئەکەنەوە بۆ ئادەمیزاد کە ئاینی ئیسلام و موسوڵمانان خاوەنی سودن بۆهەمو بونەوەران. بەتایبەتی بۆ ئادەمیزاد، ئەو سودانە بەردەوامن و بێ کۆتایین، وێنەی ئەو ئاوەی زەوی زیندو ئەکاتەوەدوای ووشکبونی، وەك ئەو زێڕو زیوو مس و ئاسن و ئەو شتانەی ترن لەکانگاکان دەرئەهێنرێن و پاڵفتەو پوختە ئەکرێن و خاوەنەکانیان سودیان لێ وەرئەگرن. ئەوەتا کارخانە قاپ و قاپچاخ و شتی تریان لێ دروست ئەکرێ بۆ پێش کەوتنیشارستانیەت و نزیك خستنەوەی ڕێگەو بان و دروستکردنی کەشتی گەورەو فڕۆکەو ئامێری کێڵان. ڕام کردنی بۆشاییو چونی سەر ئەستێرەکان و زۆر کردنی ئامێری کێڵانی زەوی و زۆر کردنی هۆی ژیان و درەو پێ کردنی بەرهەمی زەوی. هەتا دێ بەو بۆنەوە خۆشیو ئاسایش و هەرزانی بڵاو ئەبێتەوە. بەکورتی هەر کەسێ سود بەخشبێو کاربکا بۆ بوژانەوەی ژیانی دانیشتوان و سەر بەستیو ئاسایش و خۆش گوزەرانی ئادەمیزادو فێرکردنیان بە ڕەوشتی چاك، ئەو کەسە گەیشتوە بە داواو مەبەستی ئیسلام، ناوی لەمێژودا هەتا هەتایە ناسڕێتەوە وێنەی ئەو ئاوو گەوهەرە پوختەکراوانە، هەر کەسێ خەریکی کاری نارەواو خراپ بێو ناخۆشیو ئازارو جەنگ و ئاژاوە پەیدا بکاو ئاسایش و هەرزانی لەناو ببا فڕی بە ئیسلامەتی و موسوڵمانەوە نیە با بەناو پێی بیێژێ موسوڵمان و بە نیازی پیسەوە بەرنامەی ئیسلام بڵاو بکاتەوە لە ڕادیۆو تەلەفزیۆنا، خۆی بگۆڕێو پڕوپاگەندە بڵاو بکاتەوە بەمەبەستی خراپی خۆی، ئەو کەسە وێنەی ئەو کەفەیەو نامێنێ.

﴿ لِلَّذِينَ أَسْتَجابُو لِرَبِهِمُ الْحُسْنیا ﴾ بەڕاستی بۆ کەسانێکی ئەوتۆ وولامی فەرمانی پەروەردگاری خۆیانیان داوەتەوەو کاریان کردوە بۆ سودی ئادەمیزادو خۆشیو

گوزەرانیان بۆیان هەیە پاداشتی زۆر شیرین ، وەك بەهەشت و ڕەزامەندی خوا. بەڕاستی دانیشتوانی ڕوی زەوی سود لەو کەسانە وەرئەگرن بە وێنەی ئەو ئاوەو ئەو گەوهەرە پاڵفتە کراوانە.

﴿ وَالَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِبُوا لَهُ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً وَّ مِثْلَهُ مَعَهُ لأفْتَدوا بِهِ ﴾ وەکەسانێکی ئەو تۆ وولاّمی پەروەردگاری‌خۆیان نەدابێتەوە، بەڕاستی ئەگەر شتێ هەیانە لە زەویدا بەتەواوی‌و لەگەڵ ئەو شتەیشدابێ وێنەی ئەوەی هەیەتی‌و بخرێتە سەری‌و بیکەن پەدەردۆگێڕی خۆیان و ببەخشن هەتا ڕزگاریان بێ لەپاشە ڕۆژا سودێ بەوان نابوخشێ. وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ أولَئِكَ لَهُمْ سُوءُ الْحِسابِ ﴾ بۆ ئەو کەسانە هەیە وولاّمی فەرمودەی پەروەردگاری خۆیانیان نەداوەتەوە پرسیاری خراپ و سەخت و پرسیاری زۆریان لێ ئەکرێ. فەرمودەی پێغەمبەرە: هەر کەسێ گفتو گۆی زۆرو پرسیاری لێبکرێ سزای ئەدرێ :

﴿ وَمَأْواهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهادُ ﴾ وە جێگەی گەڕانەوەی ئەو کەسانە دۆزەخەو دۆزەخیش خراپ جێگەو ئارامگای خراپە. کەواتە ئەو کەسانە وێنەی ئەو کەفەن ئەکەوێتە سەر ئاوو سودیان لێ‌وەرناگیرێ. ناویان بەخراپە ئەبرێ لەمێژودا.

بۆزانین: (لورا فیشیا فاغلیری) لەنامەی خۆیا (دفاع عن الأسلام) مامۆستا مونیر بەعلەبەکی گۆڕاویەبۆلای عەرەبی ئەڵێ لەو نامەیەدا ( پێغەمبەری عەرەبی بانگی کردوە بۆلای بڕوابون بە یەکێتی‌خوا، بگرەو بەردەی دەرکەوتوی دەست پێ کردبو لەگەڵ بیرو بۆچونی هەندێ کۆنە پەرستی داوای ئەوەی ئەکرد مرۆڤ ڕابکێشێ بۆلای بت پەرستی. موحەمەد بانگی ئادەمیزادی ئەکرد بۆلای خوێندنی نامەی زیندەگانی و بیرکردنەوە لە گەردون و یاسای گەردون، لەکاتێکا بڕوای وابو هەمو خاوەن ئەقڵێ پێویستە کەلە کۆتاییدا باوەڕ بهێنن بە خوایەکی تەنها .

پاش ئەوەی خوای مەزن باسی ڕون کردنەوەی ئەو وێنانەی کرد، ڕونیشی ئەکاتەوە بۆمان جیاوازی نێوان باوەڕداران و بێ باوەڕان و ئەفەرموێ :

أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ

أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ
﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ
وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ
وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ
بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا
وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ
عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ
﴿٢٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ
أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعْنَةُ
وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٢٥﴾

﴿ أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّما أُنزِلَ إِلَيكَ مِنْ رَّبِكَ الحَقُ كَمَنْ هُوَ أَعْمى ﴾ ئایا دوای کەسێ بزانێ کەبەڕاستی شتێ نێراوەتە خوارەوە بۆ لای تۆ لەلایەن پەروەردگاری خۆت ڕاست و بێگومانە وەك کەسێ وایە کوێر بێو هیچ شتێ نەبینێ هەتا بیزانێ. بێگومان ئەو دوو کەسە وەك یەك نین.

﴿ إِنَّما يَتَذَكَر أُولُوا الأَلْبابِ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ پەندو ئامۆژگاری وەرئەگرن خاوەنی ئەقڵ بن و کاربکەن بەگوێرەی فەرمانی ئەقڵی خۆیان و تەماشای بکەن و بیخەنە

مێشکیانەوە. خوای مەزن باسی شێوازی خاوەن ئەقڵــەکان ئەفـەرموێ بـەڕونی بەمانـەی خوارەوە :

١-﴿ الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللهِ وَلا يَنْقِضُونَ المِيثَاقَ ﴾ وەکەسـانێکی ئـەوتۆ جـێ بـەجێ ئەکەن ئەو پەیمانەی داویانە بە خوا کەبریتیە لە هەڵسان بـەو شتانەی خـوا فـەرمانی پـێ داون و تێك نادەن شتێ وەریان گرتوە لـە باوەڕ هێنان بەخواو جگەی باوەڕ لــەو پەیمانانـە لە نێوان خۆیان و دانیشتوانا بەستویانە. بێگومان هەر شتێ بەڵگەی لەسەر دانرابێ پەیمانی خوان و پێویستە مـرۆڤ بیانکـا. بـەڵام سـەر لا تێکچـوان ڕاسـتیەکان ئـەگۆڕن لـەسـەر ئارەزوی خۆیان ، لەدوایدا ئەو ئارەزوانەی خۆیان ئەدەنە پاڵ خواو بەڵگەیان نیە .

٢- ﴿ وَالَّذِيْنَ يَصِلُـونَ مـاأَمَرَاللهُ بِـهِ أَنْ يُوصَـلَ ﴾ وە کەسـانێکی ئـەوتۆن شـتێ خـوا فـەرمانی پـێ داوە بگەیەنرێتـە جێگـەیخۆی ئـەو کەسـانە ئەیگەیەنـنە جێگـەی خــۆی لەخزمایەتیو خۆشەویسـتیو یـاریدانی بـاوەڕداران و جـێ بـەجێ کردنـی مافـەکانیان و لابردنی زیان لـەسەریان و ڕاکێشانی چاکە بۆ خزم و بێگانە دوربن یا نزیك .

٣-﴿ وَيَخشَوْنَّ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوءَ الحِسَابْ ﴾ وە ئەترسـن لـەسـزای پـەروەردگاری خۆیان و بیم ئەکەن لـە خراپــەو سـەختی پرسـیار. بەتایبـەتی پرسـیار کـردن لــە خۆیـان لەڕۆژی دووایدا .

٤- ﴿ وَالَّذِنَ صَبَرُوا ابتِغاءَ وَجْهِ رَبِـهِمْ ﴾ وە کەسـانێکی ئـەو تـۆن ئارامیـان گرتـوەو خۆڕاگربون لـەسەر ناخۆشی و ئازاری خۆیان و نـەمانی دارایـیـان، دژی هـەواو هەوەسـی ناهەمواری خۆیان وەستاون و کۆششی بێ پایانیـان کـردوە لـەجـەنگداو ئارامیـان گرتـوە لـەسەر برین و ئازاریجەنگ لـەسەر داواکاری پەروەردگاری خۆیان و خۆیانیان پاراسـتوە لـەناو بردن و جگەی ناوبردنی ئادەمیزاد بۆ خۆیان و بلێین ئازاو دلێرن

٥- ﴿ وَاَقامُوا الصَلاةَ ﴾ وەنوێژەکانیان پیادە ئەکەن و بەجێیان ئــەهێنن، هــەر بۆخـوا نەك بۆ دوروىو پەیداکردنی سامان و بەدەست هێنانی پلــەو پایـە، نـرخ بـۆ هیـچ شـتێ دانانێن جگەی خواو سەر بۆ هیچ شتێ شۆڕناکەن جگەی یاسای خوا بێ .

٦- ﴿ وأنْفَقُوا مِما رَزَقناهُمْ سرّا وَعَلانِيَةً ﴾ وەبەخشیویانەو داویانە بەهەژاران هـەندێ لـەو شتەی ئێمەداومانە بەوان بەنهێنی و بە ئاشکرا ئەیدەین بە هەژاران ، هەر خواوخۆیـان پێی ئەزانن، بە ئاشکرایی ئەیدەن هەتا دانیشتوانی تر چاویان لێ بکەن .

٧- ﴿ وَيَدْرَ اُونَ بِالْحَسَنَةِ الْسَّـيِئَةَ ﴾ وە پـاڵ ئـەنێن بـە خراپـەوە بـەهۆی چاکـەوە. بەرانبەر بە توڕەیی ئارامی بەکار ئەهێنن. بەرانبەر بە ئازار خۆیان ڕائەگرن. چاو پۆشی لـەو کەسانە ئەکەن خراپەیان لـەگەڵ ئەکەن .

﴿ اُلئِكَ لَهُمْ عُتبى الدار ﴾ ئەو خاوەن ئەقڵانە کە ئـەو حـەوت شـتانەیان کـردوە بـۆ ئەوان هەیە پاداشتی دووایی ئەم جیهانەو ئەوەی پێویسـتە بـەوان بـدرێ لـە جیاتی ئـەو ڕەوشتانە کە بریتییە :

﴿ جَناتُ عُدنٍ يَّدْخُلُونَها وَمَنْ صَـلَحَ مِـنَ آبائِـهِمْ وَأزْواجِـهُمْ وَذُرّ يّاتِـهِمْ ﴾ بەهەشـتی بەرین و بەردەوام ئەچنە نێو ئەو بەهەشتانە خۆیان و کەسێ چاکەی کردوە لە باوك و ژن و منداڵەکانیان، چ شتێ بێ خۆشتر بێ لـەوەی ئەوان کۆببنەوە لـە بەهەشت لـەگەڵ باوك و ژن و منداڵیان ؟ ئەوەیش بەهۆی کارە چاکەکانەوە بو لـە جیهاندا کردبویان .

﴿ والمَلائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيهِم مِّنْ كُلِّ بابٍ سَلامٌ عَلَيْكُمْ بِما صَبَرتُمْ فَنِعمَ عُقْبـى الْـدار ﴾ وە فریشتەکان ئەچنە لایان لـە دەرگای هـەموو کۆشـکەکانیانەوەو دیاریـان بـۆ ئەبـەن و ئەڵێن: ئاشتیو سڵاوتان لابێو پایەتان بەرزو دەوام داربـێو ئـەم بەهەشـتانەتان دراوەتـێ بەهۆی ئەو شتەوە ئێوەئارام و خۆگربـون لـەیـەری و توشـتان ئـەبو لـەهـەژاری و ئـازارو ناخۆشی، دوایی چـاك و بەنرخـە پاشـە ڕۆژی شـتێ ئێـوە لـەناویدان لـە پاداشـتی ئـەو ئازارانەتانا لـەجیهاندا توشتان ئەبون، پاش ئەوەی خوای مەزن باسی پیاو چاکان و ڕەوشتی پیاو چاکانی کرد، باسی پیاو خراپان و کـردەوەی خراپیـان ئـەکا لـەگـەڵ تۆڵـە سـەندن لـەوان و ئەفەرموێ:

﴿ وَالَّذِينَ يَنْقُضُونَ عَهْدَاللهِ مِنْ بَعْدِ مِثياقه ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ تێك ئەدەن پەیمانی خوا لـەدوای بەستن و توند کردنی ئەو پەیمانەو دژی فەرمانی خـوا ئەوەسـتن و کـاری خـراپ ئەکەن .

﴿ وَيَقْطَعُونَ مَاأَمَرَ اللهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ ﴾ وە ئەپچڕێنن شتێ خوا فەرمانی پێ داوە بگەیەننە جێگەی خۆی، وەك ئەوەی سەرنەدەن لە خزمەكانیان و باوەڕ بە پێغەمبەرو فەرمودەكانی خوا نەكەن .

﴿ وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ ﴾ وە خراپە ئەكەن لەسەر زەویدا بەبێ باوەڕی و گوناه كردن و ئاژاوەنانەوە، دەست درێژیبۆسەر بێ تاوانان، پڕو پاگەندەی بلاو ئەكەنەوە بۆ ترساندنی دانیشتوان، دزیوداوێن پیسیو تالانكردن بلاو ئەكەنەوە .

﴿ اُلئِكَ لَهُمُ اللَّعْنَةُ ولهم سوء ﴾ ئەو خاوەن ڕەوشتە خراپانە بۆ ئەوان هەیە دوربون لەبەزەییو میهرەبانی خواو بۆیشیان هەیە خراپەی ئەنجامی كاری خراپیان لە جیهانداو ئاگری دۆزەخ لەپاشەڕۆژدا .

ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ وَفَرِحُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا مَتَـٰعٌ ﴿٢٦﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ طُوبَىٰ لَهُمْ وَحُسْنُ مَـَٔابٍ ﴿٢٩﴾

﴿ اللهُ يَبْسُطُ الرِّزقَ لِمَنْ يَشاءُ وَيَقْدِرُ ﴾ خوا فراوان ئەكا دەرامەت و ڕۆزی بۆ هەر كەسێ ئارەزوی هەبێو كەمی ئەكاتەوە بۆ هەر كەسێ ئارەزوی هەبێ. بەلام زۆر جاران بەبێ كۆشش دەرامە ت زۆر نابێ. بۆ زانین: ئادەمیزاد خوا زۆر شتی داوەتێ، هەمندێكیان

بەردەوامن لـەگەڵیاناو جویـێ نابێتـەوە، وەك درێـژیو کورتـەباڵایی، هـەندێکیان خۆیـان پەیدای ئەکەن و لـەوان جوێ ئەبێتەوە، وەك ئەوەی بازرگانە یا جوتیارە یـا موچـەخۆرە . هەتا دێ .

ئەبێ بیشزانین: ساماندراری چەندین هۆی هەیـە ، کـاتی وا ئـەبێ لـەڕێگـەی میراتـەوە سامانی بۆ ئەسازێ، ئەو سامانە هەرچەندە لـەژێر توانای ئەودا نەبوە، بـەڵام بـۆی ڕەوایـە خواردنیو بەخشینی، وایش ئەبێ بە ماندوبون و ئارەقی ناو چاوان و ئازاری دەست پـەیدا ئەبێ، وەك کشتوکاڵ کردن و پیشەسازاندن و بازرگانی ئەم بەشەیان ڕەواو دروستە بۆیان و گەورەترین و پاکترین سامانە. هەندێ سامان پەیدا ئەکرێ بە پەنـهاندان و شـاردنەوەی پێویستی خواردەمەنی دانیشتوان لـە دوواییدا بە نرخی زۆر ئەیفرۆشن، پـەیدا ئـەکرێ بـە چەوساندنەوەی هەژاران، بـە وێنـە پـارە بەسـودان و تـالان و دزی و بازرگـانی بەشـتی قەدەغەکراو، یابەهۆی جاسوسیو هەواڵ بـردن بـۆ بێگانـەو بـێ بـاوەڕان ئـەم بەشـەیان قەدەغەن لای خوای مەزن .

هەروەها بۆ هەژارانیش چەندین هۆی هەیە: وەك تەمەڵیو خاو خلیچکی لـەکاردا یابە دەرامەتی نیشتمان ئەکەوێتـە ژێـر دەسـەڵاتی کـار بەدەسـتانی ستەمکار، بەشـی ڕەوای دانیشتوان زەوت ئەکەن و ئەی خۆن و ئەیدەن بە چەك بۆ پاراستنی پلەو پایـەی خۆیـان، بۆ هەواو هەوەسی خۆیان پرژو بڵاوی ئەکەنەوە، بـەو شـێوەیە باسمـان کـرد بۆمـان ڕون ئەبێتەوە هەژاری و سامان داری دەست کردی دانیشـتوانی زەویـن نـەك دەسـت کـردی هێزی ئاسمانی لـە زۆربەی کاتا. بەڵام کاتی وا ئەبێ کارەساتی ناهەمواری کوتوپڕی پـەیدا ئەبێ وەك بومەلـەرزەو لافاوو کولە دەرامەتی مرۆڤ دائەبەزێو ئەبێتە هۆی هـەژاری، یـا بێ ئەوەی مرۆڤ خۆی ماندو بکات پیت و دەرامەتی داراییان زۆر ئەبێ و ئەبێتـە هـۆی زۆری سامان، بەبێ جیاوازی لـە نێوان پیاوچاکان و پیاو خراپان .

﴿ وَفَرِحُوا بِالْحَيَاةِ الدُّنيا ﴾ وە شادمانن دانیشـتوان بـە ژیـان و مانـەوەی جیـهان بـەو داراییانە بـەوان دراوەو لـەبیریان چۆتـەوە کـە جیـهان کۆتـایی پـێ دێ و ڕۆژی دوایـی بەردەوامەو بێ کۆتایە .

﴿ وَما الحَياةُ الدُّنْيا فِي الأُخِرَةِ إلآمتاعُ ﴾ وە ژیانی ئەم جیهانــە نرخێکـی نیـە بەرانبـەر خۆشی پاشەڕۆژ مەگەر ڕابواردنێکی کەمەو بێ دەوامە .

بۆزانین: تاقمێ لـە ئادەمیزادشادمانن بەدارایی و شادمانن هــەر لـەبـەر ئـەوەی خراپـەو کارە خراپەکانیان دا، ئەپۆشێ، ڕێزو گـەورەیی بـە جگـەی دارایـی بـەدی ناکـەن، هــەر بەدارایی بەراوردی ڕێزی مرۆڤ ئەکەن، بەجۆرێ زانایان و گەورە پیاوانی ئەم ســەردەمە نرخی خۆیان بەو شتە دائەنێن کەلـەباخەڵیاندایە، نەك بەو شتەی لـە مێشکیاندایە .

﴿ وَيَقُولُ الّذِينَ كَفَرُوا لَوْلا أنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِنَّ رَّبِهِ ﴾ وە کەسانێکی ئـەو تـۆ باوەڕیـان نەهێناوە ئەڵێن: بۆنەنێراوەتە خـوارەوە بۆسـەر موحەمـەد نیشـانەیەکی ڕونـی پـەك خـەر لـەلایەن پەروەردگاری خۆیەوە، وێنەی داری دەستی موسا، قورئانی پیرۆز بەلای ئەوانەوە پەك خەر نیە. هەرشتێ ئەوان داوای بکەن پەســەند نـەبێ بـێ نرخـە لایـان، وەك ئـەوەی ئەوان داوای ڕوخاندنی ئاسمانیان ئەکرد بەسەریانا، یا مردوەکانیان بۆ زیندو بکاتەوە.

﴿ قُل إنَّ اَللهَ يَضِلُ مَنْ يَشاءُ ﴾ تۆ بڵێ: بەڕاستی خـوا ڕێگـەی ڕاسـت وون ئـەکا لـە کەسێ ئارەزوی هەبێ، وەك ئەو کەسانەی داوای نیشانەی تر ئەکـەن لـەپاش ئـەو هـەمو کارە پەك خەرانە چاویان پێیان کەوتوە. بە هەزاران کاری پەك خەر بێت بۆلایـان کاریـان تێ ناکاو گومڕا تر ئەبن .

﴿ وَيُهدِي مَنْ أنابَ ﴾ وەخوا ڕێگەی ڕاسـت نیشاندەرە بۆ کەســێ بگەڕێتـەوە بـەدڵ بۆلای خواو پەشیمان بێتەوە لـەبێ باوەڕیو بت پەرستی، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ الَّذِيْنَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُبُهُمْ بِذِكْرِاللهِ ﴾ ئەوانە کەسانێکی ئـەوتۆن باوەڕیـان هێنـاوەو دڵیان بەیادی خواو بەقورئان و بە موژدەدانەوە ئارام ئەگرێ و ئاواتیان هــەر میـهرەبانی و بەزەیی خوایە. بە دارایی و سامان دڵ خۆش نین. ئەبێ بزانــین یـادی خـوا مەبەسـت نـاو بردنی خوا نیە بەتەنها، ئەوەی جێی متمانە بێ ئەو یادەی خوایە باوەڕ زۆرترو چەسپاو تر بکا بەهۆی موژدەدان و هەرەشەکردنی خوای مەزنەوە .

﴿ ألا بِذِكّرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُبُ ﴾ ئیسەوە بزانن و ئاگاداربن هەر بــەیادی قورئـان دڵـی باوەڕداران ئارام ئەگرێ، چونکە خوا نەخۆشی دڵیان لائەبا .

﴿ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحاتِ طُوبى لَهُمْ وَ حُسْنُ مَآبٍ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوەو کردوە چاکەکانیان کردوەو فەرمانی خوایان بەجێ هێناوە بۆ ئەوانە گوزەرانی پاك و ڕێز لێ گرتن و بۆئەوانە جێگەی گەڕانەوەی خۆش وەك بەهەشت و پلەو پایەی بەرز. کاتێ خوای مەزن باسی ئەو میهرەبانیەی خۆی کرد بەسەر ئەو کەسانەی پێشودا بە پاداشت و جێگەی خۆش، باسی چاکەی خۆیشی ئەکا بەسەر گەلانی پێشوداو پێغەمبەری بۆ ناردن و ئەفەرموێ :

كَذَٰلِكَ أَرْسَلْنَاكَ فِي أُمَّةٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهَا أُمَمٌ لِّتَتْلُوَا عَلَيْهِمُ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَٰنِ ۚ قُلْ هُوَ رَبِّي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ﴿٣٠﴾ وَلَوْ أَنَّ قُرْآنًا سُيِّرَتْ بِهِ الْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ الْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ الْمَوْتَىٰ ۗ بَل لِّلَّهِ الْأَمْرُ جَمِيعًا ۗ أَفَلَمْ يَيْأَسِ الَّذِينَ آمَنُوا أَن لَّوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَهَدَى النَّاسَ جَمِيعًا ۗ وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُوا قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ حَتَّىٰ يَأْتِيَ وَعْدُ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ ﴿٣١﴾

﴿ كَذَلِكَ أَرْسَلْناكَ فِي أُمَّةٍ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِها أُمَمٌ ﴾ هەربەو جۆرەی پێغەمبەران ڕەوانە کراون لە پێش تۆوە ئێمە تۆمان ڕەوانە کردوە لەنێو نەتەوەیەکدا بەڕاستی تێپەڕی کردوە لەپێش ئەم نەتەوەیە، تۆ نێراوی بۆلایان چەندین نەتەوەی تر کە پێغەمبەران نێرراوە

بۆلایان . کەواتە ڕەوانەکردنی تۆ وەك پێغەمبەرێ کارێکی تازە نیە کەهەر تـۆ کرابـی بـە پێغومبەر :

﴿ لِّتَتْلُوَ عَلَيْهِمُ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ ﴾ لەبەرئەوەی تۆ بخوێنیتەوە بەسەریانا ئەو قورئانەی ئەوتۆ ئێمە بە سروش باردومانە بۆلای تۆو پەك خەرو بۆ ڕدەری ئەو گەلەیە تۆ نێراوی بۆلایان .

﴿ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَانِ ﴾ وەئەو نەتەوەی تۆیە باوەڕ بە خوایـەکی خـاوەن بەخشـندە نابەرن کەچاکەی ئەو خوایە نایەنە ژمارە. ئەگەر بەتۆیان ووت ڕەحمان چ کەسێکە :

﴿ قُلْ هُوَ رَبِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ ﴾ تۆبڵێ : ڕەحمان پەروەردگاری منە هیچ کەسێ نیە شایانی پەرستنبێ مەگەر هەر پەروەردگاری من ، نەك جگەی ئەو .

﴿ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ﴾ هەر لەسەر پەروەردگاری خۆم پشت بەستم و ئومێدم هەر بەوە هەمو کارێکم بۆ جێ بەجێ بکـاو بـۆلای ئـەوە گەڕانـەوەی مـن، وسـزا هـەر بەدەستی ئەوە. کەواتە پاداشتی من ئەداتەوە لەسەر ئارام گرتنم و ماندوبوونم لەگەڵ ئێوە، سزای سەختیش ئەچێژێنێ بە ئێوە لەسەر بێ فەرمانی خوا .

قوڕەیشیەکان بەتایبەتی ئەبو جەهل و عەبدوڵای کوڕی ئومەیـە ووتیـان بـە پێغەمبـەر: ئەگەر پێت خۆشە ئێمە دوای تۆ بکەوین ئەم کارانەی خوارەوەمان بۆبکە، ئـەو کارانـەش ئەمانەن لەدواییدا باسیان ئەکرێ .

﴿ وَلَوْ أَنَّ قُرْآناً سُيِّرَتْ بِهِ الْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ الأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِـهِ الْمَوْتـى ﴾ وە ئەگـەر بەڕاستی قورئانێکی وا هەبێ لـەنێو ئـەم بونەوەرانـەدا بـەهۆی ئـەو قورئانـەوە کێوەکـان لەجێگەی خۆیان نەمێنن، یا زەوی ببپچڕێ و ڕوبـارێ ئـاوی لێ بێتـە دەرو بـەهۆی ئـەو قورئانەوەو بەکاری بهێنین بۆڕواندنی درخت و سەوزەمەنی پێ پەیدا بکەین یا بەهۆی ئـەو قورئانەوە گفتوکۆی پێ بکرێ لەگەڵ مردوان و زیندو ببنە، ئەگەر ئەو قورئانە بەو جۆرە بێ ئەم قورئانە بەڕاستی هاتوە بۆ موحەمەد .

ئەوەی ئەو بت پەرستانە داوایان ئەکرد ئەوەیە بیرو بۆچونیان و هەر ئەو زمانە ئـەزانن و گوێ لە جگەی ئەو بیرو بۆچونە خراپەی خۆیـان نـاگرن. بەوێنـەی ستەمکارانی ئـەم

سەردەمە ئاواتیان هەر دۆلاروجونەی هو دینـارە، بـەڵام دادوەری‌و ڕاسـتی و ژێـری لای ئەوان پڕوپوچێکە منالآن یاری پـێ ئەکـەن و نـەزانان بـڕوای پـێ ئـەهێنن. دوای ئەوانـە جێگەی سەرسوڕمانە ستەمکارانی ئێستا باوەڕیان بەپێغەمبەر نەهێناوە، لەگـەڵ ئەوەیشـدا داواکاریەکەی دادپەروەری و چاکەکردنە چ گوناهـێ گـەورەترە لای ستەمکاران لـەو داواکاریە ستەم کردن و خراپــە بنـەبڕبکا ؟ بـەڵام خوێـن ڕشـتنی دانیشـتوان و فـەرمان مۆرکردن بۆکوشتنی دادخوازان لای ئەوان زۆر چاکە .

هەر بەو جۆرە بیر ئەکەنەوە کەسانێکی ئەوتۆ ژیانیان لـەسەر تـالآن و سـتەم وەسـتاوە لەهەمو کاتێکا، لەجێگەیە لـەسەردەمی پێشودا ئەبو جەهل و هاوڕێکانی بەو جۆرە بیریان ئەکردەوە بەرانبەر بە پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ لەم سەردەمەی ئێستایشدا ڕژێمـە داگیرکـەرەکان هەر وەك ئەوان بیر ئەکەنەوە. بەئاشکرا دوژمنی گەلان و دادپەروەرین و دەست درێژیـان ئەکەنە سەر. ئەوەتە ڕژێمی عیراق نزیکەی نیو ملیـۆن کـوردی زینـدە بـەچاڵ و ئـەنفال کردوە، چوار هەزار گوندی بەمزگەوت و قورئانەوە سـوتاند. ڕژێمـی ڕووسـیا کۆمـاری چیچانی بەشارو گوندو پیرو منالٚ و ژنەوە لەناو برد، بەبرچاوی نەتەوەیـەك گرتوەکـان و ئەنجومەنی ئاسایش جگە لـەوانە داوای پاراستنی مافی مرۆڤ ئەکەن هیچ لایەنێ نـاڕەزایش دەرنابڕن. ئەو ستەمکارانە وائەزانن کەسێ نیە تۆڵـەیان لێ بسێنێ .

﴿ بَلْ لِلهِ أمْرَ جَمِيعاً ﴾ بەڵکو هەر بۆ خوایە توانای بێ وێنەو ئەگـەر ئـارەزوی هـەبێ ئەو شتانەی بت پەرستان داوای ئەکەن ئەیان هێنێ و پەیدا ئەبن. ویست و ئارەزوی خـوا بەو شتانەی ئەوان داوای ئەکەن نەبەستراوە چونکە ئەزانێ بەوەی هاتنیشیان دڵیـان نـەرم ناکا، هەمو شتێ لای خوا ئاسانە .

﴿ أفَلَمْ بِيأسِ ألذِينَ آمَنُوا أنَّ لَو شاءَاللّهُ لَهَدَى النّاسَ جَمِيعـاً ﴾ ئایـا دوایـی کەسـانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە نەیانزانیوەو بۆیـان ڕون نەبۆتـەوە ئەگـەر خـوا ئـارەزوی بکردایـە ئادامیزادی بەگشتی ڕاغویی ئەکردو ڕێگەی ڕاستی پیشان ئەدان، هەرچۆنێ بێ هاوڕێکانی پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ ئاواتە خوازبون کە بت پەرستان باوەڕ بـەخواو پێغەمبـەر بـهێنن خـوای مەزن فەرموی: هەتاکەی بەتەمای باوەڕهێنانی بت پەرستانن، ئایـا نـازانن بـەهیچ جـۆرێ

باوەڕناهێنن باوەکو مردوان گفتوکۆیان لەگەڵ بکەن و کێوەکانیش لـە جێگـەی خۆیـان نەمێنن. ئەو بت پەرستانە خوای مەزن ڕێگەی ڕاستی پێ نیشان داون. بـەڵام خۆیـان بـێ باوەڕیان بۆخۆیان هەڵبژاردوەو، شایستەی سزادانن .

﴿ وَلایَزالُ الَّذِیْنَ کَفَرُوا تُصِیبُهُم بِمـا صَنَعُـوا قارِعَـة ﴾ وەکەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیـان نەهێناوە بەخواو بەپێغەمبەران لاناچن لەم جیهانەدا هەتا توشـیان ئـەبێ ڕوداوێکـی گـران بەهۆی شتێ کردویانە لە بێ بـاوەڕیو کـاری زۆر خـراپ. خـوای مـەزن واز لـەو بـێ باوەڕانە نابەرێ لەم جیهانەدا بەبێ تۆڵە. بەڵکو ڕوداوی خراپ و ناهەموار توشیان ئـەبێ کات لەدوای کات .

﴿ أو تَحِلُ قَرِیباً مِّنْ دارِهِمْ حَتی یَاتِي وَعْدُ اللهِ ﴾ یابەڵای ناهـەموار ئـەڕژێ بەسـەریانا لەنزیك جێگەکانی خۆیانەوەو لەم لاولای مەککەوە، بەوبۆنەوە دڵیان پڕ ئـەبێ لـەترس، هەر بەو جۆرە ئەبن هەتا خوا خۆی بەڵێنی خۆی جێ بەجێ ئەکاو یارمەتی پێغەمبـەر ئـەدا بەسەرکەوتن، یا ئەیان مرێنێ لەجیهاندا، یاڕۆژی دوایی پـەیدا ئـەبێ و سـزایان ئـەدرێ . بەجۆرێ تر مانای ڕستەی ﴿ أوْ تَحلُ قَرِیباً مِنْ دارِهِم ﴾ کراوە: یانێ موحەمەد تۆ دانیشـە لەنزیك جێگەی ئەو بت پەرستانەوە هەتا توشی سزا ئەبن و تـۆ هەڵمـەتیان بـۆ ئەبـەی و سەر شۆڕیان ئەکەی .

﴿ إنَ اللهَ لایُخْلِفُ المِیعادَ ﴾ بەڕاستی خوا پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناکات. چۆن ئـەبێ وانەبێو بەڵێنی خوا ڕاسترین بەڵێنە .

هەمو باوەڕدارێ بڕوای تەواوی هەیە بەوەی بەڵێنی خـوا هـەر ئـەبێ ببـێو یـاریدەی سەربازی خۆی ئەدا.

کاتێ بێ باوەڕان داوایان لەپێغەمبەر کرد هەندێ نیشانەیان پـێ نیشـان بـدا بەڵگـەبن لەسەر ڕاستی خـۆی بەگاڵتـەوە ئـەیان ووت ئـەو داواکاریانـە. پێغەمبـەر ﴿ ﷺ ﴾ ئـەو داواخوازیانەی ئەوانی لا گرانبو، لەدوای ئەوانە دڵخۆشی ئەداتەوەو ئەفەرموێ :

وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ

مِّن قَبۡلِكَ فَأَمۡلَيۡتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٣٢﴾ أَفَمَنۡ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۗ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلۡ سَمُّوهُمۡۚ أَمۡ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَم بِظَٰهِرٖ مِّنَ ٱلۡقَوۡلِۗ بَلۡ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ مَكۡرُهُمۡ وَصُدُّواْ عَنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ﴿٣٣﴾ لَّهُمۡ عَذَابٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَقُّۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ ﴿٣٤﴾

﴿ ولَقَداُستُهزِئَ بِرُسُلٍ مِنْ قَبلِكَ ﴾ وە بەڕاستی گاڵتە کـراوە لـەپێش تۆو بەچـەندین پێغەمبەران وێنەی ئەو گاڵتەیە کراوە بەتۆ. ئەو جۆرە کردەوە ناهەموارانە ڕەوشتی هـەمو بێ باوەڕانە لـە هەمو جێگەو لـەهەمو کاتێکا. کەواتە تۆ ئارام بگـرەو کـۆڵ مـەدە لـەسـەر بانگەوازی خۆت و ڕاگەیاندنی فەرمانی خوا .

﴿ فأملَيتُ لِلَذِيْنَ كَفَرُوا ثُمَ أخَذتُهمْ ﴾ دوایی مـن مۆڵـەتی کەسـانێکی ئـەوتۆم داوە باوەڕیان نەهێناوەو سزایانم دووا خستوە، لـەپاشا من ئەوانم گرتوەو سـزایانم دا لـەجیـهاندا بەگرانیو بەدیل کردن، لـە پاشەڕۆژیشا بە ئاگری دۆزەخ سزایان ئەدەم .

﴿ فَكَيفَ كانَ عِقابِ ﴾ دوایی ئـەبێ چۆن بـێ سـزای مـن.خـوای مـەزن هـەرکاتێ پێغەمبەرێکی ناردبێ دووشتی پێ بەخشیوە: زانیاری بەڵگەکانی گـەردون و بـە بەڵگـەی ئەقڵی لـەسەربونی خوا و یەکێتی خوا .بەکاری پەك خەر لـەسەر دەستی و بەڵگە لـەسـەر پێغەمبەرایەتی خۆی. لـەجاری یەکەمدا یەکێتی خوا بسەلمێنێ بـەئادەمیزاد، جـاری دوهـەم بەوانی بسەلمێنێ بەوەی نێراوە لـەلایەن پەروەردگاری خۆیەوە. بەڵام ئەوان باوەڕیان بەهیچ

شتێ نیە جگەی سودی تایبەتی خۆیان گاڵتە بە پێغەمبەران و بەڵگەکانیان و بـەکارە یـەك خەرەکانیان ئەکەن، خوا مۆڵەتیان ئـەدا بۆماوەیـەك بۆئـەوەی بگەڕێنـەوە بـۆلای ئـەقڵی خۆیان و بیانویان نەمێنێ بەهۆی ئەو مۆڵەتەوە .

﴿ أفَمَنْ هُوَ قائِمٌ عَلى كَلِّ نَفْسٍ بِما كَسَبَتْ ﴾ یا دوایـی کەسـێ ڕاوەسـتابێ بەسـەر هەمو کەسێکەوە و ئاگاداری شتێ بێ کردبێتیان لـە چاك و لـە خراپ لـە جیهاندا، وێنەی ئەو کەسەیە بەو جۆرە نەبێ و ئاگاداری هیچ شتێ نەبێ .

بێگومان ئەو کەسەی ئاگاداری هەمو شتێ بـێ و تۆماریـان بکـا و پاداشـتی چاکـەیان بداتەوە تۆڵـە لـە خراپەکاری بسێنێ هەر خوایە، چۆن ئەو بەردانە ئەکەن بەهاوبەشی ئـەو کەسە ؟

﴿ وَجَعَلُوا اللهِ شُرَكاءَ ﴾ وەزۆر جێگەی سەرسوڕمانە ئەو بت پەرستانە دایان ناوە بۆ خودایە ئەو ئاگاداریانەی هەیە چەندین هاوبەش لـە پەرستندا .

﴿ قُل سَمُّوهُم ﴾ تۆبلێ: ئەی بت پەرستان: ئێوە باسی تەنها شـتێ بکـەن بۆبتـەکانتان شایشتەبێ بەو تەنها شتەوە شایانی پەرستن بن. ئێوە ناوی ئەو بتانە ببەن بۆ خوا و هـەواڵی بدەنێ ناوەکانیان چ شتێکن ؟

﴿ أم تُنَبِئُونَهُ بِما لايَعْلَمُ فِي الأَرضِ ﴾ یا ئەو بتپەرستانە هـەواڵێ بـدەن بـەخوا بەشـتێ خوا نەیزانێ لـەزەویداو ئەوان بیزانن کەئەو شتەیش ئەوەبێ خوا هاو بەشی هەیە. بێگومان خوا هەموشتێ ئەزانێ و ئەزانێ هاوبەشی نیە، ئیتر چۆن ئەوان هاوبەشی بۆخوا دائەنێن ؟

﴿ أمْ بِظاهِرٍ مِنَ القَولِ ﴾ یا ئەو بت پەرستانە بتەکانیان ناو ئەبەن بەهاوبەشـی بۆخـواو خۆیانیان هەڵپەسانوە بەشتێکی ئاشکرا لـەگفتوگۆیە ڕۆتو بێ ناوەڕۆك، گومانیان بـە گفتـو گۆیە هەیە بیستویانە بێ ئەوەی ڕاستیەکی هەبێ. کەواتە ئەوبتانـە پەرسـتنیان پـوچ و بـێ مانایە .

﴿ بَلْ زُيِنَ الَّذِيْنَ كَفَـرُوا مكْرُهُـمْ وَصُـدُّوا عَـنِ السَـبِيلِ ﴾ بـەڵکو ڕازێنراوەتـەوە بـۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە پیلانیان بۆ ئیسلامەو گومانیان وایە هاو بەشی خوان لـە دروستکردندا .

خۆیان بۆ خۆیان ئەو فێڵەیان ڕازاندوەتەوە، بەوبۆنەوە لادریاون لەڕێگەی ڕاست و لە باوەڕبەخواو بە یەکێتی خوا .

﴿ وَمَنْ يُضْلِلِ اللهُ فَما لَهُ مِنْ هادٍ ﴾ وە هەر کەسێ خوا لە ڕێگەی ڕاست لای‌بدا و گومڕایی تێدا دروست بکا دوای ئەوەی ئەقڵی پێ داون بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست، دوایی بۆئەو کەسانە نیە هیچ کەسێ ڕاغویی بکا بۆلای ڕاستی و بۆلای باوەڕهێنان و بۆلای وازهێنان لەبت پەرستی .

﴿ لَهُمْ عَذابٌ فِي الحَياةِ الّدُنيا وَلَعَذابُ الآخِرَةِ أشَقُ ﴾ بۆ بێ باوەڕان هەیە لەژیانی جیهاندا سزای گەورە لەدیل کردن و کوشتن و گرانی وە بەڕاستی سزای ڕۆژی دوایی سەخت و گرانترە بۆئەو بێ باوەڕانە .

﴿ وَما لَهُمْ مِنَّ اللهِ مِنْ واقٍ ﴾ وەنیە بۆئەو بێ باوەڕانە هیچ کەسێ بیانپارێزێ لەسزای سەختی خوا .

کاتێ خوای مەزن باسی سزادانی بێ باوەڕانی کرد، باسی لەخوا ترسەکان و پاداشت دانەوەیان ئەکاو ئەفەرموێ:

مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا وَّعُقْبَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ قُلْ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ إِلَيْهِ أَدْعُوا وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ ﴿٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ مَا

جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴿٣٨﴾

﴿ مِثْلُ الْجَنَةِ الّتِي وُعِدَ الْمتقون ﴾ وێنەی بەهەشتێکی ئەوتۆ بەڵێنی پێدراوە بدرێ بەو کەسانە لەخوا ئەترسن و خۆیان ئەپارێزن لەبێ فەرمانی خوا: وێنەی بەهەشتێکە .

﴿ تَجری مِنْ تَحْتِها الأنهارُ اُكُلُها دائِمٌ وَّظِلُها ﴾ ئەڕوا بەژێر درەختەکانی و ئەم لاولای کۆشکەکانیان چەندین ڕوبار لە ئاوی شیرین و خواردەمەنی و میوە و سێبەری بەردەوامە وێنەی جیهان نیە جارێ خواردەمەنی نەبێ و جارێ تر هەتاو بێ و جارێ تر سێبەر بێ .

﴿ تِلْكَ عُقْبىَ الّذِيْنَ اتقَوا وَ عَقبى الْكافِرِينَ النّارُ ﴾ ئەو بەهەشتە بەو جۆرەی باسی کرا ئەنجام و پاشەڕۆژ جێگەی کەسانێکی ئەوتۆیە لەخوا ترساون و بێ فەرمانی خوایان نەکردوە و پاشاڕۆژو جێگەی بێ باوەڕان ئاگری دۆزەخە لەدوارۆژدا .

﴿ وَالّذِيْنَ اَتَيْنَاهُمُ الْكِتابَ يَفْرَحُونَ بِما اُنْزِلَ إِلَيْكَ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ ئێمە بەخشیومانەبەوان نامەیە وەك تەورات و ئینجیل و دوواجاریش قورئان شادمان و خۆش حاڵن بەشتێ نێردراوە بۆلای تۆ کەقورئانی پیرۆزە، ئەوکەسانەیش بریتین لە عەبدوڵای کوڕی سەلام و هاوڕێکانی و گاورەکانی نەجران و یەمەن و حەبەشەو جگەی ئەوانیش لەو کەسانە باوەڕیان هێناوە .

﴿ وَمِنَ الأحزْابِ مَنْ يَنْكُرُ بَعْضَهُ ﴾ وە هەندێکن لە تاقمەکان کەسانێ باوەڕیان بەهەندێ لەو نامەیە نیە هاتوە بۆلای تۆ لەقورەیشیەکان و گاورو جوەکان، چونکە ناگونجێ لەگەڵ ئارەزوی ئەوان. بەئاشکرا دوژمنایەتی تۆئەکەن، وێنەی کەعبی کوڕی ئەشرەف و هاوڕێکانی .

﴿ قُلْ إنماأمِرْتُ أنْ أعْبُدَ اللهَ وَلا أُشْرِكُ بِهِ ﴾ تۆبڵێ بەبێ باوەڕان: بەڕاستی من فەرمانم پێ دراوە کەخوا بپەرستم و هاوبەشی بۆ دانەنێم وێنەی عیساو عوزەیرو بتەکان .

﴿ إلَيهِ أدْعُو وَإلَيْهِ مَآبِ ﴾ هەر بۆلای پەرستنی خوایەکی تەنـها مـن بـانگی ئـادەمیزاد ئەکەم نەك بۆلای جگەی ئەو، وەهەر بۆلای خوایـە گەڕانـەوەی مـن لـەڕۆژی دواییـدا، ئەوکاتە هیچ کەسێ خاوەنی سودو زیان گەیاندن نیە .

﴿ وكَذلِكَ أنْزَلناهُ حُكماً عَرَبِياً ﴾ وەهەر بەو جۆرە نامەمان نارد بۆلای ئەو پێغەمبەرانە بەزمانی خۆیان ئێمە ناردومانە بۆلای تۆ قورئانێ فەرمان بدا بەهەمو ڕوداوێ بەو جـۆرەی شایستەی ئەو ڕوداوانە بـێ مانـای لێ ئەدرێتـەوە بـەزمانی عـەرەبی هـەتا گەلەکـەی تـۆ لەمەبەستی ئەو قورئانە بگەن .

لـەئایەتی ( ٢ ) ی سورەتی یوسف ڕوونمـان کردوەتـەوە هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو قورئانە بەزمانی عەرەبی هەرچەندە پێغەمبەر نێردراوە بۆلای هەموو ئادەمیزاد بە عەرەب و جگەی عەرەب .

﴿ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أهواءَ هُمْ بَعْدَ ما جاءَ كَ مِنَ العِلْـمِ مـالَكَ مِـنَ اللهِ مِـنْ وَلِـيَ وَّلاواقٍ ﴾ وەئەگەر تۆ دوای ئارەزۆو هەوەسی ئەو بت پەرستانەو خاوەن نامە بێ باوەڕەکان بکەوی، دوایی شتێ هاتوە بۆلای تۆ لە زانین و ئاگاداری لە یاسای خوانابێ بۆ تۆ لەلایەن خـواوە هیچ یاریدەو پارێزەرێ سزای خوا لەتۆ بگێڕتەوە. بێگومان خوای مەزن ئـەزانێ پێغەمبـەر دوای ئارەزوی ئەوان ناکەوێ. بـەڵام مەبەسـت ئەوەیـە بـەردەوامبێ لەسـەر داواکـاری خۆی و لەتانەو تەوانجی کەس نەترسێ .

کاتێ بت پەرستان هیچ شتێکیان بەدەستەوە نەما و بۆڕیان خـوارد ئـەیان ووت: چـۆن ئەبێ موحەمەد پێغەمبەر بێ، لەگەڵ ئەوەیشدا خـاوەنی ژن و خـێزان بـێ، خـوای مـەزن ووڵامیان ئەداتەوەو ئەفەرموێ :

﴿ وَلَقَدْ أرْسَلْنا مِنْ قَبْلِكَ رُسُلاً وَّجَعَلْنا لَهَمْ أزواجاً وَّذُرِيَةً ﴾ وە ئێمە ڕەوانەمان کردوە لە پێش تۆو چەندین پێغەمبەران و ئێمەداومانە بە ئەوان چەندین مناڵ و کەسـیش لۆمـەی

نەکردوە، ژن و خێزان و منالْ ڕێگەیان نەگرتوە لەوان کەفەرمانی خوا ڕابگەیەنن بە دانیشتوان، موحەمەدیش وێنەی ئەوان ژن و منالْ ڕێگەی پێ ناگرێ لە گەیاندنی فەرمانی خوا، ئەو بیرو بۆچونەی ئەوان بەبێ جیاوازی داواکردن و وازهێنانە لەخۆشی جیهان .

﴿ ماكانَ لِرَسُلٍ أنْ يَأتِيَ بِآيَةٍ إلاّ بِإذْنِ اللهِ ﴾ لە توانای هیچ پێغەمبەرێکا نیە کە بهێنێ ئەو شتانەی گەلەگانیان داوای ئەکەن لەکارە پەك خەرەکان مەگەر بەدەستوری خوا. خوای مەزن داویەتی بە پێغەمبەران بەڵگەو کاری پەك خەری ئاشکرا بەڵگەبن لەسەر پێغەمبەرێتیان. بەڵام وولامی بێ باوەڕان نادرێتەوە بەگوێرەی داواکاری ئەوان .

﴿ لِكُلِ أجَلٍ كِتابٌ ﴾ بۆ هەمو شت و کاتێ فەرمانێ نوسراوە بۆکاتی هاتنیو پەیدابونی، ئیتر کاری پەك خەر بێ بۆ پێغەمبەران یا سزادان و جگەی سزا، ئەو کاتەیش پێش کەوتن و پاش کەوتنی بۆنیەو کاتەکە بێجگە لەخوا کەس نایزانێ.

بت پەرستان و جوەکان ئەیان ووت: بۆچی موحەمەد ئەمڕۆ فەرمان ئەدا بە هاوڕێکانی بۆ کردنی شتیو لەدواییدا فەرمان ئەدا بەکردنی دژی ئەو فەرمانە، گفتو گۆ ئەکا لەکاتێکا، دووای لێی پەشیمان ئەبێتەوە، ئەو قورئانە ئەگەر خوا دایناب گۆڕانی بەسەردا نایە، خوای مەزن وولامیان ئەداتەوە، ئەفەرموێ: بۆهەمو کاتێ فەرمانێ هەیە شیاوی ئەو کاتەبێ، ئەوەیش بەگوێرەی فەرمانی خۆیەتی. هەر شتێ سودی ئادەمیزادی تێدا بێ فەرمان ئەدا بەو شتە، بۆیە ئەفەرموێ :

يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ الْكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾ وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ ﴿٤٠﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِى الْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا وَاللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٤١﴾ وَقَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلِلَّهِ الْمَكْرُ جَمِيعًا يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ وَسَيَعْلَمُ الْكُفَّٰرُ لِمَنْ عُقْبَى الدَّارِ ﴿٤٢﴾

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَسْتَ مُرْسَلًا ۚ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾

﴿ يَمْحُوَ اللّهُ مايَشاءَ وَ يُثْبِتُ ﴾ خوا لائەباو ئەگۆڕێ شتێ لەفەرمانێ ئـارەزوی هـەبێ لەگۆڕانی و ئەیهێڵێتەوە شتێ ئـارەزوی هـەبێ بـەگوێرەی داواکردنـی زانیـاری خـۆی و نایگۆڕێ و بەردەوام ئەبێ. لـە ئایـەتی ( ١٠٦ ) سـورەتی ئەلبەقـەرەدا بـەدرێژی باسـی گۆڕان و مانەوەی فەرمودەکانی خوامان کردوە .

﴿ وَعِنْدَهُ اُمُ الْكِتابِ ﴾ وە لـەخزمەت خوادایـە سـەرچاوە و ئەسـڵی هـەمو نامـەکان کەبریتیە لە لوح المحفوز، چونکە هیچ شتێ نیە مەگەر لـەوا نوسراوەو چـۆن فـەرمانی پـێ ئەدرێ و بە چ جۆرێکە ؟

لـەتەفسیری تەبەرسیدا هاتوە ئەفەرموێ: ( المحو و الأثبات ) بۆیان هەیە هەشت مانا، لە هـەمویان نزیکـتر ئەمەیـە: کەمەبەسـت لـەمـەحو گۆڕانـی دەسـتورە بەوێنـەی دەسـتورە کۆنەکان، یا گۆڕانی هــەندێکیان وەك گۆڕانـی ڕوکـردن بـۆلای کەعبـە لـە دەسـتوری ئیسلامدا. مەبەست لە ( اثبات ) مانەوەی فەرمانەکانە هەتا ڕۆژی دوایی .

﴿ فَإِماّ نرينك بَعْضَ الَّذِى نَعِدُهُم أوْ نَتَوَفَيْنَكَ ﴾ وە ئەگــەر ئێمـە نیشـانی تـۆی بدەیـن هەندێ لـەسزای ئەوتۆ ئێمە بەڵێنمان پێ داوە بیرێژین بەسەر بێ باوەڕاندا یا پێمە تۆ بمرێنین بەر لـەهاتنی ئەو سزایەو تۆ نەی بینی ئێمە هەر سزایان ئەدەین. هەر چۆنێ بێ .

﴿ فَإنَماْ عَلَيْكَ الْبَلاغُ وَعَلَيْنا الْحِسابُ ﴾ بەڕاسـتی لـەسـەر تۆیـە ڕاگـەیاندنی پـەیام و فەرمانی ئێمە بە ئادەمیزادو لـەسەر ئێمەیشە پرسیارکردن لــەکردەوەی ئـەوان و پاداشـتی کارە چاکەکان ئەدەینەوەو تۆڵەی خراپەکانیان ئەسێنین .

﴿ أوَ لَمْ يَرَواْ أناّ نَأْتِى ألأَرْضَ نَنْقُصُها مِنْ أطْرافِها ﴾ ئایا ئەو بـێ باوەڕانـە داوایـان لــە موحەمەد ئەکرد، بهێنێ بۆیان چەندین نیشــانە، نـەیان بینـی کەبەڕاسـتی ئێمـە فـەرمانمان

ئاراستەی زەوی بێ باوەڕانمان کرد بەنیازی داگیرکردنی، ئێمە کەم ئەکەینەوە زەوی‌و جێگەکانیان لەم لاو لەولایەوە ئەیکەن بەزەوی باوەڕداران ئیتر بێ باوەڕان بۆ تەمێ خوار نابن و ئامۆژگاری وەربگرن .

بۆزانین: زەوی خڕەو ئەم لاولای بۆنیە وەك شتی پان. بەلاّم زۆر گەورەیە بە مەلایین ڕەگەزی جۆراو جۆر ئەگرێ لە بونەوەران و لەگۆڕانی بەردەوامدان .

کاتی وائەبێ ئادەمیزاد ئەبینێ‌و ئەبیسێ پارچەیە لەزەوی ئاوەدانە بە دانیشتوان و هۆی جۆراو جۆری شارستانی. پارچەیە تری زەوی دەشتی چۆڵەو ئاوەدانیەکەی کاول بوە، دانیشتوانی زەویش بەو جۆرە چەندین پێشکەوتن بەدەست ئەهێنن لەلایەکەوە لەلای ترەوە شارستانیەت نامێنێ. پاشایە دێت و یەکێ تر نامێنێ. هەتادێ. خۆشی‌و ناخۆشی لەم زەویەدا بەردەم نابێ.کەواتە فەرمودەی خوا ( ننقصها من اطرافها ) ئاماژە بۆ ئەوانە ئەکا، هەتا مرۆڤی ژیر بەو گۆڕان کاریانە تەمێ خوار ببێ .

﴿ وَاللّٰهُ يَعْلَمُ لا مُعقب لِحِكمِهُ وَهُوَ سَرِيْعُ الْحِسابِ ﴾ وە خوا فەرمان ئەدا بە بنەبڕکردنی تاوان باران و بەیاریدانی پیاو چاکان هیچ شتێ فەرمانی خوا ناگێڕێتەوە و، خوا پرسیاری زۆر تیژو سەختەو لە ڕۆژی دواییدا سزای بێ باوەڕان، دوای کوشتن و دەربەدەری کردنیان لە جیهاندا .

﴿ وَقَدْ مَكَرَ الَّذِيْنَ مِنْ قَبْلِهِمْ ﴾ وەبەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ لەپێش ئەم بێ باوەڕانەوە بوون پیلانیان ئەگێڕابۆئازاردانی پێغەمبەرەکانیان. وێنەی نەمرود لەگەڵ ئیبراهیم .فبرعەون لەگەڵ موسا. جولەکەکان لەگەڵ عیسا. بت پەرستانی ئێستاش پیلان بۆکوشتنی تۆ ئەسازێنن .

﴿ فَللهِ المَكرُ جَمِعاً ﴾ دوایی هەر بۆخوایە پوچ کردنەوەی فێڵ و پیلانی بێ باوەڕان بەگشتی، ئەو شتەی خوا نەیکا توشی تۆ نابێ .

﴿ يَعْلَمَ ما تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ وَّ سَيَعْلَمُ الكَفّارُ لِمَنْ عُقبى الدارِ ﴾ خوا ئەزانێ بەشتێ هەمو کەسێ ئەیکا لە چاکە و لە خراپە، پاداشتیان ئەداتەوە بەگوێرەی کردەوەی خۆیان.

لەمەو دوا بێ باوەڕان ئەزانن بـۆ چ کەسێکە پاداشتی چـاك و بـۆ چ کەسێکە سـزای سەخت .

﴿ وَيَقُوْلُ الَّذِيْنَ كَفَرُوا لَسْتَ مُرسِلاً ﴾ وە کەسانێکی ئەو تۆ باوەڕیان نەهێناوە ئـەڵێن: تۆ لەلایەن خواوە نەنێرراوی کەئادەمیزاد بانگ بکەی بۆلای پەرستنی خواو تۆ بـەدرۆزن ئەزانین .

﴿ قُلْ كَفى بِاللهِ شَهِيداً بَيْنِي وَ بَيْنَكُم وَ مَنْ عِنْدَهُ عِلْمُ الكِتابِ ﴾ تۆ بڵـێ بـەوان: خـوا بەسە بۆ شایەتی دان و ئاگاداری لەنێوان مـن و ئێـوەدا لەسـەر ڕاسـتی مـن و بەڵگـەی زۆریش هەیە لەسەر ڕەوانەکردنی من و، بەسە بۆمن و بۆ نێراوی من شایەتیدانی کەسـێ لای ئەو کەسە هەیەزانین و شارەزایی بەنامەی خوا .

بۆ زانین: زانایان بیریان جیاوازە بۆ دیـاری کردنـی ئـەو کەسـەی زانینـی ئـەو نامەیـە لەلایەتی:

هەندێکیان ئەڵێن: ئەو کەسە خوای گەورەیەو نامەکەیش بریتیە لە لەو حەل مەحفوز، هەندێ تریان ئەڵێن: ئەو کەسە زانایـانی گـاورو جولەکـەکانن و نامەکـەیش بریتیـە لـە تەورات و ئینجیل، هەندێ تریان لایان وایە بریتیە لە عەبدوڵای کوڕی سەلام .

ئەو ئایەتە ئاماژە ئەکا بۆلای ئەوە دڵی بەشتێ شادمانبێ و ویژدانی شایەتی بدا ئەو شتە ڕاستە. دوایی خواو فریشتەکانی خواو دادپەروەرانی بەندەکانی خوا شایەتی بۆئەدەن ئـەو کەسە لەسەر ڕاستە .

ئەبێ بزانین ئادەمیزاد کاتێ خاوەنی دڵـی زینـدو و ویژدانـی پـاکن بـڕوای بـە نرخـی ئادەمیزاد هەبێ لە دادپەروەری وڕاستی و دەست پاکی و ئـەو شـتانەی سـودی چاکیـان بۆهەمو کەسێکە مرۆڤ کەباوەڕی بە نرخی مرۆڤایەتی هەبوو دڵی ئەو کەسە شادمانە.

## ﴿ سورەتی ئیبراهیم ﴾

لەمەکە هاتوەتە خوارەوە. هەندێ لەزانایان ئەڵێن: جگەلەئایەتی (٢٨ - ٢٩ ) لەمەدینە هاتونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی ( ٥٢) ئایەتن .



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِۗ وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًاۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤﴾

## ﴿ بسم الله الرحمن الرحیم ﴾

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

﴿ الر ﴾ وێنەی ئەوپیتانە مانایان لەسورەتی ئەلبەقەرەدا ڕوون کراونەتەوە. پێشەوای بەرز ئەبومەنسور موحەمەدی کوڕی مەحمودی ئەلماتریدی ئەفەرموێ: ئەوپیتانە بۆ تاقی کردنەوەیە لەسەرباوەرهێنانی باوەڕداران. لەسەر بەدرۆخستنەوەی بێباوەڕان. بەوپیتانە تاقی ئەکرێنەوە ئەگەر بەبێ دوودڵی باوەڕیان پێ کرد ئەوا باوەڕدارن، ئەگینا بێباوەڕن، خوای مەزن بەندەکانی خۆی تاقی دەکاتەوە بەهەرشتێ ئارەزووی هەبێ. کۆمەڵێ لەزانایان لەسەرئەوەن کەئەوپیتانە ناوی قورئانن. یانێ ئەفەرموێ ئەو قورئانە:

﴿ كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ﴾ نامەیە کە ئێمە ناردوومانەتە خوارەوە بۆلای تۆ بەهۆی جبرەئیلەوە لەبەرئەوەی ئەونامەیە و بەهۆی داواکردنی تۆو ئادەمیزاد دەربکەی لە تاریکیەکانەوە کەسواری بێباوەڕان بوە بۆلای ڕووناکی ئایینی خوا کەشێوازی باوەڕدارانە. پێشەوا ڕازی ئەفەرموێ: ئەورستەیە بەڵگەیە لەسەرئەوەی ڕێگەی بێباوەڕی و لادان لە یاسای ئیسلام زۆرن، ڕێگەی ڕاستی یەك ڕێگەیە، بۆیە خوا فەرموی: تۆ ئادەمیزاد دەربهێنە لەتاریکیەکانی نەزانین و بێباوەڕیو گومڕایی بۆلای ڕوناکی ئایینی خوا. تۆ دەریان بکە لەتاریکیەکان .

﴿ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴾ بەهۆی دەستور و فەرموودەی خوای پەروەردگاری خۆیانە ڕێگەو ئایینی خوایەکی بەدەسەڵات و خوایە سوپاسی بۆ ئەکرێ لەسەر هەموو شتێ بەهەموسوپاسێ، ئەو ئایەتە زۆر بەڕوونی بەڵگەیە لەسەر ئەونیشانە سەرەکیانە بۆناردنی پێغەمەرو ناردنە خوارەوەی قورئان بۆلای پێغەمەرو هەموو ئادەمیزاد، بۆئەوەیش بەهۆی قورئانەوە هێزی مرۆڤ چەکداربکا بۆ کارکردن و پشتی یەك گرتن هەر لەبەر مرۆڤایەتی و خۆشەویستی نێوان مرۆڤ و ئاسایشی ئەوان، چونکە دەرهێنانی مرۆڤ لەتاریکیەوە بۆ لای ڕوناکی تەنها هەر بەبانگ کردن و نوێژ و ڕۆژو تەواو نابێ،

بەڵکو خۆ ماندوکردنێکی هەرەوەزی ئەویّ. نەك بە تەنها کەسیّ، بە ماندووبوونی هەمو ڕێکخراوەکان ئەبیّ، نەك بە چەند کەسیّ. یانی ماندوبون لە دژی داگیر کەران و لە دژی دارایی پەیداکردن بەڕێگەی نائاسایی، لە دژی نەزانین و کاری پڕوپوچ .

هەر بەوجۆرەی کەپێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ برایەتی نێوی هاوڕێکانی خۆی و گیانی خۆشەوستی و دڵپاکی و لەخۆبردنی تێدا ڕوواندن، دووبارە گیانی خۆبەخت کردنی تێدا چەسپاندن بۆ بەرزکردنەوەی ووشەی خواو ئاینی خوا، کۆمەڵیّ نەزان ومرۆڤی ووشك و دڵرقی کرد بەفروستادە و گەیاندنی بەچاکەو زانیاری و شارستانی بۆ سەر ڕووی زەوی، بەو بۆنەوە ئەبیّ بزانین کە دەجالەکانو خۆپەرستان و خوێن مژان پەرە ئەدەن بەئەفسانە و شتی پڕوپوچ و پەرەی پیّئەدەن و یاریدەی‌ستەمکاران ئەدەن بەناوی ئایینەوە، بەڕاستی ئەو کەسانە دوژمنترینی خواو پێغەمەری خوان، چونکە ئایین ڕوناکیە وکاری پڕوپوچ و چەندین تاریکیە و ئایین ڕێگەی خوایە و ستەمکردن ڕێگەی شەیتانە .

﴿ اللهُ الَّذِي لَهُ مافِيْ السَّماواتِ وَما فِيْ الأرْضِ﴾ خوا پەرستراوێکی ئەوتۆیە بۆ ئەوهەیە بەڕێوەبردنی هەمووشتیّ لەئاسمانەکانو لەزەویدان. خوای مەزنباسی هەنیّ لەسزای بیّباوەڕان ئەکاو ئەفەرمویّ :

﴿ وَوَيْلٌ لِلْكافِرِيْنَ مِنْ عَذابٍ شَدِيدٍ﴾ وەرەنج و سەختی و هاوار بۆ بیّ باوەڕانە لە سزای گرانی دۆزەخ کە لە ڕۆژی دواییدا دەست ئەکەن بەهاوار و واوەیلا.

﴿الّذِيْن يَسْتَحِبّوُنَ الْحَياةَ الْدُنْياعلى الاَخِرَةَ﴾ ئەو بیّ باوەڕانە کەسانێکی‌ئەوتۆن لەڕوی نەزانینەوە هەڵئەبژێرن بۆخۆیان ژیان وڕابواردنی جیهان و ڕێزی ئەدەن بەسەر خۆشی و گوزەرانی ڕۆژی دوایی‌دا، هەرکەسیّ بەو شێوەیەبیّ بیّ باوەڕە،یا وێنەی بیّ باوەڕانە لە کردەوەدا، شایانی‌سزایە باوەکو نوێژ و ڕۆژیش بکا.

﴿ وَ يَصد ونَ عَنْ سَبِيلِ اللّهِ وَ يَبْغُونَها عِوَجاً اولئِكَ فِي ضَلالٍ بَعِيد ﴾ وە ئەو بیّ باوەڕانە ڕێگە ئەگرن لە ئاینی خواو لەوەی بڕوا بە خوا و پێغەمبەر بهێنن وە داوای خوار و خێچی ئەکەن بۆ ئاین و ڕێگەی خوا. بەجۆریّ کە ئەو ئایینە ڕێگەی خوایە نای‌گەیەنن

بەئادەمیزاد. ئەوخواریە بریتیە لە درۆدان بەسەر خوادا و ئاژاوەنانەوە وکۆمەکی کردن بۆ دوژمنانی خوا. ئەو جۆرە کارانەوە نەبێ بەتایبەتی بێ باوەڕان بیکەن.بەڵکو بەنا و موسوڵمانی واهەن درۆ و نادروستی ئەکەن و هاوکاری دوژمنانی خواو نیشتمانی خۆیان ئەکەن و دژی خوا پەرستان ئەوەستن، ئەوکەسانە بەو جۆرانەی پێشووبن لە نێو گومڕاییەکی زۆر دان دوورن لە ڕاستی.

﴿ وَما أرْسَلْنا مِنْ رَسُولٍ إلا بِلِسانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ﴾ وە ئێمە ڕەوانەمان نەکردووە هیچ پێغەمەرێ بۆ لای تاقمێ مەگەر بەزمانی گەلەکەی خۆی، لەبەرئەوەی بۆ ئەوانی ڕوون بکاتەوە فەرمانەکانی خوا و ئەوانیش لێی تێبگەن وبزانن و بیانوویا نەمێنێ .

بۆ زانین: ئەگەر زمانێکی مرۆڤایەتی گشتی ببوایە و هەمو گەلانی سەرزەوی بیانزانیبایە. بەڕاستی پێغەمەر بەوزمانەوە ئەنێررا بۆلای ئادەمیزاد بەگشتی لە هەموو کات و جێگەیەکا.

ئەبێ ئاگاداری جیاوازی نێوان فەرموودەی خوا کەئەفەرموێ: { ئێمە ڕەوانەمان نەکردووە هیچ پێغەمەرێ مەگەر بەزمانی تاقمەکەی خۆی } و لە نێوان ئەوەی ببێژرێ: ئێمە ڕەوانە ناکەین هیچ پێغەمەرێ مەگەر بۆلای خاوەنی زمانەکەی خۆی، چونکە یەکەمیان ڕێگەبەوە ناگرێ پێغەمەر بۆ هەمووکەس بێ و زمانەکەی تایبەتی بێ. بەڵام دووهەمیان ئەوە ئەگەیەنێ پەیامی ئەو پێغەمەرە بەتەنها هەر بۆ تاقمەکەی خۆی بێ. بۆ ئەم مەبەستە تەماشای مانای ئایەتی (٢) ی سورەتی یوسوف بکەن .

﴿ فَيُضِلُ اللهُ مَنْ يَشاءُ وَيَهْدِيْ مَنْ يَشاءُ وَهُوَ الْعَزِيْزُ الحَكِيْمُ ﴾ دوایی خوا هەرکەسێ ئارەزووی هەبێ لای ئەدا لەڕێگەی ڕاست و، ڕێگەی ڕاست و نیشان ئەدا بەهەرکەسێ ئارەزووی هەبێ، خوا زۆر بەدەسەڵاتە لە فەرمانی خۆیا، هەمووشتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ لە دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست و لادان لە ڕێگە. یانی خوا پێغەمەرانی خۆی ئەنێرێ بۆلای بەندەکانی خۆی بۆئەوەی ڕزگاریان بکا لە نەزانین وگومڕایی، دوایی هەرکەسێ گوێڕایەڵی فەرموودەی پێغەمەران بو خوا ڕێگەی ڕاستی پیشان ئەدا، ئەو

کەسەیش ڕوو وەرگێڕێ خوا ڕێگەی پیشان نادا، ئەو کەسە بۆ هەڵبژاردنی هەریەکە لەو دووشتە سەربەستە. لە دواییدا خوای مەزن بە درێژی باسی ئەو شتەمان بۆ ئەکا لەئایەتی پێشوودا بەکورتی باسی کرابوو، ئەفەرموێ:

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٥﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٦﴾ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ إِن تَكْفُرُوا أَنتُمْ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٨﴾

﴿ وَلَقَدْ أرْسَلْنا مُوسى بِآياتِنا أنْ أخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُماتِ إلى النُّور ﴾ وەئێمە ڕەوانەمان کرد موسا بۆلای تافمەکانی بەچەندین نیشانەی ئاشکرای ئێمە کە بە ڵگەبوون لەسەر توانای ئێمەو چەندین کاری پەکخەرمان بەخشی بەموسا وێنەی داری دەستی،

ئیمەپیمان ووت: تۆ تاقمەکەی خۆت دەربکە لە تاریکیەکانی نەزانین و دوودڵی بۆلای ڕوناکی زانیاری تەواو بڕوای نەپساو .

﴿ وَذَكِّرْهُمْ بِأَيَّامِ اللهِ ﴾ وەتۆ ئامۆژگاری تاقمەکانت بکە بەهۆی ئەو ڕووداوانەی ئەوتۆ گەلانی ڕابووردوو توشیان بوون، ئامۆژگاریشیان بکەی بەهۆی ئەو چاکانەی خوا کەدابووی بەوان کەلەهەموویان گەورەتر ڕزگارکردنی خوابو بۆ ئەوان لەسزای فیرعەون ورزگاری کردن لەبەندایەتیو کۆیلەیی .

﴿ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾ بەڕاستی هەیە لەو ڕوداوانەداو لەوچاکانەدا چەندین نیشانەی ڕون وئاشکرا بۆ هەموکەسێ خاونی ئارامبێ لەسەر ئازارو ناخۆشی و بۆ کەسێ سوپاسی خوا بکا لە سەرئەو چاکانەی خوا بەوی بەخشیبێ .

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنْجَاكُمْ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە موسا ووتی بەخزمەکانی خۆی: ئێوەبیری ئەو چاکەیەی خوا بکەن بەسەرتانەوە کاتێ خوا ئێوەی ڕزگارکرد لە ئازاری پیاوماقولانی فیرعەون ئەیان چێژا بەئێوە خراپترین سزاکە ئێوەیان ئەکردبەبەندە .

﴿ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكُمْ بَلَاءٌ مِنْ رَبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴾ وەکوڕەکانی ئێوەیان سەرئەبڕین وژنەکانی ئێوەیان بەزیندوویی ئەهێشتەوە بۆ بنەبڕکردن وتۆو بڕینی ئێوە، چونکە یەکێ لەزاناکانیان هەواڵی دا بەفیرعەون کوڕێك پەیدا ئەبێ پاشایەتی تۆ بە دەستی ئەو کوڕە کۆتایی پێ دێ. بە ڕاستی لەو سزا سەختانەی ئێوەدا هەیە تاقی کردنەوەیەکی زۆر گەورەی خۆتانەوە لەلایەن پەروەردگاری ئێوە .

﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾ وەبیری ئەوکاتەیش بکەنەوە پەروەردگاری ئێوە بەئێوەی ڕاگەیاند ئەگەر بەڕاستی ئێوە سوپاسی خواتان بکردایە لەسەر ئەوچاکانە دابوی بەئێوە من چاکەی خۆم زۆرتر ئەکەم بۆ ئێوە لە هەردوو جیهاندا.

﴿ وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴾ وە ئەگەر ئێوە بەڕاستی باوەڕتان نەهێنابێ و سوپاسی خواتان نەکردبێ لەسەر ئەو چاکانەی دراوە پێتان بەڕاستی سزای من زۆر سەختە، لەجیهاندا چاکەی خۆمتان لێ ئەبڕم و لەپاشەڕۆژدا بەئاگری دۆزەخ سزتان ئەدەم.

﴿ وَقَالَ مُوسى إنْ كَفَرْتُمْ وَأنْتُمْ وَمَنْ فِيْ الآرْضِ جَمِيْعَاً فَأَنَّ اللهَ لَغَنِيٌّ حَمِيْدٌ ﴾ وە موسا ووتی بەخزمەکانی خۆی: ئەگەر ئێوە و هەمووکەسێ لە زەویدا هەموتان باوەڕنەهێنن، دوایی بەڕاستی خوا پێویستی بەهیچ کەسێ نیە، سوپاسی بۆ کراوە لەلایەن هەموو بونەوەرانەوە ئێوە بیکەن یا نەیکەن .

أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۛ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَرَدُّوٓا۟ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَقَالُوٓا۟ إِنَّا كَفَرْنَا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾ ۞ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِى ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ قَالُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأْتِيَكُم

بِسُلْطَٰنٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾

﴿ أَلَمْ يَأتِيكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ لا يَعْلَمُهُمْ إلا اللهُ ﴾ ئایا نەهاتوە بۆ لای ئێوە هەواڵی کەسانێکی ئەوتۆ لە پێش ئێوەوە بون لە تاقمی نوح و عاد و گەلی هود و سەمودی تاقمی صالح و کەسانێکی ئەوتۆ لەدوای ئەوانەوە هاتوون ژمارەیان ئەوەندە زۆرن هیچ کەسێ نایانزانێ مەگەر خوا، وەك عەرەب و جگەی عەرەب کەبنەبڕبوون وشوێنەواریان نەماوە .

﴿ جاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّناتِ فَرَدُّوا أَيْدِيَهِمْ فِيْ أَفْواهِهِمْ ﴾ پێغەمەرەکانیان هاتبوون بۆلایان بە چەندین نیشانەی پەکخەر بەڵگەبون لەسەر پێغەمەرایەتی پێغەمەرەکانیان، دوایی ئەو گەلانە دەستی خۆیانیان ئەگێڕایەوە بۆ دەمیان لەڕق و خەفەتاو ئەیان کرۆشت و باوەڕیان نەهێنا، بە دەستەکانیان ئاماژەیشیان بۆلای پێغەمەرەکانیان ئەکردئێوە بێ دەنگبن.

﴿ وَقَالُوا إِنّا كَفَرْنا بِما أرْسِلْتُمْ بِهِ وَإنّا لَفِيْ شَكٍّ مِمّا تَدْعُونَنا إِلَيْهِ مُرِيب ﴾ وەئەو گەلانە بەپێغەمەرەکانی خۆیانیان ئەووت: بەڕاستی ئێمە باوەڕ بەشتێ ناهێنین ئێوە نێرراون بەوشتەوەو، بەڕاستی ئێمە لە گوماندایین لەڕاستی شتێ ئێوە داوای ئەکەن لەئێمە مرۆڤ ئەخاتە گومانەوە و جێگەی گومانە .

﴿ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللهِ شَكٌّ فاطِرِ السَّماواتِ وَالآرْضِ يَدْعوكُمْ لِيَغْفِرَ مِنْ ذُنُوبِكُمْ ﴾ پێغەمەرەکانیان ووتیان: ئایا لەبون ودەسەڵاتی خوادا گومانتان هەیە کە بیپەرستن؟

باوەڕتان بەدرەخت وبەرد هەیە کەبیان پەرستن و پشیلەو سەگ میزیان پێدا ئەکەن، خوا دروست کەری ئاسمانەکان و زەویە و هەموو ئەوشتانە لەناو ئەودان، خوا بانگی ئێوە ئەکا باوەڕی پێ بهێنن وبیپەرستن لەبەرئەوەی لەگوناهەکانی ئێوە خۆشببێ .

﴿ وَ يُؤَخِرُكُمْ إلى أجَلٍ مُسَمىً ﴾ وە خوا ئێوەی دووا خستوە بۆ لای کاتێکی دیاری کردنی کۆتایی تەمەنتان، ئەو کاتەیش هەر خوا ئەیزانێ .

﴿ قالُوا إنَ أنْتُمْ إلاّ بَشَرٌ مِثْلُنا تُرِيْدُونَ أنْ تَصُدُونا عَمّا كانُوا يَعْبدُوا آباؤُنا فِأتُوا بِسُلْطانٍ مُبِيْنٍ ﴾ وە ئەو گەلانە ووتیان بەپێغەمەرەکانیان: ئێوە هیچ زیادەیەکتان نیە مەگەر ئێوە ئادەمیزادێکی وێنەی ئێمەولەشێوەی ئێمەدان، بۆ ئەبێ ئێوە پێغەمەر بن لە نێو ئێمەدا، ئێوە ئەتانەوێ کە ئێمە لابدەن لە پەرستنی شتێ باوباپیرەکانمان ئەیان پەرستن، دوایی ئێوە پێویستە بەڵگەی ڕون وکاری پەکخەر بهێنن لەسەر ڕاستی خۆتان .

﴿ قالَتْ رُسُلُهُمْ إنَ نَحْنُ إلاّ بَشَرٌ مِثْلَكُمْ وَلَكِنَ اللهَ يَمِنُّ عَلَى مَنْ يَشْاءُ مِنْ عِبادِهِ ﴾ پێغەمەرەکانیان ووتیان ئێمە: هیچ شتێك نین مەگەر ئادەمیزادێکین وێنەی ئێوەو، بەڵام خوا چاکەی خۆی ئەڕێژێ بەسەر کەسێکائارەزووی هەبێ لەبەندەکانی خۆیو ڕێزی ئەگرێ بەپێغەمەرایەتی .

﴿ وَماكانَ لَنا أنْ نَأتِيَكُمْ بِسُلْطانٍإلا بِإذْنِ اللهِ ﴾ وە بۆ ئێمە نیە و ناتوانین هیچ بەڵگەیە بهێنین بۆ لای ئێوە مەگەر بەدەستور و فەرمانی خوا، خوایش هەموشتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

﴿ وَعَلَى اللهِ فَلْيَتَوَكَلْ الْمُؤمِنُونَ ﴾ وەهەر لەسەرخوا دوایی باوەڕداران پەنا ببن وپشت بەخوا ببەستن، بەردەوامبن لەسەر گەیاندنی فەرمانی خوا و بڕوای تەواویان هەر بەوبێ.

﴿ وَما لَنا أنَّ لأَنْتَوَكَلَ عَلَىا اللهِ وَقَدْ هَدانا سُبُلَنا ﴾ وە چ بیانوێ بۆ ئێمە هەیە کە ئێمە پەناو پشت بەست نەبین لەسەر خواو هەمو شتێ خۆمان هەواڵەی خوا نەکەین و، بەڕاستی خوا شارەزایی ئێمەی کردوە بۆلای ڕێگەی ڕاستی ئێمە بەئیسلامەنی و بە پێغەمبەرایەتی.

﴿ وَ لَنَصبَرَّنَ عَلى ما آذيتمونا وَعَلى اللهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە ئارام ئەگرین لەسەر شتێ ئێوە ئازاری ئێمەی پێ ئەدەن لە دژایەتی ئێمەو لە دژی ئایینی خواو، دوایی ئەبێ هەر لەسەر خوا پشت ببەستن ئەو کەسانەی بڕوایان بەخوا هەیە وە هەموو کارێکی خۆیان تەسلیم بەخوا ئەکەن .

وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِى وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَٱسْتَفْتَحُواْ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾

﴿ وَقَالَ الّذِيْنَ كَفَرُوا لِرُسلِهِمْ لَنخرَجَنّكُمْ مِنْ أرْضَناأوْ لَتُعُودُنَّ فِيْ مِلَتِناَ ﴾ وە کەسانێك باوەڕیان نەهێنابوو ووتیان بەپێغەمەرکانی خۆیان :بەڕاستی ئێمە ئێوە دەرئەکەین لەم زەوییەو لەم شارەی خۆمان یا ئەبێ بەڕاستی ئێوە بێنەوە بۆ لای ئایینی ئێمەو لەگەڵ ئێمەدا بن .

پێغەمەران داوای ڕاستی و دادپەروەری و پەند وەرگرتنیان ئەکرد و زۆریان لە هیچ کەسێ نەئەکرد بێنە سەرئایینی خوا، چونکە پێغەمەران لەسەر بنچینەی بێ زۆری

وەستاوین بەرانبەر بەئایین، هەرچەندە ئایینی ئیسلام لە ناوەڕۆکا لە سەرشۆڕش لە دژی ستەمکاران وەستاوە. بە پێچەوانەوە بێ باوەڕان داوایان لە پێغەمەران ئەکرد واز لە ئایینی خوابهێنن و دووربوون لە دادپەروەری و مافی ڕەوا .

﴿ فَأَوْحى إِلَيْهِمْ رَبهِمْ لَنُهْلِكَنَ الظالِمِيْنَ ﴾ دوایی پەروەردگاری پێغەمەران سروشی ناردە خوارەوە بۆلایان بەڕاستی ئێمە لەناو ئەبەین ستەمکاران. ئەو لەناوبردنەیان دوایی لە بەردەوامیانە لەسەر بێباوەڕی .

﴿ وَلَنَسْكُنُكُمْ الآرْضَ مِنْ بَعْدِهِمْ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە ئێوە جێگیر ئەکەین لە نیشتمان و زەوی ستەمکاران لە دوای لە ناوبردنی ئەوان، زۆر ڕوونە پاشەڕۆژی لە خوا نەترسان پێویستە بەوجۆرە بێ .

گفتوگۆی قورئانی پیرۆز خاوەنی ئەم سوودانەیە: هاندانی ئادەمیزاد بۆ چاکەکردن. ترساندنیان لەکاری خراپ، مرۆڤ خۆی بەبەختیار بزانێ لەئاکامدا، ئەبێ بزانرێ بۆستەمکاران ماوەیەکی تایبەتی هەیە بۆ دەست درێژی ئەوان، لەدواییدا تۆڵەیان لێ ئەسەنرێ .

﴿ ذلِكَ لِمَنْ خافَ مَقامي وَخافَ وَعِيْدِ ﴾ ئەو سروشە بەو شێوەیە بۆ لەناوبردنی بێ باوەڕان و دانانی پێغەمەران لە زەوی و نیشتمانی ئەواندا بۆ کەسێکە ترسابێ لەبون و دەسەڵاتی من کەئادەمیزاد ڕائەوەستێنم لەو جێگەیەدا بۆ فەرماندان لە ڕۆژی دواییدا بۆ پرسیارو وەڵام و بۆ کەسێکە ترسابێ لەهەڕەشەی من بۆ سزادان، بەمەرجێ لەئایینی ڕاست وەرنەگەڕێن و واز نەهێنن لەڕاستی بۆ قازانجی دوژمنانی ئیسلام .

﴿ وَاسْتَفتحُوا وَخابَ كُلُّ جَبارٍ عَنِيدٍ ﴾ وەپێغەمەران داوای سەرکەوتنیان کرد لەخوا بەسەر دوژمنانی خۆیانان، خوای گەورە وەڵامی‌دانەوەو سەری خستن و لەزەوی ونیشتمانی بێباوەڕانداى نان، وەبێ ئومێدو زیانۆمەنبوون هەموو زۆردارو لەخۆبایی بوان لە دژی ڕاستی و بزانێ ڕاستە.

﴿ وَمِنْ وَرائِهِ جهَنَمٌ وَ يُسْقِي مِنْ ماءٍ صَدِيدٍ يَتَجَرّعُهُ وَ لا يَكادُ يُسيفهُ ﴾ وە لە پاشی ئەو زۆردارو خرپە کارانەوەیە دۆزەخ و ئەچنە ناوی و تۆڵەیان لێ ئەسێنرێ و لە

دۆزەخدا دەرخواردیان ئەدرێ لە ئاوێ بریتیە لە کێم و زوخی پیسی دانیشتوانی دۆزەخ دێتە دەرەوە لە وێنەی ئاوی ئەم ڕۆژە ناچێ، زۆر ئەکا لە خۆی نەختێکی لێ بخوا، ناتوانێ بە ئاسانی قووتی بدا لەبەرتامی ناخۆشی و بۆگەنی پیسی ئەو زوخە.

﴿ وَ يَأْتِيْهِ الْمَوْتُ مِنْ كُلِّ مَكانٍ وَمَا هُوَ بِمَيْتٍ ﴾ وە دێت بۆلای ئەو بێ باوەڕە ئازاری سەختی مردن لە هەموو لایەکی ئەندامەکانیەوە وئەوکەسە نامرێ هەتا ڕزگاری بێ لەو ناخۆشیە و خوا نایەوێ بمرێ هەتا ئازاری زۆر بێ .

﴿ وَمِنْ وَرائِهِ عَذابٌ غَلِيْظٌ ﴾ وە لە پێش وپاشی ئەو بێ باوەڕانەوە هەیە سزایەکی سەخت بەرەو پێشی دێ لە هەمووکات و جێگەیەکا، هەتا بێت سزاکەی گرانتر ئەبێ .

خوای مەزن لەئایەتەکانی پێشوودا باسی سزادانی بێ باوەڕانی کرد. لەمەودوایش ڕونی ئەکاتەوەکە کردەوەی بێباوەڕان پوچ ئەبێ وبێسودەوسودی لێ وەرناگرن لەڕۆژی دواییدا وئەفەرموێ :

مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ أَعْمَٰلُهُمْ كَرَمَادٍ ٱشْتَدَّتْ بِهِ ٱلرِّيحُ فِى يَوْمٍ عَاصِفٍ ۖ لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا۟ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴿١٨﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿٢٠﴾ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ

مِن شَيْءٍ قَالُواْ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾

﴿ مِثْلُ الَّذِيْنَ كَفَرُوا بِرَبِهِمْ ﴾ وێنەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بەپەروەردگاری خۆیان نەهێناوە لەوشتەیئەخوێنرێتەوە بەسەر ئێـوەدا لەشێواز و جۆریانـا، بەوجۆرەیـە کـەخوا ئەفەرموێ .

﴿ أعْمالَهُمْ كَرِمادٍ اشتَدَتْ بِهِ الْرِيْحُ فِيْ يَـومٍ عـاصِفٍ ﴾ کردەوەکانیـان کردویانـە لـە جیهاندا وەك خۆڵـەمێشێکە بەتوندی با هەڵی بگرێ و ببیا لـە ڕۆژێکا بای توندی تێدا پەیدا ببێ ئەو خۆڵـەنەمێنێ .کردەوەی بێباوەڕانیش بێ پاداشتە بۆیان .

زۆربەی زانایان لـە ماناکردنی ئەم ئایەتەدا فەرموویانە: بێباوەڕان سـود وەرنـاگرن لـە کردەوەی چاکی خۆیان و بەخشینی دارایی و سەردان لـە خزم و دەست گیرۆیی هەژاران و خزمەتی مرۆڤایەتی و تێرکردنی برسیەکان هەتا دێی. بەڵام هەندێ لـە زانایان ئەڵێن: ئەو کەسەی چاکەیە بکا مرۆڤایەتی پاڵی پێوەنابێ، ئەوکارەی کردوویەتی هەربۆخوایە بیـەوێ یانەیەوێ.بێگومان کارکردن لـەبەر خوا پاداشتەکەی لای خوایەو لـەکیسی نـاچێ چونکـە خوا دادپـەروەرە، ئیـتر بەهـەر شـێوەیە بـێ پاداشـتی ئەداتـەوە لـە جیـهاندا بـێ یـا لـە پاشەڕۆژدابێ. بەسوك کردنی سزاکەی، ئەوەیش واناگەیەنێ خوا نـەی خاتـە نێـو ئـاگری دۆزەخ، چاکەی خوا نایەتـە ژمـارە، بـەڵام هـەر مرۆڤـێ لـەبـەر قـازانج وەرگرتـن لـە بازرگانیدا چاکە بکات نەك لـەبەر مرۆڤایەتی وێنەی کەسێ چاکە لـەگەڵ دانیشـتوانا بکـا لـەبەر ئەوەی هەڵیبژێرن لـەکاتی هەڵبژاردندا، خـوای مـەزن لـەجیـهان و لـە پاشـەڕۆژدا پاداشتی ناداتەوە. باسکردنی بێ باوەڕان لێرەدا بەتایبەتی مانای وانیە جگەی بـێ بـاوەڕان سود لـەچاکە وەرئەگرن بەو شێوەیە بێ، ئەبێ بزانین باوەڕدارانیش پاداشـتیان نادرێتـەوە . ئەگەر بۆ مەبەستی بازرگانی و سەرکەوتنبێ لـە جیهاندا نەك لـەبەر خوا .

﴿ لایَقْدِرُنَ مِمّا کَسَبُوا عَلی شَيْءٍ ذلِكَ هُوَ الضّلال الْبَعِدُ ﴾ ئەو بێ باوەڕە لەرۆژی دواییدا توانایان نیە بەسەر هەمو شتێکا کردویانە لەجیهاندا بەجۆرێ پاداشتی لێ وەربگرن، بە وێنەی ئەو خۆڵە مێشەی با بردویەتیو ناتوانرێ بگێرڕێتەوە، بە وێنەی ئەو کەسەیش لەبەر بازرگانی چاکەی کردبێ. نەك لەبەر مرۆڤایەتی، ئەو گومڕاییەی بێ باوەڕان هەرچەندە گومانیان وایە چاکەیان کردوە ڕێگە ونکردنێکی دورەو لە ڕاستیەوە دورە .

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللّهَ خَلَقَ الْسَماواتِ وَالأَرضَ بِالْحَقِ ﴾ ئایا تۆ نازانیو نابینی بەڕاستی خوا دروستی کردوە ئاسمانەکان و زەوی بۆ کارێکی ڕاستی دروستی کردون نەك بەبێ سود. ئاسمان و زەوی بەو هەموە بونەوەرانەوە بەسەر یانەوەن دروستی کردوون بەجۆرێکی وا شایستەی دروستکردنیان بێ و بەڵگەیشن لەسەر توانای خوا، ئەو کەسەی ئەوانەی دروست کردوە زۆر ئاسانە لای دروست کردنی ئێوەو زیندو کردنەوەتان لە ڕۆژی دوواییدا .

﴿ إنْ یَشَأْ یُذْ هِبْکُمْ وَیَأتِ بِخَلْقِ الجَدیدٍ ﴾ ئەگەر خوا ئارەزو بکا ئێوە لەناو ئەباو دروست کراوو تاقمێ تری تازە دروست ئەکاو ئەیانهێنێتە لە جیهانەوەو بێ فەرمانی خوا ناکەن و لە جێگەی ئێوەی دانیشتوانی مەککەی دای ئەنێ .

﴿ وَما ذلِكَ عَلی اللهِ بِعَزیزٍ ﴾ وە لەناو بردنی ئێوەو هێنان و دروست کردنی بونەوەرانی تری تازە گران نیە لەسەر خوا، هەمو شتێ لای خوا ئاسانە، دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی لە دروست کردنی ئێوە گەورەترە .

﴿ وَبَرَزُو للهِ جَمیعاً ﴾ وە بونەوران بە ئادەمیزادو جنۆکەو فریشتەوە هەمویان لە ڕۆژی دواییدا دەر ئەکەون، لەبەردەم فەرمان و گەورەیی خوادا بۆ پرسیار و پاداشت وەرگرتن بەئەندازەی کردەوەکانی خۆیان .

﴿ فَقالَ الضُعَفاءُ لِلَّذیْنَ اسْتَکبَرُوا إنّا لَکُمْ تَبِعاً ﴾ دوایی لاوازو بێ دەسەلاّتن بەو کەسانەی داوای گەورەییان ئەکرد لە جیهاندا ئەڵێن: بەڕاستی ئێمە دوا کەوتوو بچوکی ئێوە بوین لە باوەڕ نەهێنان بە پێغەمبەرەکان و بەفەرمانی ئێوە هەڵساوین.

﴿ فَهَلْ أَنْتُمْ مُّغْنُوْنَ عَنـاّ مِـنْ عِـذابِ اللهِ مِـنْ شَـیءٍ ﴾ دووایـی ئایـا ئێـوه لـەم ڕۆژەدا ئەگێڕنەوه لەئێمه لەسزای خوا شتێ‌و سزا نەدرێین ؟

﴿ قالُوا لَو هَداناَ اللهُ لَهَدَیْناکُمْ ﴾ سەرۆکەکان بەژێر دەسـتەکان ئـەڵێن: ئەگـەر خـوا ئێمەی ڕزگار بکردایه لەسزای خۆی‌و ڕێگەی ڕزگـاری بـه ئێمـه نیشـان بدایـه ئـەمڕۆ بەڕاستی ئێمەیش ئێوەمان ڕزگار ئەکردو ڕێگەی ڕزگاریمان نیشان ئەدان. بەڵام ئێمه هەمو ڕێگەیەکمان لێ داخراوە، پاڕانەوەمان لێ وەرناگیرێ و بێ ئومێدبووین ؟

﴿ سَـواءٌ عَلَیْنا أَجَزِعْنا أَمْ صَبَرناّ مالَنا مِنْ مَحِیصٍ ﴾ یەکسانه لەسەر ئێمه ئایا خەفـەت بخۆین و بگرین و هاوار بکەین یا ئارام بگرین و بێ دەنگ بین بـۆ ئێمـه نیـه ڕزگـاربون و ڕاکردن هەتا ڕزگارمان بێ لەسزا، هـەمو شـتێ بڕاوەتـەوە. کـاتی هەڕەشـەکردن لـەبێ باوەڕان ڕابوردو گفتەگۆی نێوان ژێر دەستەو سەرۆکەکان کۆتایی پێ هات.

خوای مەزن باسی گفتو گۆی شەیتان ئەکا لەرۆژی دواییداو ئەفەرموێ :

وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّ إِنِّي كَفَرۡتُ بِمَآ أَشۡرَكۡتُمُونِ مِن قَبۡلُۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٢﴾ وَأُدۡخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ

تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ۖ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴿٢٣﴾

﴿ وَقَالَ الْشَيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الأَمْرُ ﴾ وە شەیتان ئەڵێ بە دۆست و پەیڕەوانی خۆی لەڕۆژی دواییدا کاتێ هەمو فەرمانێ ئەبڕێتەوە، باوەڕداران و بەهەشتیەکان ئەچنە بەهەشت و دۆزەخیەکان ئەچنە نێو دۆزەخەوە ئەبێ بەووتار خوێنی خراپەکەران لە ئادەمیزادو جنۆکە ئەڵێ :

﴿ إِنَّ اللهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِ وَوَعَدْتُكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ﴾ بەڕاستی خوا بەڵێنی دابو بە ئێوە بە بەڵێنێکی ڕاست کەخوا ئێوە زیندو ئەکاتەوەو پرسیارتان لێ ئەکاو پاداشت و تۆڵەی کارەکانتان ئەداتێ بەگوێرەی کردەوەی خۆتان، دوایی من بەڵێنم ئەدا بە ئێوەو پێم ئەوتن: زیندوبونەوەو بەهەشت و دۆزەخ نین، دوایی من درۆم لەگەڵ ئێوە ئەکردو بەدژی ئێوەوە هەڵئەسام .

﴿ وَما كانَ لِي عَلَيْكُم مِّنْ سُلْطانٍ ﴾ وە من هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو بەسەر ئێوەدا ناچارتان بکەم بۆلای بێ باوەڕیو بێ فەرمانی خواداو خۆتان سەربەست بوون ئەتان توانی دژی من ڕاوەستن .

﴿ إلاَّأنْ دَعَوْتُكُمْ فَأَسْتَجَبْتُمْ لِى ﴾ مەگەر من بانگی ئێوەم ئەکرد بۆلای گومڕایی بەجوان کردنی من ئەو کارانە بۆتان بەبێ ئەوەی ئێوە من ببینن ، دوایی ئێوە بەپەلە وولامی منتان ئەدایەوە .

﴿ فَلاَ تَلومُونِي وَلُومُوا أنْفُسَكُمْ ﴾ دوایی تانە لەمن نەدەن و لۆمەی من مەکەن بۆ کردنی بێ فەرمانی خواو ئەو شتەی ئێستا توشتان بوەو سەرزەنشت و لۆمەی خۆتان بکەن کەدوای فەرمودەی ڕاستێ خوا نەکەوتن و دوای درۆی من کەوتن و ئەتان توانی ڕێگەی چاك بدۆزنەوە بەهۆی ئەقڵی خۆتانەوە .

﴿ ماأنا بِمُصرِخِكُمْ وَما أنْتُمْ بِمُصرِخِيَّ ﴾ من ئێوە ڕزگارناکەم لە سزای خواو ئێوەیش من ڕزگارناکەن لە سزای خوا هیچ لایەکمان فریای هیچ لایەکمان ناکەوین .

﴿ إنِّي كَفَرْتُ بِما أشْرَكْتُمُونِي مِنْ قَبْلُ ﴾ بەڕاستی من ئەمڕۆ باوەڕم بەهاوبەشی کردنی ئێوە نیە کە شتانەتان ئەکرد لەمەوبەر بەهاوبەش بۆ خوا لەپەرستنداو من بێزارم لەهاوبەش دانان بۆ خوا ، ئەگەر ئێوە ژیر بونایە منتان نەئەکرد بەهاوبەشی خوای مەزن .

﴿ إنَّ الظالِمِينَ لَهُمْ عَذابٌ شَدِيدٌ ﴾ بەڕاستی بۆستەمکاران لە خۆیان هەیە سزایەکی ئازاردەرو سەخت و بەردەوام .

بۆزانین : هەمو شتێ سەرەتاو کۆتایی بۆ هەیە جگەی خوای مەزن کەهەر بوەو هەر ئەشبێ و ناگۆڕێ .

بەڵام وائەبێ سەرەتای کارێ بەڕووالەت بەچاك دائەنرێو کۆتایی پێ دێ بەدژی سەرەتاکەی . بە پێچەوانەیشەوە وائەبێ سەرەتای کارێ بەخراپ ئەبینرێو کۆتایی پێ دێ بەچاکە ، بۆیە ناتوانرێ ئێمە فەرمان بدەین بەسەرەتاو کۆتایی هەموشتێ نەبەچاك و نەبەخراپ ، هەر خوا ئەزانێ بەپاشەڕۆژی هەمو شتێو ئەو شتانە لە ئێمەوە نازانرێن .

بۆنمونە قارون لەسەرەتادا خۆی بەبەختیار ئەزانێ ، کۆتایی پێ هات بەخۆیو دارایی و سامانیەوە چون بەناخی زەویدا . پاشەڕۆژی باوەڕداران بەختیاری و خۆشحاڵیە هەرچەندە لە سەرەتادا توشی ناخۆشی بوون وەك خوای مەزن ئەفەرموێ :

﴿ وَأدْخِلَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصّالِحاتِ جَنّاتٍ تَجرِي مِنْ تَحْتِها الأنْهارُ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوەئەخرێنە چەندین بەهەشتێ ئەڕوا بەژێر درەخت و ئەم لاولای کۆشکەکانیانا چەندین ڕوباری شیرین و پوختە .

تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴿٢٣﴾

﴿ وَقَالَ الشَّيْطانُ لَمّا قُضِيَ الأَمْرُ ﴾ وە شەیتان ئەڵێ بە دۆست و پەیڕەوانی خۆی لەڕۆژی دواییدا کاتێ هەمو فەرمانێ ئەبڕێتەوە، باوەڕداران و بەهەشتیەکان ئەچنە بەهەشت و دۆزەخیەکان ئەچنە نێو دۆزەخەوە ئەبێ بەووتار خوێنی خراپەکەران لە ئادەمیزادو جنۆکە ئەڵێ :

﴿ إِنَّ اللهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِ وَوَعَدْتُكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ﴾ بەڕاستی خوا بەڵێنی دابو بە ئێوە بە بەڵێنێکی ڕاست کەخوا ئێوە زیندو ئەکاتەوەو پرسیارتان لێ ئەکاو پاداشت و تۆڵەی کارەکانتان ئەداتێ بەگوێرەی کردەوەی خۆتان، دوایی من بەڵێنم ئەدا بە ئێوەو پێم ئەوتن: زیندوبونەوەو بەهەشت و دۆزەخ نین، دوایی من درۆم لەگەڵ ئێوە ئەکردو بەدژی ئێوەوە هەڵئەسام .

﴿ وَما كانَ لِي عَلَيْكُم مِّنْ سُلْطانٍ ﴾ وە من هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو بەسەر ئێوەدا ناچارتان بکەم بۆلای بێ باوەڕیو بێ فەرمانی خواداو خۆتان سەربەست بوون ئەتان توانی دژی من ڕاوەستن .

﴿ إِلاَّأَنْ دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي ﴾ مەگەر من بانگی ئێوەم ئەکرد بۆلای گومڕایی بەجوان کردنی من ئەو کارانە بۆتان بەبێ ئەوەی ئێوە من ببینن ، دوایی ئێوە بەپەلە وولامی منتان ئەدایەوە .

﴿ فَلاَ تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنْفُسَكُمْ ﴾ دوایی تانە لەمن نەدەن و لۆمەی من مەکەن بۆ کردنی بێ فەرمانی خواو ئەو شتەی ئێستا توشتان بوەو سەرزەنشت و لۆمەی خۆتان بکەن کەدوای فەرمودەی ڕاستیٔ خوا نەکەوتن و دوای درۆی من کەوتن و ئەتان توانی ڕێگەی چاك بدۆزنەوە بەهۆی ئەقڵی خۆتانەوە .

﴿ ماأنا بِمُصرِخِكُمْ وَما أنْتُمْ بِمُصرِخِيَّ ﴾ من ئێوە ڕزگارناکەم لە سزای خواو ئێوەیش من ڕزگارناکەن لە سزای خوا هیچ لایەکمان فریای هیچ لایەکمان ناکەوین .

﴿ إنِّي كَفَرْتُ بِما أشْرَكْتُمُونِي مِنْ قَبْلُ ﴾ بەڕاستی من ئەمڕۆ باوەڕم بەهاوبەشی کردنی ئێوە نیە کە شتانەتان ئەکرد لەمەوبەر بەهاوبەش بۆ خوا لەپەرستنداو من بێزارم لەهاوبەش دانان بۆ خوا ، ئەگەر ئێوە ژیر بونایە منتان نەئەکرد بەهاوبەشی خوای مەزن .

﴿ إنَّ الظالِمِينَ لَهُمْ عَذابٌ شَدِيدٌ ﴾ بەڕاستی بۆستەمکاران لە خۆیان هەیە سزایەکی ئازاردەرو سەخت و بەردەوام .

بۆزانین : هەمو شتێ سەرەتاو کۆتایی بۆ هەیە جگەی خوای مەزن کەهەر بوەو هەر ئەشبێ و ناگۆڕێ .

بەڵام وائەبێ سەرەتای کارێ بەڕووالەت بەچاك دائەنرێو کۆتایی پێ دێ بەدژی سەرەتاکەی . بە پێچەوانەیشەوە وائەبێ سەرەتای کارێ بەخراپ ئەبینرێو کۆتایی پێ دێ بەچاکە ، بۆیە ناتوانرێ ئێمە فەرمان بدەین بەسەرەتاو کۆتایی هەموشتێ نەبەچاك و نەبەخراپ ، هەر خوا ئەزانێ بەپاشەڕۆژی هەمو شتێو ئەو شتانە لە ئێمەوە نازانرێن .

بۆنمونە قارون لەسەرەتادا خۆی بەبەختیار ئەزانێ ، کۆتایی پێ هات بەخۆیو دارایی و سامانیەوە چون بەناخی زەویدا . پاشەڕۆژی باوەڕداران بەختیاری و خۆشحاڵیە هەرچەندە لە سەرەتادا توشی ناخۆشی بوون وەك خوای مەزن ئەفەرموێ :

﴿ وَأُدْخِلَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصّالِحاتِ جَنّاتٍ تَجرِي مِنْ تَحْتِها الأنْهارُ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوەئەخرێنە چەندین بەهەشتێ ئەڕوا بەژێر درەخت و ئەم لاولای کۆشکەکانیانا چەندین ڕوباری شیرین و پوختە .

﴿ خالَدِیْنَ فِیْها بإذْنِ رَبِهِمْ ﴾ بەردەوامن لەنێو ئەو بەهەشتانە بەهۆی دەستورو فەرمانی پەروەردگاری خۆیان و بەخۆش گوزەرانیەوە ڕائەبوێرن .

﴿ تَحِیَّتُهُمْ فِها سَلامٌ ﴾ گفتوگۆ و کات باشیان لەگەڵ یەکتری و فریشتەکانیش لەگەڵ ئەواندا سلاوکردنە، لەپاشا خوای مەزن وێنە لێئەدا بۆڕون کردنەوەو جیاوازی نێوان ئادەمیزادی چاك و خراپ و ئەفەرموێ :

أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴿٢٦﴾ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾

﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً ﴾ ئایا تۆ نەت زانیوە و نەتبینیوە خوا وێنە باس ئەکاو ڕوونی ئەکاتەوە وێنەی ووشەیەکی پاك و سود بەخش بۆهەمو کارێکی جیهان و ئاین، ئەو ووشەیە ئەگێڕێ :

﴿ كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُها ثابِتٌ وَفَرْعُها فِي السَّماءِ ﴾ بەوێنەی درەختێکی پاك و ڕیشوەکانی چوبێ بەزەویداو خۆی گرتبێ و لقەکانیشی بەرەو ژور چوبێ بەئاسمانداو دوربێ لەپیسایی زەوی‌و بۆنی پیس هەتا بەرهەمەکەی دوربێ لەهەمو نەخۆشیە . ئەو درەختە خورمابێ یا جگەی خورما گرنگ نیە .

﴿ تُؤتِي أُكُلَها كُلَّ حِينٍ بِإِذنِ رَبِّها ﴾ ئەو درەختە هەمو وەرزێ بەرهەمو میوەی خۆی بەرێك و پێکی ئەبەخشێ بە ئادەمیزاد بەهۆی دەستورو فەرمانی پەروەردگارو دروست کەری خۆی .

بۆزانین : مەبەست لەو ووشە پاکە ووشەی یەکێتی خوایە ( لاالە الا الله ) بێگومان ئەو ووشەیە سەرچاوەی هەمو ڕاستیەکە . ئەتوانرێ مانای ئەو ووشەیە بکرێ بەهەمو ووشەیە سود بگەیەنێ بە ئادەمیزادو چاکەو خۆشی بدا بەسەریانا بەهەر جۆرێ بێ ، ئیتر لەبەر ئایینێ یا بۆ یاسا و دەستور ، گەورەترین ووشە و گفتوگۆ ڕاپەڕینە لەدژی کاربەدەستانی ستەمکارو لە دژی بەکرێ گیراوان و کۆنە پەرستان و یاریدەرانی ستەمکاران کەسەرچاوەی هەمو دەردێکن .

بەکورتی هەروەك ئەو درەختە پاکە سودی لێ وەرئەگیرێ لەبەرهەمەکانی‌و میوە درەختیەکەی . ووشەی چاکیش سودی هەیە بۆ بەرەو پێش بردنی ئایین و نیشتیمان و ئاسایشی جیهان و ئەبێتە هۆی خۆشەویستی بەردەوام لەنێو ئادەمیزادا.

﴿ وَيَضْرِبُ اللهُ الأَمْثالَ لِلناسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ وەخـوا وێنەکان ڕون ئەکاتەوە بۆ ئادەمیزاد بۆئەوەی ئامۆژگاری وەربگرن و تەمێ خواربن .

﴿ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ﴾ وەوێنەی گفتو گۆو ووشەی پیس و ناپاك کەبریتیە لەبێ باوەڕی‌و هاوبەشدانان بۆخواو دروست کردنی ئاژاوەو بیروباوەڕی کاول کەر بەوێنەی درەختێکی پیس و تاڵ و بۆگەن و تام ناخۆش و بەرهەمێکی قێزەوونی هەیە و هیچ سودێکی نەبێ بەو جۆرەی ئێوە ئەیبینن . بەڵام لەوانەیە لە خزمەت خوادا سودی هەبێ و ئێمە نایزانین ئەو درەختەیش وەك کاڵەکەمارانەو قەرژاڵە یە .

﴿ اجْتُثَتْ مِنْ فَوقِ الأَرضِ مالَها مِنْ قَرارِ ﴾ هەڵ بکنرێ بەخۆی ڕیشوەکانیەوە لەسەر زەوی و پارچە پارچە بکرێ . بۆئەو درەختە نیە ڕاوەستان و مانەوەی لەزەویدا ، نە بەرهەمەکەی سودی لێ وەرئەگیرێ و نەخۆیشی سێبەری هەیە بۆ پشودانی دانیشتوانی . مرۆڤی خراپیش وێنەی ئەو درەختەیە ڕەوشت خراپ و زمان پیس و پرو پاگەندەی خراپ بڵاو ئەکاتەوە بۆ ئازاردانی دانیشتوان .

﴿ یُثَبِتُ اللهُ الَّذِیْنَ آمَنُوا بِالقَولِ الثابَتِ فِی الحَیاةِ الّدُنیا والآخِرَةِ ﴾ وە خوا کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە پایەداریان ئەکا بە گفتوگۆی بەردەوام و بێ کۆتایی‌و نەبڕاوەو جێگەی گرتوە لە دڵیانا کەبریتیە لەمەبەست لەناوەرۆکی ( لاالـه الا الله ) لەژیان و زیندەگانی جیهان و لەڕۆژی دوایشدا . لەجیهاندا بەرگە ئەگرن لەسەر ئازارو واز لە ئایین نابەرن ، لەڕۆژی دواییدا لەگۆڕەکانیانا زمانیان ناپێچێ بەیەکاو وەڵامی فریشتەکان ئەدەنەوە .زانایان هەندێکیان ئەڵێن : ئەو ئایەتە هاتوەتە خوارەوە دەربارەی سزای گۆڕو تەڵقین کردن و فێرگردنی مردووان و جۆری وەڵامدانەوەیان .

بۆزانین : مەبەست لەو باوەڕدارانە لەو ئایەتەدا ئەو باوەڕدارانە مەبەستە باوەڕ بەخواو بە پێغەمبەر بهێنن و لەپاشا نەکەونە گومانەوەو کۆشش بکەن بەدارایی‌و بەگیانی خۆیانەوە لەڕێگەی ئایینی خوادا .

مەبەست ئەو کەسانە نیە بڵێ باوەڕم بەخواو بەپێغەمبەرو ڕۆژی دوایی هێناوەو کەچی ڕاستی بەرپا ناکاو ڕێگە لە خراپە نەگرێ و بەئازایەوە بەرگری لەستەم نەکا .

﴿ وَیَضِلُّ اللهُ الظّالِمِیْنَ وَیَفْعَلُ اللهُ مایَشاءُ ﴾ وە خوا ستەمکاران لەڕێگەی ڕاست لائەدا بەهۆی بێ باوەڕی‌و درۆکردن و یاخی بونیان لەفەرمانی خواو ستەم کردنیان لەخۆیان و لەجگەی خۆیان و دەست درێژی و بوختان کردنیان بەپێغەمبەران و باوەڕداراندا ، خوا هەر شتێ ئارەزوی بکا ئەیکا لە پاداشتی پیاو چاکان و لەسزادانی تاوانباران و گەڕانەوە بۆ ئارەزوی خوا نیە .

أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَتَ اللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا وَبِئْسَ الْقَرَارُ ﴿٢٩﴾ وَجَعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّوا عَن سَبِيلِهِ قُلْ تَمَتَّعُوا فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى النَّارِ ﴿٣٠﴾ قُل لِّعِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا يُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُنفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَالٌ ﴿٣١﴾

﴿ أَلَمْ تَرَ إلى الَّذِينَ بَدَّلُوا أنعِمَةَ اللهِ كفراً ﴾ ئایا تۆ نەتڕوانیوەبۆلای کەسانێکی ئەوتۆ چاکەو سوپاس کردنی خوایان گۆڕیوە بۆ بێباوەڕی و سوپاس نەکردنی خوا . یانیٚ ناردنی پێغەمەران بۆ لای قورەیشیەکان و بۆ لای گەلانی ڕابووردوو گەورەترین چاکەن بۆ یان ، نەك تەنها بۆ ئەوان .بەڵکو بۆ لای هەموو بێباوەڕان کەلەجیاتی ئەوەی سوپاسی خوابکەن و باوەڕیان پیبکەن ئازاریان ئەدان و بەدرۆیان ئەخستنەوە .

بۆزانین : خوای مەزن قورەیشیەکانی لەلای خانوی خۆی دانابوو ، بەوبۆنەوە بەرهەم ومیوەی هرێمەکانی تریان بۆ ئەهات بەئاسانی و لەکەس نەئەترسان لەکاتێکا دانیشتوان ئەم لاولایان هەڵئەگیران وئازار ئەدران و ئەوان بەبێ ترس ئەژیان . ڕێزیشی لیٚ گرتن بە نادرنی پێغەمەر بۆ لایان . لەگەڵ ئەو چاکاندا باوەڕیان پیٚ نەهێنا، بەرگری ئایینەکەیان ئەکرد، بۆیەخوای مەزن چاکە وخواردەمەنی لیٚگرتنەوە ماوەی حەوت ساڵ تووشی گرانی کردن ، لەجەنگی بەدردا زۆریان کوژران و دیل کران و بون بە پێشەوای ستەمکاران .بۆ ئەو مەبەستەخوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿ وَأَحلّوا قومكُمْ دار البَوار جَـهَنّمَّ يَصْلُونَـها بِئسَ القَـرار﴾ وەئـەو كەسـانە چاكـەی خوایان گۆڕی ئەو گەلەیخۆیان هاوبەشی ئـەوانیان كردلـەبێباوەڕیدا ناردنیـان بـۆ لای خانوی لـەناوچوون كە بریتیە لـەدۆزەخ ئـەوان ئەچنـە نـاوی و ئازارەكـەی ئـەچێژن و ، خراپ خانوی وەستان وتیچونە دۆزەخە بۆ ئارامگرتن .

﴿ وَجَعَلُوا للهِ أنداداً لِيُضِلُّوا عَنْ سَبِيْلِهِ ﴾ وە گێڕاویانـە بـۆ خـوا چـەندین هاوبەشـیٚ لـەپەرستنداو خۆشیان ئەویستن وەك خۆشەویسـتی خـوا لـەبەرئـەوەی گەلەكـەی خۆیـان لـەرێگەی ڕاست لابدەن .

﴿ قُلْ تَمَتَعُوا فَإنّ مَصِيْرَكُمْ إلَى النّار ﴾ تۆ بلّێ بـەو بـت پەرستانە : ئێـوە ڕابوێـرن و بخۆن و بژین لـەجیهاندا . بەڕاستی گەڕانەوەی ئێوە بۆ لای ئاگری دۆزەخە .

كـاتێ خـوای مـەزن بەهەڕەشـەوە فـەرموی بـەبێباوەڕان : ئێـوە ڕابوێـرن بـەناز و خواردەمەنی جیهان ، بەپێغەمەر ﴿ ص ﴾ ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ لِعبادي الّذِيْنَ آمَنُوا يُقِيْمُون الصَّلاةَ ﴾ تۆ بلّێ بەو بەندانەی ئەوتۆی من باوەڕیان هێناوە :ئێوە پێویستە نوێژەكانتان بكەن و بەرپای بكەن بەوجۆرەی فەرمانتان پێئـەدرێ ، چونكە نوێژ ئێوە ئەگێڕێتەوە لـەتاوان .

﴿ وَ يُنْفِقُونَ مِمّا رَزَقْناهُمْ سِراً عَلانِيَةً ﴾ وە پێویستە ببەخشن بە هەژاران هەندێ لـەو شتانە ئێمە بەخشیومانە بەوان بە پەنـهانی و بـە ئاشـكرا ،ئیـتر ئـەوەی ئێـوە ئەیبەخشـن پێویست كرابێ لـەسەرتان یانە .

﴿ مَنْ قَبْلِ أنْ تَأتِي يَوْمٌ لاَبَيْعٌ فِيْهِ وَّ لاَخْلالِ ﴾ لـەپێش ئـەوەی كـەبێت ڕۆژی نـەكڕین ونەفرۆشتن ونەدۆستی تێدا نیە هەتا بیكەن بە بەرتیل و تكا كار لای خوای مەزن .

كاتێ خوای مەزن باسی پیاو خراپان و پیاوچاكانی كرد و ڕونیشی كردەوە بـەختیاری دەست ناكەوێ بەجگەی ناسینی خوا وپێویستە فێری بەڵگـەیش بـن لـەسـەرتوانای‌خوا ، لـەم ئایەتەی دواییدا باسی ئەوشتانەی ئەكا ئەبنە هۆی سوپاس كردنی خواو پەرستنی خـوا لـەلایەن هەمو ئادەمیزادەوە وئەفەرموێ:

ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾

﴿ اللهُ الَّذِيْ خَلَقَ السَّمَاواتِ وّ الآرْضَ وَ أنْزَلَ مِنَ السَّماءِ ماءً فَأَخرَجِ بِهِ مَنَ الثَّمَراتِ رِزْقاً لَكُمْ ﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیە دروستی کردووە ئاسمانەکان و زەوی بەو هەموشتانە لەناویانان و لەسەریانەوە هەن ، خوا ناردویەتیە خوارەوە و لە هەورە و لای ئاسمانەوە و ئاوێ ، دوایی خوا دەرئەهێنێ و پەیدا ئەکا بەهۆی ئاوەوە ڕۆزی لەبەروبومی درەختەکان وکشت و کاڵی زەوی بۆ سوودی ئێوەو بۆ خواردن و خواردنەوە وپۆشاك و ڕاخراو سەرەخەری ئێوە .

﴿ وَسَخَرَ لَكُمْ الْفَلَكَ لِتَجْرِيْ فِيْ الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ ﴾ وەخوا ڕامی کردوە بۆ سوودی ئێوە کەشتیەکان هەتا بڕۆن بەناو، دەریاکانا بەهۆی فەرمانی خواۆ بۆ هەرجێگەیە بتانەوێ بۆی بڕۆن .

﴿ وَسَخَرَ لَكُمْ الآنْهارَ ﴾ وە خوا ڕامی کردوە بۆ سوودی ئێوە ڕووبارەکان هەتا ئێوە ئاوی لێبخۆنەوەو ئاژاڵەکانتان و کشت وکاڵ و بێستانەکانی خۆتانیان پێ ئاوبدەن و

بەکاری بهێنن بۆ بەنداو و هاتوچۆ بکەن بە ناویانا و وزەی کارەبای لێ پەیدا بکەن و چەندین شتی تریش .

﴿ وَسَخَرَ لَكُمْ الشَمْسَ والْقَمَرَ دائِبيْنَ﴾ وە خوا ڕامی کردوە بۆ سوودی ئێوە خۆرو مانگ دێن وئەڕۆن بەبەردەوامی ، خۆر بۆ دیاری کردنی ساڵ و ڕۆژ وشەو و بۆ ڕووناکی لە ڕۆژ و بۆ وەرگرتنی گەرماو ووزەی گەرمایی و چەندین شتی تریش، مانگ بۆدیاری کردنی دووازدە مانگەو ڕوناکی لە شەودا و بۆ وەرگرتنی فێنکایی وشتی تریش.

﴿ وَسَخَرَ لَكُمْ اللَّيلَ وَالنَهارَ﴾ وە خوا ڕامی کردووە بۆ سوودی ئێوە شەو ورۆژ . شەو بۆ پشوودان و خەوتن ، ڕۆژ بۆ کارکردن و پەیداکردنی هۆی ژیان .

﴿ وَآتاكُمْ مِنّ كُلِ ماسَأَلْتمُوهُ ﴾ وەخوا بەخشیویە بەئێوە هەندێ لەهەمو شتێ ئێوە داواتان کردووە، لەپێویستی خۆتان و لەدارایی و منال و زۆر شتی تریش .

﴿ وَإنْ تُعِدُّوا نِعْمَةَ اللهِ لاتَحْصُوها إنَ الأنسان لَظَلُومٌ كَفارٌ ﴾ وەئەگەر ئێوە چاکەی خوا بژمێرن ، ئێوە بۆتان نایەنە ژمارە و بۆتان ناکرێ ئەوەندە زۆرن ، بەڕاستی ئادەمیزاد زۆرستەم لە خۆیان ئەکەن و سوپاسی چاکەکانی خوا ناکەن .

زانایانی دەروناس بیریان جیاوازە دەربارەی ئادەمیزاد .ئایا خۆی لە خۆیا تاوانکارە بەگوێرەی سروشتی خۆی یانە ؟ .لەساڵی (١٨٣٢ ) دا ( ٥٢٨) زانانی دەروناسی کۆبونەوە دەستیان کرد بەگفتوگۆ لەوبارەوە زۆرتر لەوان لایان وابوو بەڵگە نیە لەسەرئەوەی مرۆڤ نەتوانێ خۆی ڕزگاربکا لەتاوان ، هەندێکیاندژایەتی ئەوانیان ئەکرد.

ئەوەی ڕاستی بێت مرۆڤ بەتاوانبار لەدایك نەبوە . ئەگەر بەتاوانبار لەدایك بوبێ ئەبێ داوای هیچ چاکەیەکی لێ نەکرێ و سزادانی و پرسیارکردن لەستەم ناجۆربێ وئایین و دەستور و یاسا پوچ و بێ مانابێ . بەلام مرۆڤ بەهۆی چەندین کاری دەرەکی پەلاماری تاوان ئەدا وەك برسێتی پاڵی پێوە ئەنێ بۆ دزی وجەردەیی .ئاواتی پڕوپوچ پاڵی پێوەئەنێ ناپاکی و بەکرێ گیراوی و بۆ لای نیشتمان فرۆشتن . ئادەمیزاد جیاوازن لە

یەکتری . هەندێکیان دەروونیان لاوازە خۆیان ناگرن لەبەردەم ئارەزووی خۆیانان دەست درێژئەکەنە سەر دارایی جگەی خۆیان و داوێن پیسی ئەکەن و کەچی خاوەن دارایین و ژنی ڕەوای خۆیان هەیە .

وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى ۖ وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٦﴾ رَّبَّنَآ إِنِّىٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِى بِوَادٍ غَيْرِ ذِى زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِى وَمَا نُعْلِنُ ۗ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٣٨﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى وَهَبَ لِى عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ ۚ إِنَّ رَبِّى لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٩﴾ رَبِّ ٱجْعَلْنِى مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ﴿٤٠﴾ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ

## اَلْحِسَابُ (٤١)

﴿ وَإِذْ قْالَ إِبْراهِيْمَ رَّبِي إجْعَلْ هذا الْبَلَدَ آمِناً ﴾ وە تۆ بیری ئەوکاتە بکەرەوە ئیبراهیم ووتی: ئەی پەروەردگاری من: تۆ ئەم شارەی مەککە بگێڕە بە جێگەیەکی بێ‌ترس و کەس نەتوانێ بیڕوخێنێ هەتا نزیك ڕۆژی دوایی .

﴿ وَأجْنُبْنِي وَ بنى أنْ نَعْبُدُ ألأَصْنامَ رَبِّ أنَّ هُنَ قَدْ أضْلَلْنَ كَثِيْراً مِنَ الْناسِ ﴾ وە تۆ من وکوڕەکانم دووربخەرەوە لەوەی کە ئێمە بتەکان بپەرستین و بەردەوامان بکە لەسەر پەرستنی خۆت .ئەی پەروەردگاری من : بەڕاستی ئەو بتانە زۆر کەسیان لە ڕێگەی ڕاست و خوا پەرستی لاداوە .

بۆزانین :ئەم ئایەتە لەوەوە هاتووە :کاتێ ئیبراهیم ﴿ ﷺ ﴾ ئەو بتانەی شکاند کە گەلەکەی ئەیان پەرستن ، گەلەکەی بڕیاریاندا ئیبراهیم بسوتێنن و تۆڵەی بتەکانی لێ بکەنەوە . بۆ ئەو مەبەستە درەخت و پوشێکی زۆریان کۆکردەوە و چاڵێکی زۆرپان و قوڵیان کەند و درەخت و پوشەکانیان فڕێدایە ناوی وئاگریان تێ بەدراو ئیبراهیمیان خستە ناو ئاگرەکە ، خوای مەزن ئاگرەکەی بۆ ساردکردەوە و نەی سوتاند و بەبێ وەی دەرچوو ، خوا ئیبراهیمی ڕزگارکرد لە ئازاری ئەو ئاگرە .. پاشای گەلەکەی ناوی نەمرود بو فەرمانی دا بە دەرکردنی ئیبراهیم لە خاکی عێراق ، لەگەڵ خاو خێزانەکەی و لوتی برازای چون بۆ شام . ماوەیە بە ویستی خوا لەوێ مانەوە . لە دواییدا چوون بۆ میسر ، فیرعەونی ئەوکاتە چەند دیارێکی لەگەڵ کارەکەرێ بەناوی ( هاجەر ) پێش کەش بەسارا خاتونی ژنی ئیبراهیم کرد و ئەویش کارەکەرەکەی بەخشی بە ئیبراهیم ، دوایی ئیبراهیم گەڕایەوە بۆ شام لەگەڵ ئەو کەسانەی لەگەڵی بوون ، دوای ئیبراهیم لە خاتوو هاجەر کوڕێکی بوو ناوی نا ئیسماعیل . پاش ماوەیە لە خاتون سارایش کوڕێکی بوو ناوی نا ئیسحاق ، پێغەمەری ئیسلام لەنەوەی ئیسماعیلە .

﴿ فَمَنْ تَبِعَنِيْ فَأَنَهُ مِنِّي وَمَنْ عَصانِي فَأَنَكَ غَفُورٌ رَّحِيْمٌ ﴾ دوایی هەرکەسێ دوای ئـایین وبڕوای من بکەوێ ، دوایی ئەوکەسە ئایینەکەی ئایینی منە و ، هەرکەسێ بێ فـەرمانی من بکاو لە ئایینی من دەرچو بێ و بت پەرستی بکا دواتـر بەڕاسـتی تـۆ لێ خۆشـبوون و بەزەیی ومیهرەبانیت زۆرە ، ئەو ڕستەیە ئەمەمان نیشان ئـەدا کـە ئیـبراهیم زۆر لەسـەر خۆو بەبەزەییە ، داوایلەخوا نەکرد سزای بێباوەڕانی نەتەوەکـەی بـدا . بـەڵکو کـاری ئەوانی هەواڵەی لای خوای مەزن کرد .

پرسـیار/ ئیـبراهیم پاڕایـەوە لـەخوا کەنـەوەکانی بپـارێزێ لـەبت پەرسـتی کـەچی قورەیشیەکان بتیان ئەپەرست ؟

وەلاّم / ئیبراهیم و هەموو پێغەمەران پێیان خۆشبوە منالّ و نەتـەوەکانیان خواپەسـتبن ، لەبەر ئەو خۆشەویستیە بو پاڕانەوەکەیان.

﴿ رَبّنـا إِنـي أَسْـكَنْتُ مِـنْ ذُرِيَتِـي بِـوادٍ غَـيْرِ ذِيْ زَرْعٍ عِنْـدَ بَيْتِـكَ الْمُحَـرَّمِ ﴾ ئـەی پەروەردگاری ئێمە : بەڕاستی من دائەنێم هەندێ لە منالّەکانم لـە شیوێکی چۆلّ و هۆلّـی بێئاو و سەوزایی لەلای ئەم خانوە ڕێز گیراوەی تـۆ کـە لـەناویا قەدەغەیـە ڕاوکـردن و بەسووك تەماشا بکرێ ، لەوکاتەوە هەتا ئێستا و هەتا ڕۆژی دوایی ڕێزی لێ ئەگیرێ.

ئەو بردنەی منالّەکانی ئیبراهیم بۆ ئەو جێگەیە چۆلّە لەبەر ئەمەبوە : لـەنێوان خـاتون ساراو خاتون هاجەرە ناکۆکی پەیدا بو هەروەك هەموو هـەوێکان ، لەبەرئـەو ناکۆکیـە ئیبراهیم بە فەرمانی خوا خاتون هاجەرە و ئیسماعیلی شیرە خۆرەی کـوڕی خـۆی بردنـە حیجاز لە مەککە دانیان کـە شـیوێکی چـۆلّ و بێئـاو بـوو و کـاتێ ئیـبراهیم ویسـتی بگەڕێتەوە هاجەرە خاتوون بە ئیبراهیمی ووت :ئێمە بۆ بەجێ ئەهێلّی ، ئایا خوا فـەرمانی پێدوایت ، ئیبراهیم ووتی : بەلّێ . خاتوون هاجەرە ووتی : خوا ئێمـە لـەناو نابـا دوایـی ئیبراهیم گەڕایەوە .

﴿ رَبّنا لِيُقِيْمُوا الْصَلاةَ فَأجْعَلْ أفْئِدَةً مِنَّ الناسِ تَهْوِى إلَيْهِمْ ﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە دایان ئەنێم لەو شیوەدا لەبەرئەوەی ئەو منالآنەی من و هەموو ئادەمیزاد نوێژەکانیان بکەن و ڕوو بکەن بۆلای ئەو خانەی تۆیە ، دووایی تۆ دڵی هەندێ لە ئادەمیزاد بگێڕە بەجۆرێ بەپەلە بڕۆن بۆلایان بە ئارەزووی خۆشەویستی ئەو جێگەیە ئەوانی تێدایە .

﴿ وَأرْزُقْهُمْ مِنَ الثَمَراتِ لَعَلَّهُم يَشْكُرُونَ ﴾ وە تۆ ببەخشە بەوان هەندێ لە دانەوێڵەو میوە بەهۆی بازرگانی و زیارەت کەرانی خانەی خۆت و بەبێ ماندوبونی دانیشتوانی لای خانەی خۆت، لەبەرئەوەی ئەوان سوپاسی خوا بکەن و بێفەرمانی خوا نەکەن.

﴿ رَبّنا إنَّكَ تَعْلَمُ مانُخْفِيْ وَمانُعْلِنُ ﴾ ئیبراهیم ووتی : ئەی پەروەردگاری ئێمە بەڕاستی ئەزانی بەشتێ ئێمە ئاشکرای ناکەین و بەشتی ئێمە دەری ئەخەین ، هەر تۆ بە سوودی ئێمە ئەزانی و ئاگاداری نیازی دڵی ئێمەی .

﴿ وَما يُخْفِي عَلَى اللهِ مِنْ شَيءٍ فِيْ الأرْضِ وَلا فِي السَّماءِ ﴾ وە پەنهان نیە لەسەر خوا هیچ شتێ لە ناو ئاسمان و زەوی .

﴿ الْحَمْدُ للهِ الَّذِيْ وَهَبَ لِيَ عَلَى الْكِبَرِ إسْماعِيْلَ وَإسْحاقَ إنَّ رَبِّيْ لَسَمِيْعُ الْدُعاءِ ﴾ هەموو سوپاسێ بۆ خوایەکی ئەوتۆیە بەخشیویەتی بە من لەسەر پیری و تەمەنی زۆری من ئیسماعیل و ئیسحاق . ئیسماعیل ودایکی ئەسپێرم بەو خوایە بەبێ دارایی وسامان . بەڕاستی پەروەردگاری من پاڕانەوە و پەرستن وەرئەگرێ .

﴿ رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيْمَ الْصَّلاةِ وَمِنْ ذُرِيَتِيْ وَتَقَبَّلْ دُعاءِ ﴾ ئەی پەروەردگاری من تۆ من و منالەکانی من بگێڕە بەوەی بەردەوام بن لەسەر ڕاوەستان و کردنی نوێژ، تۆ پاڕانەوەی من وەربگرە لە خۆم و منالەکانم .

﴿ رَبّنا إغْفِرْ لِيْ وَلِوالِدَىَّ وَلِلْمُؤمِنِيْنَ يَوْمَ يَقُومُالْحِسابُ ﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە تۆ خۆش ببە لە من لە باوك و دایکم و لە باوەڕداران و پاداشتمان بدەرەوە لەو ڕۆژە پرسیار ڕائەوەستێ لەلایەن تۆ .

پاش ئەوەی ئیبراهیم گەڕایەوە بۆ شام و خاتون هاجەرە و کوڕە شیرە خۆرەکەی بەجێ هێشت لە مەککە ، خاتون هاجەر شیری دا بەکوەڕەکەی ، ئەو نان و ئاوەی ئیبراهیم بۆی دانابون هەموویان تەواوبون وشیر لەمەمکەکانیا نەما ، ئیسماعیل مەمکەی ئەمژی و ئەگریا ،خاتون هاجەر لە برساو لە تینوتیدا ڕای کرد بۆلای کێوی سەفاو بەرزبویەوە و ئەی ڕووانی ڕێبوارێ چاو بکا و کەسی نەدی و هاتە خوارەوە بە وێنەی کەسێکی ماندوو لەسەرخۆ ئەڕۆیشت دووبارە بەرەو کێوی مەروەر ڕای‌کردوو لەوێش کەسی نەدی ، بەم جۆرە هەتا حەوت جارئەم سەرو ئەوسەری کرد، لەکاتی هاتوچۆیا چاوی بە ئاوێ کەوت لە ژێر پێی ئیسماعیل دا هەڵ ئەقولا و لە ئاوەکەی خواردەوە و شیریشی دا بە ئیسماعیل . بە ڕێکەوت و بە دەستورێکی خوا تاقمێ لە هۆزی جورهومە عەرەب بە وێدا تێ ئەپەڕین . زۆر سەریان سوڕما کە چاویان بە هەندێ باڵندە کەوت لە ئاسمانا وەستابون ، ووتیان بەسەر ئاودا نەبێ نافڕن .ئاو کێشەکەی خۆیانیان نارد هەتا بزانێ هەواڵ چیە ،ئەویش ڕۆی و تەماشای کرد ئاوێ هەڵئەقوڵێ ، هاتەوە بۆلای هاوڕێکانی و هەواڵی پێدان ، ئەوانیش هاتن بۆلای خاتون هاجەرە ووتیان : تۆ لەم ئاوەی خۆت بەشمان بدەو ئێمەیش بەشی تۆ لە شیر وشتی تری خۆمان بە تۆ ئەدەین ، خاتوون هاجەرە داواکەی لێ وەرگرتن . دوایی کە ئیسماعیل گەورەبوو ژنی لێ‌خواستن و منالی زۆری لێ‌کەوتەوە .ئیبراهیم هاتوچۆی ئەکرد لە نێوان شام و حیجازدا و سەری لە خاتون هاجەرە ئەدا و کوڕەکەی ئەبینێ ، لە یەکێ لە سەردانەکەیدا خوا فەرمانی پێدا خۆی وئیسماعیل خانوێ دروست بکەن کە کەعبەی ئێستایە بۆ ئەوەی پەرستنی خوای تێدا بکرێ ، ئەوانیش دروستیان کرد و دیوارەکەیان بەرز کردەوە و ناوی نرا خانووی خوا وئێستا ڕووانگەیە بۆ نوێژ کردن .

پاش ئەوەی قورەیشیەکان ئازاری زۆری پێغەمەریان داو ئەوپەڕی دوژمنایەتی پێغەمەریان کردو لەدژی ئایینی پاکی ئیبراهیم وەستان . خوای مەزن دڵخۆشی پێغەمەری دایەوە وفەرمووی:

وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ۖ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ ۗ أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِى مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾

﴿ وَ لاتَحْسَبَنَ اللهَ غافِلاًعَمّا يَعْمَلُ الْظالِمُونَ ﴾ وە تۆ گومان مەبەو وامەزانە خوا بێئاگایە لەشتێ ستەمکاران ئەیکەن لەبێباوەڕی و هاوبەشدانان بۆ خواو ئازاردانی تۆ .

﴿ إنّما يُؤَخِرّهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخُصُ مِنْهُ الآبْصارُ ﴾ بەڕاستی خوا ئەو ستەمکارانە دووا ئەخا بۆ ڕۆژێ بەرزئەبنەوە لەو ڕۆژەدا چاوی بێباوەڕان وبەرەو ژور ئەڕوانن وچاویان نانێن بە یەکا لە ترسی ئەو ڕۆژە.

﴿ مُهْطِعِيْنَ مُقْنِعِي رُؤُوسِهِمْ ﴾ بە پەلە ڕائەکەن بۆ لای ئەو کەسەی داوایان ئـەکا بـۆ پرسیار ووەلاّم ، سەریان بەرزئەکەنەوە بۆلای سەرەوە لەترسی سەختی ئەو ڕۆژە .

﴿ لایَرْتَدُّ إِلَیْهِمْ طَرْفُهُمْ وَافْئِدَتُهُمْ هَواءٌ ﴾ وەئەو ستەمکارانە چاویان ناگەڕێتەوە بـۆلای خۆیان لەترسی ئەو ڕۆژەو سەرگەردانن و بەرپێی خۆیان نابینن ودڵیـان بۆشـەو لەترسـانا لەهیچ شتیّ ناگەن .

﴿ وَأَنْذِرِ النّاسَ یَوْمَ یَأْتِیهِمُ الْعَذابُ فَیَقُولُ الّذِیْنَ ظَلَمُوا رَبّنـا أخِرْنـا إلى أجَـلٍ قِرِیْـبٍ ﴾ وەتۆ ئادەمیزاد بترسێنە لەڕۆژیّ دیّت بۆ لایان سزا لـەدووا ڕۆژدا دوایـی ئـەو کەسـانەی ستەمیان لەخۆیان کردوە ئەڵێن : ئەی پەروەردگاری ئێمە دوابخـەو بمـان گێرەوە بـۆلای جیهان و بۆ لای ماوەیەکی نزیك و کەم .

﴿نَجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتّبِعَ الرَّسُلَ﴾ ئێمە وەلاّمـی فـەرمودە و داواکـاری تـۆ ئەدەینـەوە و داوای پێغەمەرەکان ئەدەینەوە و پەشیمان ئەبینەوە لەوکارەخراپانەی لەمەوبەر کردوومانە و پەیرەوی ئەوان ئەکەین .خوا فەرمانی دا بەپێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ بێبـاوەڕان بترسێنیّ لـەو ڕۆژە و هەواڵی پاشەڕۆژی خۆیانیان بداتیّ . پێغەمەر کاری خۆی بەجیّ هێناو ترساندنی . بەلاّم سودی تایبەتی خۆیان سواری سەرشانیان بوو ، وایـان ئـەزانی هـەرگیز لـە جیـهان دەرناچن ، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ أوَلَمْ یَکُونُوا أقْسَمْتُمْ مِنْ قَبْلُ مالَکُمْ مِنْ زَوالٍ ﴾ ئایا ئێوە ئەو کەسانە نین لـەمەوبـەر لەجیهاندا سوێنتان ئەخوارد نەمان و دەرچوون بۆ ئێوە نیە لەجیهاندا وزیندو بونـەوە نیـە ونارۆین بۆلای ڕۆژی دوایی .

﴿ وَسَکَنهُمْ فِي مَساکِنَ الّذِیْنَ ظَلَمُوا انْفسِـهُمْ ﴾ وەمـن کەسـانێکی ئـەوتۆ سـتەمیان لەخۆیان کردبو لەناومان دان و ئێوە لە جێگەکانی ئەواندا دانیشـتوون .بـە وان تـەمیّ خوار نەبون .لە بیرتان چوە پێغەمەرەکانتان ئێوەیان ئەترسان لـە سـزای ئـەم ڕۆژە ،ئـەو گەلانە بریتی بوون لە گەلی عادو سەمود .

﴿ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ ﴾ وەبۆتان ڕون بوەوە ئێمە چۆنمان کرد بەوان لەجێگەکانی خۆیاناو ئێوە شوێنەوارو نیشانەی پاشماوەی ئەوان ئەبینن و تەمێ خوارنابن .

﴿ وَضَرَبْنَا لَكُمُ الأَمْثَالَ ﴾ وە ئێمە ڕونمان کردوەتەوە بۆ ئێوە چەندین وێنەیە لە قورئاندا کە بەسەرهاتی گەلانی بێباوەڕی ڕابووردوو چۆن بوە . بۆمان ڕون کردونەتەوە دواڕۆژی ئێوەی بت پەرست وەك ئەوان ئەبێ ،تەمێ خوار نەبون و پێغەمەرەکانتان بەدرۆئەخستەوە .

لە پاشا خوای مەزن بۆ جارێ تر دڵخۆشی پێغەمەر ئەداتەوە کە ئارام بگرێ لەسەر پیلانی بت پەرستان .ئەفەرموێ :

وَقَدْ مَكَرُوا۟ مَكْرَهُمْ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ ﴿٤٦﴾ فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجْزِىَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٥١﴾ هَـٰذَا بَلَـٰغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا۟ بِهِۦ وَلِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا هُوَ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٥٢﴾

﴿ وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ وَعِنْدَ اللهِ مَكْرُهُمْ ﴾ وە بەڕاستی قورەیشیەکان پیلانیان پێك هێنا بە پیلان و فێلێکی گەورە بۆ کوشتنی پێغەمەر و لە لای خوایە سزای فێڵ و پیلانی ئەوان و تۆڵەیان لێ ئەکاتەوە .

﴿ إنْ كانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُلَ مِنْهُ الْجِبالُ﴾ وە با وەکو فێڵ و پیلانەکەیان ئەوەندە گەورەبێ کێوەکان لە بن دەربێنێ و لە ناویان ببن . یانێ با ئەوەنەیش گەروە بێ کێوەکان هەڵکەنێ ناتوانرێ ئەوبێ باوەڕیە جێگەی خۆی گرتوە لە دڵی باوەڕدارا لابرێ ، کەواتە تۆ لە ڕاگەیاندنی پەیامی خوا مەوەستە .

هەندێ لەزانایانا لایان وایە ڕاناوی ﴿ وَقَدْ مَكَرُوا ﴾ ئەگەڕێتەوە بۆلای ئەو گەلانەی کە قورەیشیەکان لەجێگەی ئەوانا دانیشتون ،بە هەرچۆنێ بێ مەبەستەکە ناگۆڕێ .

پرسیار / لەسورەتی یوسوفدا هاتووە : پیلان و فێڵی ژنان زۆر گەورەیە ، لێرەدا ئەفەرموێ فێڵ و پیلانی بێ باوەڕان ئەوەندە گەورەیە کێوەکان هەڵ ئەکەنن ،ئەو دوو فەرموودانە چۆن یەك ئەگرن ؟

وەلام /باس کردنی فێڵی ژنان لەسەر زمانی عەزیزی میسرەوە هاتوە . بەلام پیلانی بێ باوەڕان لەسەر زمانی خوای مەزنەوە هاتوە بە تەنها .

﴿ فَلا تَحْسَبَنَّ اللهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ ﴾ دوایی تۆ گومان مەبەرە خوا بە پێچەوانەی ئەو بەڵێنەوە هەڵسی دابێتی بە پێغەمەرانی خۆی کە یاریدەیان ئەداو بێ باوەڕان ڕسوا ئەکا .

﴿ إنَّ اللهَ عَزِيزٌ ذُو انتِقامٍ ﴾ بەڕاستی خوا زۆر گەورە و بەتوانایە خاوەنی تۆڵە کردنەوە لە دوژمنانی دۆستانی خۆی . تۆڵەیان لێ ئەسێنێ .

﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ الآرْضُ غَيْرَ الآرْضِ وَالسَّماواتُ ﴾ لە ڕۆژێکا زەوی ئەگوڕێ بە زەویە جگەی ئەم زەویە وکێوەکانی نامێنێ و تەخت ئەبێو چاڵی و چۆڵی نامێنێ ، زەریا و درەختی نامێنێ و ئاسمانەکانیش ئەگۆڕێن بە جگەی ئەم ئاسمانە و ئەستێرەکان پرژاڵ پرژاڵ ئەبن ، چونکە هێزی ڕاکێشان وخۆگرتنیان نامێنێ لە نێوان یەکتریدا بۆ یەکتری .

﴿ وَبَرَزُوا لِلهِ الْواحِدِ الْقَهار ﴾ وە لە گۆڕەکانیانــا دێنــە دەرەوە و لەبــەردەم فــەرمانی خوادا ڕائەوەستن بۆ پرسیار ووەلاّم ئەو خوایە تەنهایەو دووهــەمی نیــەو بیٚهاوبەشــە زۆر بەتوانایە وئەوەی بییەویٚ ئەیکا وکەس ریٚگەی پیٚناگریٚ .

﴿ وَتَرى الْمُجْرِمِيْنَ يَوْمَئِذٍ مُقَرَّنِيْنَ فِي الأَصْفادِ سَرابِيلِهِمْ مِنْ قِطرانٍ ﴾ وە تۆ تاوانبــاران ئەبینی لەو ڕۆژەدا بەستراونەتەوە لە نیٚو پیٚون وکۆتا .، هەریەکەیان پالٌ دراون بــەهاوبیری خۆیانەوە لەگرتوخانەی دۆزەخدا وکراس وبەرگیان هەلٌ کیٚشــراوە لــە ڕۆنــی هوشــتری گەڕی پیٚچەور ئەکەن ،چون زۆر بەگوڕی ئاگر ئەگریٚ و پیٚسەکانیان ئەســوتیٚنیٚ . ئــەو ڕۆنە ئەگیریٚ لە درەختیٚ ناوی ئەبهەلە .

﴿ وَتَغْشى وُجُوهَهُمُ النّارُ ﴾ وەئاگر دەم وڕومــەتی ئەوتاوانبارانــە دائــەگریٚ . چونکــە ڕرۆیان نەکردوە بۆلای ڕاستی و بەکاریان نەهیٚناوە لەڕاستیدا .خــوای مــەزن ئــەو جــۆرە تۆلەیە ئەسیٚنی لەوان .

﴿ لِيَجْزِي اللهُ كُلَّ نَفْسٍ بِما كَسَبَتْ إِنّ اللهَ سَرِيْعُ الْحِساب ﴾ لەبەرئەوەی خوا پاداشتی هەموو کەسیٚ بداتەوە بەهۆی شتیٚکەوە کردویانە لــە جیــهاندا ، هەرشــتیٚکیان بەســەر بــیٚ خۆیان کردویانە بە خۆیان .بەڕاستی خوا پرسیاری زۆر بە پەلەیە وکەس ناتوانیٚ بیٚ ئاگای بکا لە پرسیاریٚ بۆ لای پرسیاریٚ تر .

﴿ هذا بَلاغٌ لِلّنّاسِ وَ لِيُنْذِرُوا بِهِ ﴾ ئەوەی لــە قورئانداىــە لــە مــوژدە و لــە هەڕەشــە ڕاگەیاندنە بۆ ئادەمیزاد و بەسە بۆ ئامۆژگاری کردنیان و ئامۆژگاریان ئەکا بۆ ئەوەی بــەو ڕاگەیاندنە بترسیٚن و لە خراپە و بیٚ فەرمانی خوا وازبهیٚنن .

﴿ وَ لِيَعْلَمُوا أنّما هُوَ إِلهٌ وّاحِدٌ وَ لِيَذّكّرُوا أُلوا ألألْبابِ ﴾ وەبۆ ئەوەی ئادەمیزاد بزانــن بەڕاستی خوا خوایەکی تەنهایە و ئەو شتانەی خوا لە قورئاندا باسی کردوون بیانکــەن بــە بەلگە لەسەر تەنهایی خوا و بۆ ئەوەیش ئەو کەسانەی خاوەنی ئەقلٌن بە هۆی قورئانــەوە ئامۆژگاری وەربگرن .

پرسیار/ پێویستە هەموو مرۆڤێکی خاوەن ئەقڵ پرسیار بکا :ئەو کەسەی شایستەی ئەو هەمو سزا سەخت و خاوەن ئازارە چ کەسێ بێ ، ئایا ئەو تاوانە ئەو هەمو سزا گرانانە پەیدا بکا بەو گەورەییە یەکەم جارو دوا جاری نەبێ و کۆتایی پێنەیە چ تاوانێ بێ ؟

وەلاّم / بەڵێ ئادەمیزاد تاوانباری وا هەیە شایستەی ئەو سزایانە بێ بە زۆرتریشەوە ، لەوکەسانەن جەنگ ئەکەن لەگەڵ ڕاستیدا و دای ئەپۆشن و نەزانن کە ڕاستە . گەورەتر لەو تاونبارانە کەسێکن خۆیان ئامادەکردووە بۆ ڕژاندنی خوێن و نەهێشتنی ژیانی دانیشتوان بەبۆنبای زەرڕە و هێدرۆجین و دەرمانی کیمیاوی کە مەلایین ئادەمیزادی پێ ئەکوژن لەیەك چرکەدا . بۆ نمونە : فڕێدانی بونبای زەررە بەسەر هێرۆشیماداو ڕژاندنی گازی کیمیاوی بەسەر شاری هەڵەبجە دا .زۆر شتی تریش لەوانە خراپتر .

بەیاریدەی خوا کۆتایی پێهات لە ( ٢٩ ) ی ڕەمەزان

ساڵی ( ١٤٢٠ ) کۆچی بەرانبەر

٢٠٠٠/١/٦ زایینی .

## ﴿ پێڕست ﴾

خوێنەری هێژا لەم جزمەدا ئەرکی چاوپیاخشانی ئەم هەڵانە بگرە ئەستۆی خۆت

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ | هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هاتوە | هاتوەتە | ٤ | ٤ | ڕێزدارت | ڕێزدار | ١٠٠ | ١٧ |
| القوم | عن القوم | ٥ | ٨ | بەمی | بە منی | ١٠٧ | ٢٣ |
| زۆر | زۆرە | ١١ | ١٤ | موسی | لموسی | ١٠٩ | ٥ |
| داریمان | دارایمان | ١٤ | ٤ | توانی | توانای | ١١٠ | ٦ |
| لە کاتێ | کەکاتێ | ١٧ | ٦ | هێنانوتە | هێناوتە | ١١٦ | ٢٠ |
| بعهدة | بعهده | ٢١ | ٢١ | بوبنەوەران | بونەوەران | ١٢٣ | ٩ |
| پەناجا | پەنجا | ٣١ | ١٥ | بەخێوە | بەخێویی | ١٣٠ | ١٧ |
| نصنب | نصب | ٣٤ | ٤ | (مصرفا) | (معروفا) | ١٣٢ | ١٤ |
| یفیظ | یغبط | ٣٤ | ٨ | ئەوبوایە | ئەبوایە | ١٣٣ | ١٨ |
| تورە | تورە | ٣٤ | ٩ | دواوای | دوای | ١٣٤ | ٦ |
| وە ئازارە | ئازار | ٣٥ | ٢ | کای | کاری | ١٣٥ | ٩ |
| دااوای | دوای | ٤١ | ٢ | جێگەی | جگەی | ١٣٦ | ١١ |
| درێژ لای | درێژی | ٤١ | ١٣ | سروشتی | سروشی | ١٣٦ | ١٧ |
| (والذذین) | (والذین) | ٥٣ | ٧ | سروشی | سروش | ١٤١ | ٨ |
| بینکا | بیانکا | ٥٧ | ١٦ | (قضی) | (وقضی) | ١٦٠ | ١٤ |
| ئوتۆ | ئەوتۆ | ٥٩ | ١١ | (النبی) | (أبنی) | ١٦١ | ١١ |
| زاین | زانین | ٦١ | ٨ | داوی | دوای | ١٦٦ | ٢٠ |
| فیکم | عمرا فیکم | ٦١ | ١٧ | ئاازرمان | ئازارمان | ١٧٤ | ١٥ |
| بێ باوەڕنی | بێ باوەڕانی | ٦٤ | ١٠ | ألد | أألد | ١٧٤ | ٢١ |
| تاقمێکمان | تاقمێکتان | ٧٢ | ١٥ | منیت | منیب | ١٧٦ | ١٨ |
| هاوبەی | هاوبەشی | ٧٣ | ٢٠ | نابەزێنن | دانابەزێنن | ١٧٩ | ١٥ |
| لە ڕودانی | لە ڕوداوێ | ٧٥ | ٢ | ولا تمثوا | ولا تعثوا | ١٨٤ | ١ |
| حققت | حقت | ٧٦ | ١٥ | بەر | بەو | ١٨٥ | ٩ |
| خوا | خۆی | ٧٧ | ٩ | (کنتم) | (کنت) | ١٨٦ | ١٤ |
| سایستە | شایستە | ٧٧ | ١٠ | (أستغقروا) | (أستغفروا) | ١٨٨ | ١ |
| بۆخۆیان | نەبۆخۆیان | ٧٨ | ١٢ | کۆشش | کوشتن | ١٩٠ | ١٢ |
| لەو باوەڕەوە | لەو بارەوە | ٨٣ | ٣ | أبعدت | بعدت | ١٩١ | ٥ |
| کانیناً | کاتیان | ٨٣ | ٦ | (فعال) | (إن ربك فعال) | ١٩٧ | ٥ |
| (ویستنبۆونك) | ویستنبئونك | ٩٠ | ١ | لابی | لای وابێ | ٢٠١ | ٢٢ |
| کرن | کردن | ٩١ | ١٣ | لایان | لایان ئەبا | ٢٠٢ | ٨ |
| ئیشە | ئیشەکانی | ٩٥ | ٧ | پیاو چکان | پیاوچاکان | ٢٠٣ | ١٦ |
| وما یغرب | وما یعزب | ٩٥ | ١٤ | بەردەم | بەردەوام | ٢٠٤ | ١٣ |
| من لك | من ذالك | ٩٥ | ١٤ | (عمدا) | (عما) | ٢٠٧ | ١٣ |
| (فی) | (إلاّ فی) | ٩٥ | ١٥ | دابنێ چ | دانێ | ٢٠٩ | ١٣ |
| ئاوت | ئاوات | ٩٥ | ٢٠ | لە | لەو | ٢١٠ | ٢ |
| توانا | توانای | ٩٨ | ٣ | چاکە | چاکەی | ٢١١ | ٢٢ |
| لەنێو | لەنێویا | ٩٨ | ١٩ | (لتلتقطه) | یلتقطه | ٢١٥ | ٢٠ |
| لقوم یسمعون | لآیات لقوم یسمعون | ٩٩ | ٤ | دەربرشی | دەربڕی | ٢٢٠ | ١٤ |
| (٣٦) | (٣٦٠) | ٩٩ | ١٥ | (من دبر) | (من دبر فكذبت) | ٢٢٧ | ٤ |

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| (يسجنن) | (ليسجنن) | ٢٣١ | ١ |
| دانانه نان | دانانه | ٢٣٥ | ٦ |
| ڕێزه | ڕێزی | ٢٤٣ | ١٩ |
| (الحافظاً) | حافظا | ٢٥١ | ٧ |
| تفتدون | تفقدون | ٢٥٧ | ٥ |
| ئەنجا كمێكتان | ئەنجامێكتان | ٢٦٧ | ٩ |
| نەخۆسی | نەخۆشی | ٢٧١ | ١٨ |
| ئایا ئەیەو | ئایا ئەو | ٢٧٨ | ١٥ |
| (إلى) | (إلى الله ) | ٢٧٩ | ١٠ |
| (قدم) | (قد) | ٢٨١ | ١ |
| (نتصرُنا) | نصرنا | ٢٨١ | ١ |
| (فنجیء) | فنجبی | ٢٨١ | ٧ |
| (وننمل صفوان) | (ونخبل صنوان) | ٢٨٨ | ٨ |
| **(وغير صنعوان)** | **وغير صفوان** | **٢٨٨** | **٨** |
| مەكەر | مەگەر | ٢٨٩ | ١٩ |
| ئوخۆن | ئەخۆن | ٢٩١ | ١٦ |
| بەڕیوەو | بەڕێوەبەرو | ٢٩٢ | ١ |
| ئەوە | ئەوەی | ٢٩٥ | ١٠ |
| هەول | هەواڵ | ٢٩٨ | ٣ |
| (ضیفته) | خیفة | ٢٩٩ | ٥ |
| ئاو | ئاوو | ٣٠٧ | ٢ |

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| (سوء) | (سؤ الدار) | ٣١٢ | ٧ |
| باردومانه | ناردومانه | ٣١٦ | ٤ |
| قورئانه | قورئانەیە | ٣١٦ | ٢٢ |
| (أمر) | (الأمر) | ٣١٧ | ١٦ |
| (شركاؤ) | (شركاء) | ٢٢٠ | ١٠ |
| (الذين) | للذين | ٢٢٠ | ٢٢ |
| پاشا | پاشە | ٢٢٢ | ١١ |
| (أبتنأهم) | (أتيناهم) | ٢٢٠ | ١٢ |
| (لرسل) | لرسول | ٢٢٤ | ٤ |
| پێمە | ئێمە | ٢٢٥ | ١٤ |
| (ليغفر) | ليغفرلكم | ٣٣٥ | ١٩ |
| (يسيفه) | بصيغه | ٣٣٨ | ٢٣ |
| خرپە | خراپە | ٣٣٨ | ٢٤ |
| **(أنعمة)** | **(نعمة)** | **٣٤٨** | **٧** |
| زانانی | زانایانی | ٣٥١ | ١٦ |
| خۆیانان | خۆیانا | ٣٥٢ | ١ |
| (وسكنهم) | وسكنتم | ٣٥٨ | ١٩ |
| إن كان | وإن كان | ٣٦٠ | ٤ |
| | | | |
| | | | |
| | | | |